PDF 4 KURD



# ناوی کتیب

* دیوانی دەشتی.
* وینەی دەشتی.
* چەندکـورتـە شیعریـک.
* ئاوردانەوەیەک لە رابوردوو.
* دەشـتی کێ بووە.
* وینەی ئاوایی دارەبەن.
* وینەی ئاوایی گردەچال.
* شیعرەکانی دیوانی دەشتی.
* بەشی کوردی و فارسی و عارەبی.
* چەند دیرێک لە مەولود نامەو باوەڕ نامە.
* ئیستعارەی دەشتی. بە عارەبی.
* ئیجازە نامە 1952.

PDF 4 KURD



# خۆم کوردم

خــۆم کوردم و ســاقیم کورد مەسـتی مەیی کوردانم
بــۆ مـەجلسی یــەک ڕەنگی گـــــۆیەندەیی کوردانم
زوو هەســـتن و هەولێدەن ڕۆژ کۆشش و شــەو لێدەن
موسـیقەیی کوردســـــــــتان بۆ گــەورەیی کوردانم



ڕەشـــــــــــمالی ڕەشی کوردان شیرو چەکی تێـدایە
بۆ بەســـتنی شـــیر و چــەک نەوڕەستەیی کــوردانم
ئەی ئەهـلی جەفـاکارم مەڕژێنن بــە نا ئومــــــێدی
خوێنــاوی ســــــتەمدیدی شـەرمەندەیی کــوردانم

PDF 4 KURD



# دارەبەن

ئاوایی دارەبەن و هەڤدە سالان خزمەت بە رۆشەنبیری و دەرس گوتنەوە و خزمەت بە قوتابخانەی ئاینی و ئیجازەدانی مەلایەتی لە لایەن عاریـف و زانای بلیمەت و هێژاو شاعیری نیشتمانپەروەری کورد مەلاخدری دەشتی و پێ گەیاندنی دەها ڕۆلەی کوردو ماموستایانی ئاینی لە ماوەی ئەو هەڤدەسالەی سەردەمی ژیانی دەشتی لە هەول و تێکۆشانی لە گوندی دارەبەن دا،دەشتی وەک مرۆیەکی ئاینی و نیشتمانپەروەر هەمیشە حەزی بە ژیانی ئازادی و سەربەخۆیی نیشتمانی خۆی کردوەو،بۆ گەیشتن بەو ئامانجە پیرۆزەش هەردەم لە خەبات و تێکۆشان دا نەوەستاوەو لە ڕێگەی شیعر نوسین و وتارەکانی ڕۆژانی هەینی و گوفتارو قسەکانی لە کۆڕی مەجلس و ناو خەلک دا گیانێکی پاکی کوردانەو دلسۆزانەی بۆ نیشتمانی خۆی ڕاگەیاندووە،دەشتی بەوپەڕی نەترسی و ئازایەتیەوە داوای ڕزگاری وسەربەخۆیی کوردستانی ئازیزی کردووە و هەرگیز بۆ خزمەت بە خەلکی کوردەواری درێغی نەکردووە،شیعرەکانی نیشتمانی بەلگەو نیشانەی ئەو هەول وخەباتەی دەشتین لەڕێگەی گەل وکودستانیئازیزدا،ڕۆژگاران و بەسەرهاتەکانی گەلی کـــورد ڕەنگ دانەوە و سەر چاوەی لە دایک بوونی شیعرە نیشتمانیەکانی دەشتین.

# دیمەنیکی گوندی دارەبەن

ئاوایی دارەبەن دەکەویتە سەرووی ڕۆژ ئاوای شاری هەولێری دێرینەوە و گوندێکی تا بلێی دلگر و خۆشە، دەشتی لەو گوندەدا سالەهای سال خزمەتی بە



قوتابخانەی ئاینی و خەلکی بە شەرەفی کوردەواری کردووەو ماوەیەکی زۆری لەم ئاواییەدا مەلایەتی کردووەو بەدەرس گوتنەوە بە فەقێیەکانی خۆی بردۆتە سەر قوتابخانەی ئاوای دارەبەن لەو سەردەمانەی دەشتی دا هەمیشە بیست تا سی

فەقێی لێ هەبووە و لە لایەن ئەو مرۆیە مەزنە زۆر سەربەرزانە ئەو قوتابخانە ئاییینیە بەڕێوە چووە.
هەزاران سلاو لە گیانی پاکی مەلا خدری دەشتی ئەو زاناو شاعیرو دانیشمەندە سەروەرەو نەمرەمان.

*



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD



# دەشتی و ئەزموونی کلاسیک

*

شیعری کلاسیکی کوردی ڕەنگ دانەوەی ئەو ڕووداوانە بووینە کە شاعیران لە سەردەم و ڕۆژگارانی خۆیان دا تێیدا ژیاون،تەواوی ئەو بە سەرهات و ڕوداوانەش تا بلێی تفت و تال و ناخۆش و پڕ لە جەفاو ڕەنج و کوێرەوەری و نەهامەتی و ئازاربووە،لە گەل ئەو هەموو دوا کەوتن و نەهامەتیانەش دا لە لایەن شاعیرانی کلاسیکی ئەو ڕۆژگارانەی کوردا هیچ سەر چاوەو کەنالێکی ڕۆشەنبیری و زانیاری و هەتا مەلایەتیش لە بەر دەستان دا نەبووە تا بتوانن ئەزموونی شاعیرانەی خۆیانی پێ دەولەمەندو تێر و تەسەلتر بکەن و لە لایەکی تریشەوە نەبوونی و کەم



دەرامەتی و ئازار و میحنەتەکان و دوا کەوتوویی کۆمەلەکەیان لە ڕادەیەک بووە کە هەرچەندە شاعیرانی کلاسیکی هەولیان بدابایە نەیان دەتوانی کە ئەو هەموو ڕووداوو بەسەرهاتە تفت و تالانەی ئەو ڕۆژگارانەو ئەو هەموو دواکەوتن و مەینەتیەکان و ئازارەکانی سەردەمی ژیانیان بخەنە چوار چیوەی شیعرەکانیانەوە،خۆ ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ئەوان توانای ئەندیشەسازی و بۆ نەچوونی ئەم کارەیان نەبووە،بەلکو ئەو شتانەی کە نووسیویانە کت و مت ڕووی داوە و لە ئارادا هەبوونە،بەلام بە تەواوی بە داهێنان وبەرهەم تێنەپەڕیون،لەگەل ئەوەشدا کە لە ڕەوتی شیعری کوردی و هەنگاوی کلاسیکیەت دا ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە هەمووی پڕیەتی لە تاقی کردنەوەو ئەزموونی سەربەرزی و

PDF 4 KURD



شانازی.شاعیرانی زاناو بەپێزە کلاسیکیەکانمان و هەر هەموویان لە نێو کارگەریەتی یەکتر سوڕاونەتەوەو کار تێکراوی یەکدی بووینە.
ئەگەر وردبینانە سەرنج لە شیعرە کلاسیکیەکان بدەین و بە باشی بیان خوێنینەوە ئەوەمان زۆر بە چاکی بۆ ڕوون دەبێتەوە کەوا زۆربەی شاعیرەکلاسیکیەکان زمانی فارسیان بە باشی زانیووەوشارەزایی یەکی تەوایان لەو زمانەوە هەبووەو موتالایان کردووە،ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی کە کار تێکراو بن بە شیعرەکانی فارسی، بە تایبەت بە شیعرەکانی سەعدی و حافیزی شیرازی ،زۆربەی ئەو شاعیرە کلاسیکیە کوردانە لە پاڵ زمانی زگماکی خۆیان دازمانی عارەبی و تورکی و فارسیشیان زۆر بە باشی زانیوە و گەلێکیان موتالا کردووە و شارەزاییەکی زۆریان لەو زمانانە پەیدا کردووەو شیعریشیان پێ هۆنیوەتەوە.
مەلاخدری دەشتی یەکێکە لەو شاعیرەکلاسیکیانەی کە بە زمانیکی شیرین و ناسک و پاراوەو گەوارا شیعری نوسیوەو لە مەیدانی شیعری کلاسیکی دا ئەسپی زانیاری خۆی تاوداوە،لە ڕۆژگاران و سەردەمی خۆی دا بەوپەڕی تواناوە گەیشتۆتە ڕێزی شاعیرەکلاسیکیەکانی کوردو کارتێکراویش بووە بە وانەوە،مەلا خدری دەشتی بە بەلاغەتێکی قول و ڕەوانەوە شیعرەکانی خۆی وشەبەندی کردووە و لە هەموو ڕویەکەوە تا بلێی گەش و جوان و لە بارن،هەوای پاک و زولالی کوردستانی ڕەنگین و چەوساوەیی و نەبوونی وەلاتێکی سەربەخۆی کوردەواری زۆر بە ڕوونی لە دوو تۆی شیعرەکانی دەشتی دا هەستی کرێشمەو تێ ڕامان دەکاتن،ئەو بەرهەمە شیعرانەی کەئێستاکێ دەیخوێنیتەوە زۆر بە چاکی پێیانەوە دیارن کە شاعیر چەندبە هونەر و زانیاریەوە شیعرەکانی نوسیوەتەوەو چۆن مەبەستەکانی لە چوار چێوەی شیعرەکانی خۆی داڕشتووە.
مەلا خدری دەشتی زۆربەی کاتەکانی خۆی بە موتالا و خوێندنەوە بردۆتە سەر،جگە لەوەش هەموو ڕۆژێ خەریکی دەرس گوتنەوە بووەو،واتە زۆربەی کاتەکانی بە خوێندنەوە و دەرس گوتنەوەو نوسین بردۆتە سەر،گەلێ جاران لە حوجرەکەی دا تا نیوەی شەوان نەدەخەوت و لە تەک ڕوناکی فانوسەکەی دا خەریکی خوێندنەوەی بەلاغەو مەنتیق و فیقەو فەلەکیات و بەیان و سەرف و نەحو وشەریعەتی ئیسلامی بوەو بە نوسینی کتێب و حاشیەو شیعرەکانی خۆی خەریک کردووە،لە تەواوی بوارەکانی زانیاری مەلایەتی دا مرۆیەکی تا بلێی بلیمەت و شارەزاو پڕ لە توانا بوو،بە هەوڵ و تێکۆشان و موتالا کردنی شەوو ڕۆژانەی لە بواری نوسین وشعرەوە خۆی گەیاندۆتە ڕێزی شاعیرانی مەزنی کلاسیکی.
شیعری کلاسیکی کوردی بە بەراورد لەگەل شیعری کلاسیکی میللەتانی دونیادا دانسقەیەکی دەگمەن و گەوهەرێکی زێدە بایەخ دارە بۆ ئەوەی نەوەکانی دوای ئەو هەنگاوە بتوانن پرۆژەی ڕۆشەنبیری خۆیان لە مەودای شیعر دابمەزرێنن،کە دەڵێین دانسقەیەکی دەگمەنە،تەنیا لە بەر خاتری ئەوە نیە کە شاعیرانی کلاسیکی

PDF 4 KURD



کورد لەوان هەنگاوانەیان دا کە تیاداژیاون هیچ تۆمار کراوێکی میللەت و نەتەوەکەی خۆیان لە بەردەستان بوو بێتن،ئەوان بێ بەش بووینە لەهەموو سەر چاوەیەکی پێویست لەو بوارەدا،تەنانەت ئەو داستان و ئەفسانەو حکایەتە دیرینانەشیان بە تۆمارکراوی لەبەر دەستانەوە نەبووە بۆ سود وەرگرتنیان،هەر بۆیەشە کە شیعری کلاسیکی کوردی تەنها لە ناو زهن و هەستی خودی شاعیرەکانی کلاسیکیمان هاتۆتە کایەوە وێرای بایەخ وەرگرتن لەنەتەوەکانی دەور و بەردا،کەوا تەواوی دانیسقەییە لە ڕووی بەلاغەت و دیقەت و وێنەکانی پێشەوەدا.

بۆیە لێکۆلینەوە لە شیعری کلاسیکی کوردی پێویستی بە خۆ ڕاهێنان وسەبرە،پێویستی بە کۆمەلێک مەعلوماتی فرە لایەنی هەیە،پێویستی بە تێرامان و ورد بونەوە هەیە بۆ ئەوەی بگەینە بنج و بنەوانیانەوەو بە باشی تێیان بگەین،چونکە ئەو بار و زروفەی شاعیری کلاسیک تیادا ژیاوە و شیعرەکانی خۆی لە بەریا هەلێنجاوە ،بارو زروفێک بووە هیچ ئاسۆیەکی تێدا بەرمەلا نەبووەو هەموو شتێک لە ناو دەریای لێل و تەماوی دا سەرەتاتکێیان لە گەل ئەو شاعیرانە دا دەکرد،واتە شاعیری کلاسیک لەو سەکۆ و بەندەن ولوتکەو شاخ و پێدەشتانەوە گۆرانی بۆ نەتەوەکەی خۆی چریوە کە دەنگ بواری پەڕینەوەی نەبووە،ئەمەش وای کردووە کە شاعیری کلاسیک لە گۆشەگیریەکی تەواو دا بژیت،چ لە ڕووی نامۆیی لە دەور و بەری نەخوێندەوار و دوا کەوتوو،چ لەڕووی کۆمەلایەتی و سیاسی،لە گەل ئەوەش دا خودانی هەست وشعورێکی زۆر گەورە و بەرز بووینە لە چاو کەسانی سەردەمی خۆیان دا.

شیعری کلاسیکی کوردی ئەو کاتە گەیشتە ترۆپکی داهێنان و پێگەیاندن کاتێ بەر لە کەمێ کەمتر لەدوو سەدە دا کە شاعیری جوانکاری و بەلاغەت و بەدیع (مەلا خدری شارەزووری واتە( نالی )نەمر لە سالی 1800 زاینی دا لە دیک بوو بەم جۆرە بە لە دایک بوونی نالی ڕەوتی شیعری کلاسیکی کوردی لە جوانکاریەکی سادە ڕووەوە بەرەو داهێنانێکی مەزن کەوتە ڕێ.

هەروەاش دوای سی و شەش سال پاش لە دایک بوونی نالی نەمر ڕەوشی شیعری کلاسیکی کوردی لە بیرۆکەی جوانکاری و عیلمی بەلاغەتەوە بەرەو جولانەوەیەکی فیکری و سەر چاوەی گرت و لە سەر دەستی (مەحوی) شاعیری نەمریشدا لە سالی 1836 زاینی دا گەیشتە ترۆپکی خۆی و بە تەواوی تێکەلی بەبیرۆکەی فەلسەفی بوو،بە تایبەت ڕێبازی سۆفی گەریەتی و ئەگزیستانسیالیزم بە چەمکە ئایینیەکەیەوە.

بەمجۆرە دەشتیش لە سالی 1909-1957 هاتە سەر ئەزموونێکی شیعری کلاسیکی کوردی و کە لە دایک بوو لە پێدەشتی پان و بەرینی هەولێری دێرینەوە لە بناری لوتکە چیای سەربەرزی قەرەچوغ و هەیبە سـولتان و کێوی سەفین و

PDF 4 KURD



بنارەکانی بێتواتەوشیعرەکانی گەشەیان کرد، هەتا چاوت هەتەر دەکاتن مەلا خدری دەشتی بەرهەمی چاک و بە پێزی شاعیرانی کلاسیکی بەردەمی خۆی بینیوە لە بەر دەمیاندا بە سەر سامی و ڕێزەوە وەستاوە و ئیلهامی جیهان بینی خۆی لێ وەرگرتوون و بۆ خۆی ئەزموونێکی دیکەی شیعری کلاسیکی کوردی دروست کردووە و ڕەوتی تایبەت بە خۆی پیادە کردووە و وێنەکانی خۆی بەشێوازێکیی تایبەت بە خۆی داناوەو دای ڕشتووە.

خەسلەتی شیعرەکانی مەلا خدری دەشتی زیاتر نۆستالگیایە،واتە غوربەت و سوتان و گەڕانەوە بۆ ڕابردووی پڕ لە کارەسات و بەختەوەریەکانەوەیە، بەم شێوە حەنینەوە دەشتی توانیەتی کە شێوازەتایبەتیەکانی خۆی پیادە بکات و بیپارێزێت،لە نێو سەرجەم شاعیرە کلاسیکیەکانی سەردەمی خۆی دا،دەبێ هەر واش بێ چونکە (دەشتی)شاعیر بەدرێژایی ژیانی خۆی هەمیشە بەشی هەر بەدبەختی و کوێرەوەری بووە،هەر لە گەل لە دایک بوونی دەشتی دەرگا تراژیدیەکانی ژیانی لێ والا بۆوە و خۆری عەتـف و خۆشەویستی لێ ئاوا بوو،بۆیەتەواوی شیعرەکانی ڕەنگدانەوەی ئەوان بار و زروفی دەروونین کە لە عومری مندالی و هەرەتی لاویەتی دا بە سەریادا تێپەڕیوە،هەر بۆیەش دوای تێ ڕامانێکی زۆر و لە دەست چوونی گەنجیەتییەوە بەم هەموو ئازارو ڕەنج و پەژارەوخەمەوە هەستی ناو دەروونی خۆی لەم شیعرە دا ئاوا دەردەبڕێت و دەلێت:

لەشکـری غەم هاتە سەر شاری دلم ئـەی یارەکەم  
بۆیێ یە نگ زەردم وهەر لەحـزە واهاوار دەکەم  
شەوبە قـەلبی پڕ برین ئەشکالی تۆ ئیجـاد دەکەم  
ئاووری فیرقەت لـە کورەی سینەدا پەیدا دەکەم  
ساحەیـاتـم بۆچـیە ئەی قەد نەمـامی باغـەکەم  
باغی عالـەم هەردەمێ نەوعێ لەگول ئیجاد دەکا  
ڕووحی بولبـول دائیـما شـەیدایی ڕوویی خۆی دەکـا  
هەرمنم بێ باغەبان و دل چاوەڕێی گولنار دەکـا  
ڕوویی تۆش جاناجـلەوکێشی چلەی زستان دەکا  
سـاهەتامـاوم لـەبەرچی من نـەگرییَم یارەکەم

## یا لە شعرێکی تردا دەلێت:

غـەریب و دل حەزینم شینە بۆ من جەژنی قوربانم  
قوڕی سەربان بەبانی سەر بکەم بۆ جەژنی قوربانم  
هەمووکەس ئیمـڕۆ وادەستی حەبیبی خۆی لە دەسـت دایە  
وەلی من بێکەسم بۆیێ شـەڕابی غەم لە دەستانم  
هەموو عـالـەم کراسی غەم دەسوتێنی بەکەیفی دل  
منی پـڕغـەم بەعەشقی دل خەریکی سـینە سـوتانم

PDF 4 KURD



**له گـفت و گـۆیی ئەحبابم بە جاریٚ بیٚ خەبە ر مـاوم**
**لە کونـجی میحنەتا مەسـتی فیراقی چـاوی یارانم**
**لە باتی جـەژنە پیرۆزیٚ دلم کەیفی لە گـریانا**
**لە بەر دووری لەباب و داک و هەم یار و ڕە فیقـانم**
**وەلیٚ هەرخوا بەخۆی کـاری عیبـادی خـۆی دەزانێتن**
**وەکو ئیـبنـول ڕوەندی بـا نەکەم تەنقیسـی ئیمانم**
**بە دەشتی قەت مەلین بۆچـی قسوورت کـرد لەگـریانا**
**قسورم خـۆ نەکـرد خوێنی بەدەن چک بوو لـەچاوانم**

مەلا خدری دەشتی لە ڕوی جوانکاری و بەلاغەتەوە تا بلێی شارەزابووەو تەنانەت تەواوی شیعرەکانی سەرفی تیباق بە هەموو جۆرەکانیەوە،سەلب و سیجاب و تەوریە و کنایە و تەناسوب و تەعلیلی زۆر چاک کردووە،ئەمەشیان ئەوە وەدیار دەخات کە زۆربەی کاتەکانی خۆی بە خوێندنەوەی ئەو سەر چاوانەوە بە سەر بردووە کەوا دیدی جوانی لای مرۆڤ بەر فراوان دەکەن و سەیری ئەم وێنەیە بکە کە لەم شیعرە دایە و دە دەفەرموێت و دەڵێت:

**سەدای یاسینە یـا شینە لەدەم زیندانی بیماران**
**گلەی نازینـە یازینەلە مەم دەرمانی تیماران**
**جەفای ئەییوبە زامی دل نەوای یەعقوبە وامی دل**
**سیفەت فەرهادە بۆ شـیرین لە ئێش و ژانی ئێـواران**
**دوا هیوایی ئامینت لە سـحری سـوخمەیـی شینت**
**دەکا داوایی ناسینت لە بەر هەیوانی ڕێـداران**
**لەزامی شیددەتی هیجرەت بـەتامـی زیللەتی فیرقەت**
**قـەفەس جێگامە ئامانجم بە تیرانی کەمیـنداران**
**لە گولناری ڕخت بۆییٚ سـەبـا نـەیدا بەمن بـۆییٚ**
**لە گولزارا بە شەوبۆیی دەکەی مـانی ئەمینـداران**
**فەلەک کێلانە قەوسی تۆ مەلەک جێلانە دەوسی تۆ**
**بە ئەبرۆی تۆ منم قـەد دال و ڕێزانی برینـداران**
**لەمەیدانی ئەلەستۆدا بە مەیدانی لە دەست تۆ دا**
**موقەییەد بووم منی دەشتی لە قـەبرستانی بێداران**

بەڵێ شیعرە عیرفانیەکانی مەلا خدری دەشتی هەر بە تەنها پیادە کردنی ڕێبازی سۆفیزم نەبووە لە شیعردا بەلکو لە گەل ئەوەش هێمایەکی زۆری بۆ پەیوەست دانی غوربەت و ئارەزووەکانی خۆی دەگەل ئەم ڕێبازەدا دەدایە دەستەوە،تەنانەت بە وەستان لە بەر قاپی خودا دا تەواوی ئازارو بە سەر هاتەکانی خۆشی دەخاتە ڕوو تا وردە وردە لە گەل ئارامگای ڕۆح دا بتاوێتەوە و تێکەل بەو چەپکە نوورەبێت کە هەمیشەیی و بیٚ وچانە، دەشتی شاعیرو هێژا وەک عابدێکی

PDF 4 KURD



گەورە لە سوژدەو پەرستن دابووە،ئەویش کە نووری خوداو پەروەردیگاری مەزن بووەو بە تێڕوانین و خوێندنەوەی شیعرە عیرفانیەکانی ئەم ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت و دەبینین لێرەدا دەڵێت:

**لـەدەوری دەرگەهت یاڕەب عـەجەب شـێواوی گـریـانم**
**عـەفومـەتلووب و ڕوومـەحـجووب و مەست و سینەبریانم**
**ئەگەر تـەڕدم بکەی لـەم جێگە سـامن ڕوو لـە کێندەرکەم**
**کەسی بێـکەس لە هەرجێگا ئەتۆی ئەی دەربە ئیحسانم**
**لە دەوری پیری پێشـوودا دەخـالـەت بوو ڕەهی موزنیـب**
**منیش گەردەن کەچم قوربان غـەریقی بەحری عیسیانم**
**لـەخۆت مەعلومەهەرچی بوو بـەتەنیا قەت نەبـووم ڕەببی**
**بە زولمی خۆم لە خۆم فەوتا جینـان و حوورو غیلمانم**
**بە ڕوویی ڕەش ئەوا هاتم سپی ڕوو بـۆسی دەرگاتم**
**بە قوربانت دەبم هەرچی کە کردم لێی پەشـــــیمانم**
**هەزارانی وەکوو من وا لە دەورەی کـەعبە مـەحزوونـن**
**لـە ڕووحانی دەخوازن جامی کـەوسەری جـانی جانانم**
**لە بەینی دەرگـەه و بەردی سـیەه کندڕ لە مـلـماکـەم**
**دەبـێ لیم خۆش ببـێ مـەولانـەکەی تـەنویری ئیمانم**
**سەگی بـەر دەرگـە تم گەرچـی لە دەفتەر نادری زەنبم**
**وەلێ ئەحمەد پـەرســـتم بۆ شەفـاعەت دڵ بە ئیـقانم**
**ئـەوەی دەسـتی نـەبوبـێتن لـە ئـەسـراری ویسالی تۆ**
**دەبێ دەشـــــتی نـەبـێ جـانا لە زاری دل بە ئیـقانم**

مەلا خدری دەشتی بەشێکی شیعرەکانیشی (ئەدەبی نامەن)واتە بە نامەی شیعری وەرامی دۆست و یاران و زاناو خوێندەوارانی سەردەمی خۆی داوەتەوەو هەستی خۆی لەو نامانەشیعرییانە دا زۆر بە ڕاشکاوی و دلسۆزیەوە دەر بڕیوەو مەبەستی خۆی ڕا گەیاندووە دەبینین لەم نامە شیعریەی دا کە بۆ مەحمود ئاغای نۆغەرانی نوسیوەو دەڵێت:

**بانـامـەیی ئایازم وەسـلی بـداتـە مـەحمـود**
**تاجامەیی نیازم ئەمڕۆکـە بێتە مـەوجود**
**سـەرکەش سەرایی ڕەنگ و نـام و نیشـانی یـاری**
**بۆ گەنجـەکـانی کـوردی دەرخـوم بە عـەینی مەقسود**
**شیعری دلی زەبوونم فەوتا لە داخی میللەت**
**دیوانی پیر فنـوونم چـوو بۆ لیوایی مـەقسود**
**هەرکەس کەجەوهەری بێ یەک دانـەگەوهـەری بێ**

PDF 4 KURD



نابێ لە کـەس بـەری بێ فـی شـاهدن وەمەشهود
خێچێژی شیعرەکانـم زەوقی دەوێ بزانی
تامی شەڕابی بادەی پی حـەوزی ئاوی مەورود
فـەرهادی شیـعری دوورم بـۆ بێستونی بردم
بۆ نەقشی ڕویی شیرین هیوایـی دلمە مـەقسـود
بارانی ڕەحـمەتی خوا قاڕەش دەکـا بە شاگول
بۆ نـوستنی سەپانـان چەنـد خۆشە زیللی مەمدود
بۆ یـارەکـانی عەسـری ئـەم هەدیە گەر بنێرم
ئـایا دەبێ بـزانن مانایی شیـعری مەنشـود
هەرکەس لە شیعرەکانـم یەک بادەیێ بنـۆشێ
والا دەبێ لە بـۆ ئەو سەد ئیش و کـاری مەسدود
یەعنی جەمالی یـاران نەزمی مـنی دەوێـتن
بۆ لاوەکانی کوردی بـۆ گەنجـەکـانی مەعدود
ئەی گەنجی نۆغەرانی نـەم دیوە زاتی پـاکت
سـەد قافلەی بـەرانی لێت بێ سـەلامی مەردود
ئەمری جـەنـابی تۆم دێ فەحـواشـی تێ گەیشتم
دل غوربەتی دل هەلسـتا بۆ شـۆخەکانی مەرقود
هەنیسەی بولبلی دل فیکری گولی کە بۆ هات
هەستاوە پێ چریکەی چوو بۆ مەقـامی مەحمـود
هەردەم قـەلـەم دەزانی هەلبەستەبەسـتە ڕێگەی
تەڕشـیحی سـەد گـولانی ناگـاتە سیدری مەخـزود
یەک زائیدەن ئیتر دوو مەعلوم بـە سێ مساوین
هەشتا بە عەینی عیرفان ناگاتە تەلـعی مەنـفود
گوفتاری فەلسەفیەت قەدری نەمـاوە ئێستا
باعیـس بە زولـمی ئاغاو شـێخ و مەلایـی مـەولود
گـەر بێ هەمـوو وەکو یەک هەولێ بدەین لە بۆ خوا
فەرقی دەبێ هەمووکەس گەورە و بچوک و بێ هود
سەد ڕەنجی گەنجەکانی کوردی غەریب و بێکـەس
دەڕوا بە هیچ و خۆیا وەک شیعری من بەبێ سود
ناگاتە مەقسـەدی خـۆی کـەس لەم زەمانەی حـازر
گەر تێ بگـەی دەزانی ئەی بەچە ئاغای مـەحمـود
دەشتی بەســـــەد کنایەت شەرحی دلی بە تۆدا
سـەد حەیفە لێت بزربێ تەسـبێحی دوڕو زەمـیود

*

PDF 4 KURD



یان لەم شیعرەی داکە بۆ مامۆستای هێژاو نەمرمامۆستامەلا عەبدوڵڵە بێتواتەیی کە مامۆستای دەشتی بووە و زاناو دانیشمەندێکی تا بڵێی بلیمەت و گەورە بووە بە عارەبی ئەم شیعرە نامەییەی بۆ دەنوسێت و دەڵێت:

الی من له الاعجاز

الی من له الأعجاز من بدر علمه

بشق الاشارات لرمـات اسده

كنايات زهنه كمـوج لمتمتم

بنهزالهوى اذ لاح فى مـاء دلده

هـــــوالغـازى فى بدر كراته

عـــناصيرنجمة بأحداث قتلـه

اذ لاح جوهـرالبلاغات شمسـه

تضيء لديـجور بأفـكار ذكـره

مضاف الى الله العـزيز دليله

لأزهار تسليما لقهزائى بأمره

يداوى كل علم بطـــــرفـه

اذ مـال ميلة بـأنـــوار ذهنه

قسور من الدشـتى تقليل مدحـه

ولاكن له العفو بأركان فضـــله

بەم جۆرە لە ناو دیوانی دەشتی دا دەتوانین سیمای (ئەدەبی نامە) بدۆزینەوە بە تایبەتی لەو نامانەی کە بۆ کەسایەتی و زاناو مەلاکان و دۆست و هەڤالانی خۆی ناردووە.

زۆر بە داخەوە کە مەلا خدری دەشتی تەنیا 48 ساڵ ژیاوە و تەمەنێکی زۆر کورتی بردۆتە سەر،لەو ماوەیەکورتەشداکە ژیاوە هەمیشە خولیای خۆشەویستی نیشتمان و خوا پەرستی بووەو هەرگیز میللەتی خۆی لە یاد نەکردوە، دەتوانین کەبلێن بابەتەکانی شیعرەکانی دەشتی عیرفانی و نیشتمانی و ئەوین وخۆشەویستی و دلدارین و هیچ یەکێکی لەوانە فەرامۆش نەکردووە.دەبینین دەشتی شیعرەکانی خۆی کردۆتە حەوشەی بەربەرەکانی زولم و زۆرداری و چەوساندنەوەی نەتەوەکەی خۆی، لەو کات و ڕۆژگارانەی کە خۆی تیادا ژیاوەو نەتەوەکەی تیادا چەوساوەو ژێر دەستەی داگیرکەران بووەو ئەویش هەرگیز ئەو زولم و زۆر داریەو نەبوونی مافێکی نەتەوایەتی و ڕەوای گەلی کوردی لە یاد نەکردووەو زۆر بە ڕاشکاوی باسی ژیانی گەلی کورد دەکات و تەواوی هۆیەکانی دواکەوتن وچەوساوەییش باس دەکات وداوای خەبات و تێکۆشان لە پێناوی کورد و کوردستانی ئازیزی خۆی دەکات، هەروەک لەم شیعرەنیشتمانیەی دا باسی هەژاری و نەداری و نەزانین و گیانی ناپاکی وبەربەرەکانی یەکتر کردن وهۆیەکانی

PDF 4 KURD



نەبوونی کیانێکی میللی کورد و بە تالان بردنی سەروەت و سامانی کوردستان لە لایەن داگیرکەرانەوە باس دەکات وهەستی پاکی خاک پەروەری خۆی لێرە دا دەر دەبڕێتن و داوای یەکتر گرتن و ڕزگاری کردنی کوردستان و هەول و خەبات لە پێناوی خۆ ئامادە کردن و پەیدا کردنی چەکی بەرگری و هەول دان بۆ وەدەست هێنانی تەکنەلۆژیای تازەو پێشخستنی کوردستان و وەدەست هێنانی نیشتمانێکی سەربەخۆ دەکات و دەلێت:.

بۆ نیگبەتی ئەم میللەتە بی جانە دڵی من
بۆ میللەتی ئازوردە لە زەلیانە دڵی من
بۆ حیددەتی ئەم کوردە لە ترسانە دڵی من
بۆ زیللەتی ئەم کوردە لە گریانە دڵی من
کوردینە وەرن شەربەتی ڕێکی بە دەماکەن
ئەم مولکەلەدەست عالەمی بێگانە ڕەهاکەن
یەکدی مەکوژن ڕوویی سەناییع لەهەوا کەن
بەم ئاووری ناکەیە سوتاوە دلی من
خاکی وەتەنی ئێوەیە هەردەم کەدەنالی
سەد حەیفە کە ئەم مەعدەنە ئەڕوا بە بەتالی
ئەمڕۆکە سبەی دێتەوە بۆ حەڕبی شیمالی
بۆ سەنعەتی تەییارەیە هاواری دلی من
تەندوورە مەکەن ڕۆژی بەسەرکەوتنە ئەمڕۆ
جەنبوورە مەکەن ڕۆژی وەدەرکەوتنە ئەمڕۆ
سەم تورە مەکەن ڕۆژی سەعی کردنە ئەمڕۆ
بۆ سینەمای ناتیقە بێ نوتقە دڵی من
داسووک و تەورداس و دەمپێمەڕە تاکەی
دەرۆزە و و پاڕانەوە و بێ پارە هەتاکەی
ئەم مولکەلەدەست لەندەن و ئاسوچرە هەتاکەی
مەعروفی ئە لەتریک و فەنەرگازە دڵی من
گوگردە ئەسوتێەوە ئەمڕۆ لە زەمینا
ئینگلتەرە هات و وەری گرت و لە دەمی نا
ئێوەش بە هەموو دەم سەرو مال و لە ڕەهینا
شیواوی کەبابی جگەری کوردە دڵی من
لۆکەی وەتەنی ئێوەیە ئەمڕۆ بووە دینار
رووحی وەتەنی ئێوەیە ئەم فلسی خەریدار
بەم حالەیە دەشتی کە دەبێ عاجز و بیمار
هەردەم کە خەفەتخان و بریندارەدڵی من

PDF 4 KURD



دیوانەکەی دەشتی پڕیەتی لە شیعری بە هێز و پڕ لە جوانی و خۆشـەویستی و نیشتمان پەروەری و عیرفانی کەدەشتی دەستێکی بالای هەبووەلە هۆنینەوەی شیعری کلاسیکی ، گەلێ لە شیعرەکانی دەشتی لە ڕۆژگار و سەردەمی خۆی دا لە ناو کۆڕی فەقێ و مەلاکان دا باو بووەو لە زۆربەی کۆڕ و مەجلیسەکان دا بە ئاوازی تایبەتی و پڕ لە جۆش و خرۆشی فەقێیە دەنگخۆشەکان دەخوێندرایەوەو گەلێ کەس ئەم شیعرانەیان هەر لە بەر بوون و ئێستاش گەلێ جاران لە کۆڕ و مەجلسەکان دا دەخوێندرێتەوەو من ئێستاش ئاوازی شادو پڕ لەخرۆشی سەیدا مەلا عوسمان گەزنەیی و گەلێ لە فەقێکانی ترم لە گوێیان دا دەزرینگێتەوەو ئەو ئاوازە خۆشانەم قەت لە یاد ناچێتەوە کە شیعرەکانی دەشتیان بە ئاوازێکی دلفڕێن و تابڵێ دلگیر دەخوێندەوە و کۆڕی دانیشتنەکانی ئەو سەردەمانەیان پێ شاد دەکرد .

ئەحمەد دەشتی :بەرلین 2001

PDF 4 KURD



# ئاوڕێک بو دواوە

ئاوڕدانەوە لە ڕابوردوو و سەرگوزەشتەی ڕابەران وسـەروەران وهەموو ئەوانەی کەزۆریان خزمەت بە گەل و ولات ومێـژووی ئـەدەبی و فەرهەنگی گەلی کووردی سالەهای سال چەوساوەی ژێر دەستی داگیرکەرە دڕندەکانەوە کردووە و لەڕێگەی ئـازادی و سەربەخۆیی کوردو کوردسان دا بەگیان و بە دل هەرگیز نەسرەوتوون و بوونەتە قوربانی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستانی ڕەنگینیان ئەوانەی کەوا هەرگیزنامرن و جێگەی شانازی و سـەوروەریەتی گەلی کوردن،پێویستە هەمیشە یادیان بکرێتەوە، کەوا لە ڕێگەی کورد و کوردستانی ڕەنگین دا هەتا دوا هەناسەی ژیانیان ساتێک نەسرەوتوون و هەمیشە تێکۆشاون و تا توانیویانە لە پێناوی بەختەوەری و سەربەرزی گەل و وەلاتیان خۆیان ماندوو کردووە و خزمەت گوزاری میللەتی خۆیان بووینەو لەو ڕێبازەپیرۆزەدا بەوپەڕی دلسۆزی و وەفاو خۆشەویستیەوە لە خەبات و هەولدان کۆلیان نەداوەو بە گیان و بەدڵ بۆ پێشکەوتن وئازادی و سەربەخۆیی کوردو کوردستان ورزگاری لە چنگ نەیارو دوژمنان دا هەمیشە سوتاون و خەباتیان کردووە،بەکردەوە و گوفتاری شیرین و شیعری پڕ لە جۆش و خرۆش و بە سۆزی نیشتمانی و تەژی لەپەندو ئامۆژگاری بەسودیان بۆ خاک و نەتەوەکەیان بە زمانی باوک و باپیرانیان نوسیوەو هەولیان داوەو بۆ هەمیشـە دڕکی ناو چاوی دوژمنانی خاک و میللەتەکەیان بووینە وبوونەتە هۆی مانەوەی زمانی زگماکیان و نەفەوتانی زمانی کوردی ، بە بەرهەمەکانیان و خەباتی ڕەواو ڕاستیان لە پێناوی سەربەستی و بەختەوەری بوونەتە مایەی شانازی و سەربەرزی گەلی کوردوکوردستان، هەموو ئەوانەی کە نەتەوەی کوردیان لە تواندنەوەو نەمان ڕزگارکردووە،دەبێت سەروەرانە یادیان بکرێتەوەو هەرگیز لە بیر نەچنەوە،ئەمەش پێویستی سەرشانی هەموو ڕۆلەیەکی کوردە بە تایبەتی نوسەرانی ڕۆشەنبیر و دلسۆزانی کوردستان کە هەمیشـەبە نوسین وشێ کردنەوەی بەرهەم وشوێنەوارو ژیانی کەسایەتی وشیعرو نوسیەنەکان و خەبات و تێکۆشانی ڕەوایان بۆ میللەتەکەمان گەلێک باسیان لە سەر بنوسن و ناوی مەزنی ئەوسـەروەر و ماموستاو ڕابەرانەی کە ڕێ نیشاندەری بزوتنەوەی ئازادی و ڕزگاری وسەربەخۆیی بووینە،دەبێ ناویان بە زێر بنوسرێتەوە کاری بکەین کە قەت لە بیرمان نەچنەوە، دەبێ ناوی هەموو ئەو سەروەرو مەزنانە لە لاپەڕەکانی دیرۆکی کوردو کوردستان دا بە شانازی بنوسرێتەوەو پەیکەری نەمریان لە هەموو شارو شارۆچکە و ئاواییەکانی زێدی باوک و باپیرانیان بۆ دروست بکرێت و تا یادی خەبات و شیعر و بەرهەم و نوسینەکانیان و هونەرەگەورەکانیان لە ناو دل و دەروون دا بۆ هەتا هەتایە هەر زیندو بێتن و ببنە سەرچاوەی هەول و خەباتی میلليمان،بۆیە دەبێت ناوی قوتابخانەکان و شوێنە

گرینگەکان و خیابانەکان و پارک و شوێنەگشتییەکان بەناوی ئەو ڕابەر و زاناو شاعیرو سەروەرانە بکرێت،ئەوانەی کە زۆریان خەبات کردووە و خۆیان گەلێک ماندوو کردووەو زمانی باوک و باپیرانی خۆیان کە یەکێکە لە بنەما سەرەکیەکان و بنچینەیی بوونی هەر میللەتێک دەبێ هەمیشە یادیان بکەینەوە ،ئەوانەی کەنەتەوەکەی خۆیان لە چنگی دڕندەکان و توانەوە ڕزگار کردووە و لە هیچ سەردەم و کاتێک دا زمانی شـیرینی باوک و باپیران و میللەتی خۆیان لە یاد نەبردۆتەوە و هەمیشە لە بواری زانستی و زانیاری ویەکێتی وخۆشەویستی نیشـمان دا دژی نەیاران و داگیرکەران بەزمانی شیرینی کوردی خۆیان نوسیویانەو شیعری شۆڕشگێڕیانەوتەژی هەسـتی پاکی کوردایەتی و ڕاپەڕینیان نوسیوەو تێکۆشاون،گیانی پاک و بیری نەتەوایەتیان هەردەم بەرز کردۆتەوە و کتێبخانەکانی کوردیان بەبەرهەمەکانیان دەولەمەندتر کردووە و جێگەی شـانازی هەتا هەتایەن،شتێکی ڕوونیشە کە سەروەریەتی و گەورەیی هەرمیللەتێک بەبوونی گەورە پیاوانی زاناو دلسۆز و خەباتگێرە، بەرز کردنەوەی ناوی ئەو مرۆ مەزنە کوردانەی کەهەمیشە بۆ خاک و نەتەوەکەیان گیانی خۆیان بەخت کردووە و پێشمەرگەی ڕاست و پاکی کوردایەتی و نیشتمانپەروەری بوونەپێویستی سەر شانی هەموو دلسۆزێکی کورد و کوردستانە،دەبێت کەوائەو سەروەرانە بە سەدان وتاروباس و پەڕتوکیان لە سەر بنوسرێتن ولەلایەن حکومەتی هەریمی کوردستانەوە هەول بدرێت کە دەزگایەکی تایبەتی بۆلێکۆلینەوەو شێ کردنەوەی بەرهەم و نوسینەکانی هەموو شاعیرو زاناونوسەرانی گەلی کورد دابمەزرێت و،بەسەرهات وشوێنەواری ژیان وگەورەیی وکەسایەتی ئەو زاناو بلیمەتانە زانستیانە لێیان بکۆلدرێتەوە،کەسایەتی وتەواوی بەرهەم و نوسینەکانیان بخرێتە بەر چاوی خوێنەران وکتێبخانەی کوردەواری و بەنوسـین و شیعرو هونەرە پڕ لە سودەکانیان دەولەمەنتر بکرێتن،دەبێت ئێمەش زانستیانە تەواوی خەبات و هونەر و بەرهەمەکانی شارەزایان و گەورە پیاوانمان بکەین بەسەرچاوەی خۆشەویستی ویەکگرتتن و بەرەو پێشەوە بردنی بزوتنەوەی ئازادیخوازیمان وکەلتور و فەرهەنگی میللیمان،ئەو هەموو کەلەپوورەی نەتەوایەتیمان بکەین بە قوتابخانەی شانازی وسەروەری و سەربەرزانە زیندوو بکەینەوەوسودیان لێ وەربگرین.

گەلۆ گەلێک جێگەی داخە کەوا زۆر لە گەورە پیاوان و زانایانی دلسۆزمان هەن کە وەکو پێویست یادیـان ناکرێـتەوەو هەروەک بلێی نەبووبن و زۆربە دەگمەن باسیان لێوە دەکرێت ولە بیر چوینەتەوەو پشت گوێ خراون،کە ئەمەش یۆخۆی گوناهێکە و زیانێکی گەورەیە بۆ کەلتورو فەرهەنگی نەتەوایەتیمان، فەوتانی ناوی کەسایەتی وبەرهەم و ئەو خزمەتانەی کە لە ڕابوردوودا بە خاک و نەتەوەکەمان کراوە هەرگیز جێگەیان پڕ نابێتەوە،خۆ ڕابوردووی گەلی کوردیش لە ڕابوردووی میللەتانی پێشکەوتووسەربەخۆ هیچ

PDF 4 KURD



کەمتر نیەو تا بلێی دەولەمەندوبلندو مەزنە، هەروەکو گوتمان کە ڕابوردوو گەنجینەیەکی زۆر بەنرخ و بەهادارە و سـەروەریەتی و گەورەیی هەر میللەتێکیش لەبوونی ڕابووردووی زانایان و گەورە پیاوانی ئەو میللەتە دایە کەوا جێگەی شانازی و سەربەرزی ژیانن،دەبێت ئێمەی کوردیش وەک تەواوی میللەتانی ئەم سەرزەمینە زیاتر گرنگی بە ڕابووردووەکانی خۆمان بدەین وبەرزتریان بکەینەوە و بەوپەڕی شانازی وسەرفرازیەوە ناوی بلندی سەروەرانمان هەمیشە زیندوو بکەینەوە دەبێت دەزگایەکی تایبـەتی بۆ یادو بیرەوەی و زیندوو کردنەوەی ناوی مەزنەکانی کورد وکەسانمان و تەواوی زاناو ڕابەر و شارەزاو دلسـۆزو پێشمەرگە نیشتمانپەروەرەکانمان و قارەمانانی نەتەوەکەمان دابمەزرێت و هەمووخەبات و بەرهەم و یادگـــاریەکانی ئەو دلێرو و دلسۆز و زاناو شاعیرو هونەرمەند و ڕابەرانەی کە خۆیان بۆ کورد و کوردستان ماندوو کردووە هەمیشە ڕێزیان بۆ دابندرێت ،دەبێت کۆڕو سیمینارو سەدان پەرتوک و وتاریان لەسەر بنوسریتەوە هەمیشـــە بەوپەڕی ڕێزەوە یادیان بکرێتەوە،لەم جیهـــانەدا دەبینین کە میللەتانی پێشـــکەوتوو خاوەن کیان و سەربەخۆ چۆن یادی گەورە پیاوانی خۆیان دەکەنەوەو چۆن گـەورە ترو پیرۆزتریان دەکەن و دەها پەرتوک و وتاریان لە سـەر نوسیون و هەرگیز لە یادیان ناکەن و بۆ بیرەوەری و ڕێز لێ نانیان سمینارو ئاهەنگیان بۆ دەگێیدرێت و لە تەواوی دەزگا و ڕاگەیاندنەکانیان وەک سەروەرو مالی میللەتەکانیان باسیان لێوە دەکرێتن وکڕنوشیان بۆ دەبەن و ناوی مەزن و هێژایان خستۆتە دیرۆکی نەتەوایەتیان و هەمیشە سەروەرانیان لە ناو دل دایە،ئەمەش بۆخۆی گـەورەیی و پڕ لە توانایی و مەزنایەتی ئەو میللەتانە دەردەخاتن کە ڕێز و ئیحترام بۆ گەرورە پیاوان و ئەوانەی کە مێژووی میللەتەکانیان دروست کردووە دادەنێن،دەبا ئێمەش لەو بوارانەوە هەنگاوی پیرۆزترو گەورەتر باوێین و ڕابوردووی خۆمان بە شانازیوە هەمیشە زیندوتربکەینەوە دەبێ هەموو کوردێک بە دل و بەگیانەوە بۆ سەرکەوتنی ئاوات و نیازی سالەهای سـالی خەباتگێران و نیشتمانپەروەرانی کوردسـتان تێ بکۆشێت ولە پێناوی وەلاتێکی سەربەخۆو پڕ لە بەختەوەری کوردەواری هەمیشە لە هەول و خەبات کردن دابێت کەگەلی کوردی هەژارو چەوســاوە تیــادا ئاســودەبـێت و بەوپەڕی خۆشەویستی و ئەشق و ئەوینەوە بەرەو ئەو ڕۆژە بڕوانێت کەوا گەلی کورد تیادا ئازاد و ڕەهاو سەربەست لەناو مال و ژیانی خۆی دا لە ناو خاکی شیرینتر لە هەموو ژین و ژیانمان دا ئازادو دووربێت لەچەوساوەیی و ژێر دەستی دڕندە داگیرکەرەکان دا گەلی کوردیش وەک تەواوی میللەتانی جیهان بەرەو پێشەوە بڕوات و ئێمەش بە تەکنیک و تەکنەلۆژیای تازەوە گەل و وەلاتمان پێش بخەین،ئێمەش وەکو هەموو گەلانی ئازاد و ڕەهاو سەربەخۆ لە خاکی خۆمان دا لەم کوردستانەی کە زێدی باوک و باپیرانمانە ئەو وارەی کە وەلاتی لە گیان خۆشەویست تری خۆمانە ئەو خاکەی

PDF 4 KURD



كەهەزاران ڕۆلەی دلسۆز و بە وەفا و خەباتگێڕو قارەمانمان گیانی خۆیان لە پێناو كردۆتە قوربانی تیادا ئازاد و سەربەخۆ و شادان و خەندان بژین،چەندە خۆش و بەختەوەرانەیە كە مرۆ چۆن بە ئازادی وەدونیا هاتووە ئاواش بە ئازادی و سـەربەستی لە ژیان دا بژیتن،ئێمەش وەكو هەموو مرۆیەكی ئەم جیهانە بەشمان لە ژیان و ئازادی و سەربەخۆیی خاك و خۆمان دا هەیە،با ئێمەش بەهەستی پاك و خەبات و تێكۆشانی ئەم سەردەمەی خۆمان بە گیان و بە دل دلسۆزانە بۆڕزگاری هەمیشەییمان هەول بدەین و لەم كوردستانە ڕەنگینەمان داكە زێدی باوك و باپیرانی خۆمانە دوورە چەوساوەیی و دەربەدەری و مـال وێرانی وخاك لێ داگیركرای و ڕەتێندراوی ئاوارەیی بین،دەبێ زۆر دلسۆزانە بیر لەوە بكەینەوە كەوا بۆچی ئێمەی كوردیش وەكو هەموو گەلانی ئەم سـەر زەمینە سەربەخۆو ئازادو دوورە ژێردەستی و ژیانێكی بەختەوەرانەنین؟بۆچی سـالەهای سالە داگیركەران دەمان ڕەتێنن،مالمان وێران دەكەن،خاكمان داگیردەكەن ئەنفالمان دەكەن بە ناوی دین بێ بەشین لە هەموو مافێكی ئازادی و سەربەخۆیی گەل و وەلاتمان دەكەن؟دەبا هەموو لە هەموو بیر لەوە بكەینەوە كەوا تاكەنگی ئاوا هەزاران ڕۆلەی قارەمان و دلسۆز و ژیان نەدیوی ملیمان بە دەستی داگیركەرانی كوردستان بە ئەنفال و كیمیاباران وگەل كوشتن لە ناو بچن و نەمێنن و ببین بەقوربانی، بۆچی ئاوا سەدان شارو گوندو ئاواییمان لێ تەعریب و كوردستانمان داگیر بكرێت؟دەبا ئێمەش هەمو لە هەموو یەكگرتوو دلسۆزی خاك و نەتەوەكەمان بین لە پێناوی سەربەخۆیی و ڕزگاری هەمیشەییمان هەموو دارو نەدارمان بكەین بە قوربان ، دەبا هەمو كوردێك هەرگیز ماف بە خۆی نەداتن كە یاری نەیاران و داگیركەرانی كوردستان و دوژمن بە خۆیی بێت و چی دوژمن پێی باشە وابێت و بە هەستی تەسك و تریسك وبۆچونی ناڕاست هەر چەواشەو سەر لێ شێواو و دوورە ئازادی بێت،بۆچی ئێمەش كوردستانێكی سەربەخۆو ڕزگارمان نەبێت ؟ گەلی كوردیش وەكو هەموو نەتەوەیەكی ئەم جیهانە مافی سەربەستی و ئازادی و سەربەخۆیی خۆی نبێت؟بۆچـی داگیركەران ئاوا خاك و نیشتمانمان داگیربكەن ونەیەلن كە بەسەربەستی بژین و ئەم هەموو خەم و جەفاو میحنەتانەی ناو دەروونمان هەر لە زیاد بوون دایەو بەبێ سەر و شوێن و ون و وێل دەكرێین،تالان وخاك لێ داگیر دەكرێن،ئەنفال وكیمیاباران دەكرێن ، هەزاران ئاوایی و گوندمان لێ خاپوور دەكرێت، هەوای ئازادی سروشتیمان لێ دەخنكێندرێت بە سیانید و گازی خـەردەل هەزارانمان لە ناو دەبردرێت،سەدان گوندو شارەخنجیلەكانمان خاپوور دەكرێت،ئاوی كانی و ڕووبارنمان لێ دەخنكێنن،زیندانەكانی ڕژێمە یەك لە دوای یەكەكانی داگیركەران تەژی ڕۆلە نیشتمانپەروەرو دلسۆزەكانی كوردو كوردستان دەكرێتن،هەزارانمان ون و وێل دەكرێن،لە بیابانەكان بە كۆمەل زیندە بە چال و لە ناو دەبردرێن و بێ سەر و شوێن دەكرێین،گیانی یەكتر كوشتن و دژایەتی

PDF 4 KURD



یەکبون و نیفاق لە ناو هەست و دەرون دا دەچێنن،کورد بە کورد بە کوشتن دەدرێت و ئەم نیشتمانە شیرینەمان کراوەتەگۆمی خوێن،تاکەی هەر ئاوابین وبە دەهۆل و زوڕنای دوژمنانمان هەل بپەڕین،بۆچی ئێمەی کوردیش خاوەنی مال و ژیانی سـەربەخۆیی خۆمان نەبێن؟ خۆ تائەو ڕۆژەش کە گەلی کـورد لە پێناوی ڕزگاری کوردستان دا بە تەواوی یەکترنەگرێتن و بەرامبەر هەموو نەیاران دا بە هەستێکی پاک و پڕ لە خۆشـەویستی و خاکپەروەری و بیرو باوەڕی ڕاستەقینەی کوردایەتی هەول نەداتن و بیری تەسـک و یۆچونی ناڕاست و کوردستان بە قوربان کردنی حزب و بۆچوونە هەلەکانمان لە ئارادابێت، ئەوا هەرگیز بەم ئاواتە دیرینەو مافە ڕەوایانەمان شاد نابین وهەر ئاواش ژێردەستەی چەپۆکی نەیارانمان دەبین،دەبێ هەموو لە هەمووتەواوی هەست و نست خودی حزبەکانیشمان بکەین بە قوربانی کوردستان نەک کوردستان بکەین بە قوربانی حزبەکانمان،دەبێ ئەوە باش بزانین کە سـەروەری و سەرکەوتنی هەرمیللەتێک بەرامبەر دوژمنان و داگیرکەران گیانی پاکی یەکێتی و نیشتمانپەروەری و خۆ بەخت کردن و قوربانیەلە پێناوی بیری نەتەواییەتی و ڕزگاری هەمیشەییە، دەبا کوردیش یەک بگرێت و بۆ سەرکەوتن و سەربەخۆیی دژ بە دوژمنانمان هەول بدەین و کوردستانێکی سەربە خۆمان وەدی بێنین و نیشتمانی خۆمان لە چاو ودلمان باشتر بپارێزین و بەرەو پێشەوەی ببەین و هەرگیز ماف بە خۆمان نەدەین لە خەتی سوردا بپەڕنەوەو هەر هەنگاوێکی کەدژ بە خۆمان و بۆنیازی داگیرکەران بێت با حەرام بکرێتن و ئەوساکە کوردستانی خۆمان بۆ خۆمان دەبێت و ئێمەش سەربەخۆو خاوەنی خۆمان دەبین و ئەم کوردستانەڕەنگینەی خۆمان بۆ هەتا هەتایە ڕزگار دەبێت و بەرەو پێشەوەدەڕۆین ودەبین بەخاوەنی ئالاو ووەلاتێکی سـەربەخۆی کوردو کوردسـتانمان،لە ناو تەواوی جیهان دا ئێمەش دەردەکەوین و نەخشەی ڕەنگین و جوانی کوردو کوردستان لەناو هەموو ئەتلەس و ناو فەرهەنگ و قاموسەکانی ئەم جیهانە دیار دەبێت و ئالای ڕەنگاوڕەنگی سوروسپی و سەوزی خۆر نشینی کوردیش بۆ هەتا هەتایە لە بالاخانەی نەتەوە یەک گرتوەکان دەشەکێتەوەو ئێمەش دەگەین بە لوتکەی پێشکەوتن و سەرکەوتن و خۆش بەختی.

*

PDF 4 KURD



# یادیک لە رۆژگارانی ژیانی دەشتی.نەمر

با لێرانەدا ئاوڕێک لە ژیانی پڕ لە شانازی و سەربەرزی ڕابوردوو بدەینەوە و یادێک لە ڕۆژگارانی ژیانی زاناو شاعیری کورد هێژا و نیشـتمانپەروەری کورد مەلاخدری دەشتی بکەینەوە،کە بەداخەوە تا ئێستاکە زۆر بە دەگمەن و زۆر بەکەمی باس لە و گەورە مەردە کراوە و هەرباسی ناکرێتن و دەتوانم بلێم تا ڕادەیەک هەر لە بیر کراون و گەلێکی تر لە گەورە مەردانی نەمر کەمیان لە سەر دەنوسرێتن، کەسایەتییەکی وەک ماموستا مەلاخدر دەشتی کە بە ناوی ماموستا مەلاخدر دارەبەنیش ناوبانگی دەرکردووە لە ڕۆژگاران و سەردەمی ژیانی خۆی دا زۆری خزمەت بە کۆمەلی کوردەواری و خاک و نەتەوەکەی خۆی کردووە،دەشتی ئەومەلایەزاناو بلیمەتەکوردپەروەرەیە کە لە ڕۆژگاران و سەردەمی ژیانی کورت و پڕلەڕەنج و مەینەت و نەهامەتی و چەوساوەیی ژێر دەستی داگیرکەرانی کوردستانی خۆی دا وەک نیشتمانپەروەرێکی دلسۆز بە شیعر و هەستی پاکی خۆی گەلێک خزمەتی بە میللەتی کورد کردووە و هەرگیز لە ڕێگەی زانست و زانیـاری و پێ گەیاندنی ڕۆلەکانی کورد درێغی نەکردووە،هەتا توانیویەتی،بە وتارەکانی بە کوردی زمانی شیرینی خۆی لە ڕۆژانی هەینی و دا و بە نوسین و شیعرە نیشتمانیەکانی و ئامۆژگاری کردنی لە کۆڕو ناو خەلکی کوردەواری دا و بەنوسینی بەرهـەمە بە نرخەکانی بۆ گەلی کوردو بە کردنەوەی قوتابخانەی ئاینی و دەرس گوتنەوەی تەنیا ساتێکیش نەسرەوتووەو کەمتەرخەمی نەکردووە،هەر لەو ڕۆژگارانەی کە لە بێتواتە فەقی بووە دوا مادەکانی مەلایەتی خوێندووە خوتبەکانی خۆی لە ڕۆژی هەینی دا بە زمانی کوردی گوتوەو خەلکی کوردەواری دلْشاد کروەو بە وتە شیرینەکانی زمانی کوردی پەیڤیوە ، ئەو مرۆیە کوردە مەزنە هەرگیز لەخەبات و تێکۆشان دا لە پێناوی بەرەوپێشەوە چوونی گەلی کورد لە ماوەی ئەو تەمەنە کورتەی دا کۆلی نەداوەو بەوپەڕی توانایەوە هەستی پاکی کوردایەتی دەر بڕیوەو خزمەتی بە کورد و کوردستانی ئازیزی خۆی کردووە، زۆر بەسەربلندیوە خۆی بە خزمەت گوزاری ئاین و کورد وکوردستان زانیوە و دژی هەموو دوژمنان و نەیاران داوای خەبات و تێکۆشـانی لە پێناو ئازادی و ڕزگاری و سـەربەخۆیی گەلی کورد کردوەو هەستی بە هەمووکوێرەوەری ژیان و بەسەرهات و چەوساوەیی و هۆیەکانی دواکەوتنی میللەتی کوردو نیشتمانی داگیرکراوی کوردستانی ئازیزی کردووە، بۆسەرکەوتن وسەربەخۆیی و ڕزگاریی لە چنگ نەیاران و داگیرکەرانی کوردستان دا خەباتی کردووە و بۆ نەمانی گیانی دووبەرەکێ و خیانەت لەیەکتر کردن ونەهێشتنی شەڕی خۆکوژی هەمیشە هەولی داوەو دژی ناتەبایی وبوونی

PDF 4 KURD



هەستی ناپاک و دواکەوتوویی گەلی کوردلە هەموو ڕویەکەوە بووە،هەروک لە شیعرە نیشتمانیەکانی دا زۆر بە ڕاشکاوی باسی گەلی کورد و هاکارو ڕەفتارو زامە پڕ لە ژانەکان وبیرکردنەوەی هەلە و بە تالان بردنی سەروەت و سامانی کوردستان دەکاتن و داوای لابردنی نەبوونی ژیانێکی ئازادو پێشکەوتوو کیانێکی میللی و وەلاتێکی سەربەخۆی کوردەواری و چەوساوەیی و لە ژێر دەستی داگیرکەرانی بێگانەدا دەکات و زۆر بەڕاشکاوی خەبات و ڕاپەیین و تێکۆشان دژی نەیـاران و داگیرکەرانی کوردستانی بە پێویست زانیوە و داوا لە گەلی کورد کردوە کە لە بزاف و شۆڕش دژی داگیرکەران هەرگیز نەسرەون.

بەلێ هاواری دڵ و دەروونی دەشتی هێژا هەمیشە بانگی یەکگرتن و یەکتر نەکوشتن و خەبات کردن لە پێناوی کوردستانێکی ئازاد و سەربەخۆ بووە،ئەو هەردەم بە نوسینی شیعری نیشتمانی و وتارو ئامۆژگاریەکانی هەتا دوا هەناسەی ژیانی لە پێناوی یەکێتی وتەبایی و زانست و زانیاری ڕۆلەکانی گەلی کورد تێکۆشاوە و شانازی بە کوردبوونی خۆیەوە کردووە

هەروەک لە شیعرێکی دا دەلێت:

هەر کەس کە بە بەرزی وەتەنی یارانە نەنازێ
نازی نیە جــەژنی ئەوە هەر شەککەرو بادەم
قەدت عەلەمی کورد لە ســـەر گــردە بناری
بۆ نەســـڕەتی بارزانە کە دوژمن بە فەنا دەم

دەشتی هەمیشە داوای یەک بوونی ڕیزەکانی گەلی کوردو ڕاپەڕین دژی داگیرکەرانی کوردستانی کردووە،هۆی دواکەوتن و نەبوونی وەلاتێکی سەربەخۆی کوردەواری بە هۆی نەبوونی یەکێتی کوردو نەبوونی زانیاری و یەک نەگرتنی گەلی کوردو نەبوونی گیانی نیشتمانپەروەری ودلسۆزی تەواو لە لایەن زۆربەی ڕۆلەکانی کورد و دواکەوتوییان و نەزانی زانیوە،بەوپەڕی نەترسی و ئازایەتیوە داوای پەند وەرگرتن و یەکتر نەکوشتن و خیانەت لە یەک نەکردن و گیانی پاکی نیشتمانپەروەری و خەبات کردن بۆ بەرەوپێشەوە چوونی لە میللەتی کورد کردووە، شـیعری بۆ گەل و نیشتمانی خۆی نوسـیوەوتەوەو هەمیشە رزگاری کوردوکوردستانی مەبەست بووە و لە تەواوی شیعرە نیشتمانیەکانی دا باسی لێوە کردووە،کێ بێت لەو ڕۆژگارە و سەردەمانەدا لە ناوچەی دەشتی هەولیری دیرین ناوی مەلاخدری دەشتی نەبیستبێت و نەیناسێتن کە چ زاناو شاعیرێکی نیشتمانپەروەرو چەند بلیمەت و چەندە دلسۆزی خاک و نەتەوەکەی خۆی بووەو ئەویش چۆن وەک خانی هێژاو حاجی و نالی و تەواوی شاعیران و زانایانی میللەتەکەی لە بواری کوردایەتی و لە سەردەمی خۆی دا خەباتی ڕاست و ڕەوای کورد ورزگاری کوردستانی خواستوە و بۆ نەمانی نەزانین و کوێرەوەری گەلی کورد بە نوسین و بە گوفتاری شیرینی تا توانیویەتی هەولی داوەو هەرگیز درێغی

PDF 4 KURD



نەکردووە و لە دەور و ڕۆژگارانی خۆی دا هەمیشە نەسرەوتووە و لە ڕێگەی زانست و زانیاری دا بەو پەڕی دلسۆزیوە تێکۆشاوەو هەردەم پەرۆشی نەبوونی وەلاتێکی کوردەواری و سەربەخۆیی کورد و کوردستانی بووە وەک لەم هۆنراوەیەشی داباسی نەهێشتنی خۆکوژی وگیانی ناپاکی دووبەرەکێ و خەبات لە پێناوی ڕزگاری و سەربەخۆیی کوردستان پەیدا کردنی تەکنەلۆجیای تازەو زانیاری نوێ دەکاتن و دەلێت:

ئەی گەلی ئەشرافی کوردان بـۆ غەریقی زیللەتن
بۆچی وا دائیم خەریکی قووتی ملک و میللـەتن
بۆچی وا دەعیەوتەکەببور لێ ئەدەن پڕ حیـددەتن
چاکە شەرمێکەن لەعالەم سـەربەخۆ کاکن لەدەم
مەرکەزی خاکی سلێمانی خیانەت تێکی دا
خۆ بەخۆ هەرچی کە هات وقوەت و قـەولێکی دا
تاجی ئیستقلال بێ سـەر چوو چ نەفعێکی نەدا
چەققە لوولەو بابەڕۆ پشتم شـکا ڕۆژی نەدەم
کوا ڕەئیسی جافەکان و میرەکانی پشت گەلی
ئیجتماعی میر وسـوو کوانی لە گەل میر مەحمەلی
کوا هەماوەند و شکاک و بۆتەکانی گەنجـەلی
چەند کەسی تر هـەن کەئەمرۆ نانی دەرۆزە لە دەم
هەرکەسێ هـات و بەدیعی سـەنعەتی بوو ناوی دا
خاکی ئێوەی کردە پاپۆڕ و لە بەحرا تاوی دا
مەکتەبی لاسلکی دانا نەفعی بێ ئەندازی دا
تا بەکەی ئێوەش لەجەهلادا ئەدوورن پوشی سـەم
بابەگـوڕ گـوڕ تاوەکو ئێسـتاکە پیری ئێوە بوو
خانەقاوو تەکیە و ڕێبـازی شێخی ئێـوەبوو
جێگەیی مەولود و سەد ئیحسان و خێری ئێوەبوو
ئێستاش واپێ خـەنی بوون عارەب وتورک وعەجەم
چاکە فییکرێ کەن لە ئیستقبالی خۆ زوو چارەکەن
تەرکی وەحشەتکەن سیلاحی یەکدی کوژشتن پارەکەن
ڕوو لـە پەیدا کردنی ئالاتی وەک تەییارە کەن
تاوەکو دەشـتی نەبێ مەشغولی قال و قیلی خەم

بەلێ دەشتی هێژاو نەمر لە هەموو سـەردەمی ژیانی دا لە پێناوی یەکێتی و زانست و زانیاری داتێکۆشاوەو زۆر بە ڕاشکاوی دەلێت هۆی نەبوونی کوردستانێکی سەربەخۆ دوا کەوتنی گەلی کوردە لە ڕەوڕەوەی مێژووداو پێشنەکەوتنی کورد هەمووی دەگەڕێتەوە سەر نەبوونی یەکێتی و دلسۆزی

PDF 4 KURD



وخەباتی ڕاست و دروست لە پێناوی ئامانجەپیرۆزەکانی گەلی کورد دا،دەشتی هەردەم گەلێ پەرۆشی ژیانی چەوساوەیی و نەداری و داگیرکردنی کوردستان و زەوت کردنی بەر و بووم وتالان کردنی سامان و فەرهەنگی نەتەوایەتیمان لە لایەن داگیرکەرانەوە بووە، ئاوات و هیوای ناو دل و دەروونی دەشتی ڕزگاری و ئازادی وسەربەخۆیی کورد و کوردستان بووە و هەروەک لێرەدالەم شیعرە نیشتمانیەی دا دلسۆزانە و کوردپەروەرانەباسی داگیرکردن و بە خۆڕایی چوون و تالان کردنی سەروەت و سامانی کوردەواری دەکات و دەلێت:

کەرکوکی زەلیلم

زالم وەرە ئەم فیتنەیەو ئەم حالە هەتاکەی
وا چاکەکەڕومەت لەمن و ڕوو لە خودا کەی
بێ فائیدە ئەم خوێنە هەتاکەی بڕژێینم
وا چاکە کە ڕەحمێ بە دلی پڕلە جەفاکەی
قوللابەیی زولفی تۆ وەکو لەشکری کوردن
بۆ جەوری دلی عاشقە زەنجیری جەفاکەی
تالیب بە عیراقی تووە دل هەردەمە ئەمما
شێراوە لە گێژی عەرەبا زێر و قەلاکەی
دەستووری قەلابەندی قولابی بە قولابت
حوسنی هەیە بۆ میللەتی کوردم بەسراکەی
مەعلومە کە ئینگلتەرە کەوتۆتە میانا
ئالاو و خەتتی کورد و عەرەب بادە بەچاکەی
پاپۆڕی نەجاتم نیە بۆ بەحری خیانەت
سەییارە موعەتتەل بووە میزانی سەداکەی
بۆمەنفەعەتی ئەجنەبیی و لەندەنە ئیمڕۆ
مەعدەن لەعەدەن هاتووە سەر ئاب وهەواکەی
ڕووحی منە گازی دەمە ئەم گازە کەئەڕوا
کەرکوکی زەلیلم چیە ئەم زیللەتە تاکەی
بەم داغە ئەسەف دەستم و هەردەم کەلەشینم
بۆبیدعەتی لوبنانیی و هەم سەیروسەفاکەی
مەعلومە قوبایی غەزەلت دوو شتەئیمڕۆ
دەشتی وەرە وا چاترە دوو باسی تیاکەی

## دەبا بزانین دەشتی کێ یە؟

دەشتی ناوی خدر کوری ئەحمەد کوڕی عەلی کوری عەبدوللایە و لە عەشیرەتی نانەکەلیانە کە زۆربەیان لە شاری هەولێری دیرین و ناوچەی دەشتی

PDF 4 KURD



دزەییاتی نیشتەجێن و هۆزێکی ناو داری کوردەوارین و لە کوردستانی ڕۆژهەلاتیش هەن، گەلێ مرۆی زاناو هونەرمەند و نیشتمانپەروەر و پزیشکی کوردەواری دلسۆز و خەباتگێریان لێ هەلکەوتووە.

دەشتی لە سالی 1909 لە گوندی مەلاکاغە کە دەکەوێتە بناری چیای قەرەچوغی دلگیرو ڕەنگین لە ناوچەی دەشتی هەولێری دیرین لە ناو خێزانێکی کەم دەرامەت و جوتیار چاوی هەلێناوەو هاتۆتە جیهانەوە،باوکی دەشتی بە ژیانی جوتیاری و مەڕداری گوزەرانی بردۆتە سەر و تا ئەوکاتەی کە دێنە شاری هەولێرەوە بەکارو باری وەرزێری و مەڕداری و سوانکارەیی خەریک بوونە،کە نیشتەجێی شاری هەولێر دەبن ئیتر باوکی دەشتی بۆ هەمیشە تا ئەو کاتەی کە وەفات دەکاتن هەر لە هەولێری دێرین دەمێننەوە و خەریکی کاسبی و دابین کردنی ژیانی مال و منداڵەکانی دەبێت و کورە گەورەکەشی کە دەشتی یە لە بەر خوێندنی مەلایەتی دادەنێ و دەشتی خەریکی خوێندن دەبێت و هەر لە تەمەنی منداڵیوە دوای تەواو کردنی سیپارەو قورئانی پیرۆز دەچێتە ژیانی فەقێیاتی وحوجرەوە و تا تەواو کردنی خوێندنی مەلایەتی و وەرگرتنی ئیجازە لەژیانی حوجرەو مزگەوت بە فەقێیاتی دەباتە سەر.

دایکی دەشتی زۆر بە زوویی و مال ئاوایی لە جیهان دەکاتن،هەر ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی کە دەشتی لەمنداڵیوە بچێتە حوجرەو مزگەوتەوە،باوکی دەشتی ژنێکی تر دێنێ و لەو ژنەش دوو کچ و کوێکی تری بە ناوی فاتیمەو ئامینە و سالح دەبێتن.

دەشتی ژیانی فەقێیاتی لە زۆربەی حوجرەکانی ئەوسەردەمەی ناوچەی دزەییاتی و شاری هەولێری دیرین و ناوچەی خۆشناوەتی دا دەباتە سەرو لە دوای زانست و زانیاری دەگەڕێتن و هەموو کات و وەختێکی خۆی لەو ڕێگەیەدا دەباتە سەر،دەشتی هەروەک بۆ خۆی گەلێ جاران دەیگێڕایەوە کە ماوەیەکی زۆر لە حوجرەکانی ناوچەی خۆشناوەتی لە شەقلاوەو وزۆربەی ئاواییەکانی تری ئەو ناوچەیە کە حوجرەو مزگەوتی لێ بووەو بەتایبەتی لە ئاوایی بێتواتەدا ژیانی فەقێیاتی دەباتە سەر و لە گوندی بێتواتە ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە و هەمیشە دەیفەرموو کە ناوچەی خۆشناوەتی جێگەی پیاوەتی و مەردایەتی و کوردایەتیە،بە تایبەتی ئاوایی بێتواتە هەتا بلێی دانیشتوانی پاک و دلسۆز و نان دەرو مەرد و مەردانەن و بۆخزمەتی زانست و زانیاری ڕۆلەکانی گەلی کورد قەت درێغیان نەکردووە وهەمیشە لە هەموو ڕوویێکەوە هاندەرو یارمەتی دەری خوێنـدن وزانست و حوجرەو مزگەو ت و فەقێیان بووینە و هەرگیز درێغیان نەکردوەلە یارمەتی دانی هەموو ئەوانەی کە بە دوای زانست و زانیاری دەگەڕان دەستیان لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ خزمەت کردن نەگێڕاوەتەوە ، هەتا بلێی پاک و دلسۆزو بە وەفاومەردانەن،دەشتی ئاوایی بێتواتەی گەلێ لا خۆش بووەو هەمیشە گەلێک

PDF 4 KURD



یادو بیرەوەریەکانی ئاوایی بێتواتەی بۆ ئێمە دەگێڕایەوەو هەمیشە باسی دانیشتوان وخەلکی بە شەرەف و نیشتمانپەروەرو کەسایەتیەکانی ئاوایی بێتواتەی ئەو سەردەم و ڕۆژگارانەی بۆ باس دەکردین،بۆیەکەش لە شیعرێکی دوور و درێژدا لە ئاوایی دارەبەنەوە بۆ گوندی بێتواتە دەنوسێت و باسی بێتواتەو یەک یەکی ناسیارو دانیشتوانی خەلکی دێی بێتواتە دەکاتن و چاکەی ئەو خەلکە بەشەرەفەی لە یاد ناچێتەوە و زۆر بە وەفاوە باسیان دەکات و دەلێت :

یا خـودا بێتواتـە دائیم خـاکـی تۆ ئابادە بێ
کۆنە ڕێگەی باغەکانت سەرلەنوو سەیـادە بێ
خاکی گۆراجی بـەرابەرقیبـلەیی خـاس و عـەوام
جێگەیی تۆپـی تورک یـارەبـبی هەر گـولزاری بێ
سێبەری بـن زیـخ وهەم ڕێی کانەلەوکانوویی ڕیس
سەدجەبەل لوبنان بەقوربانی سیاحەتـگاهی بێ
ڕێگەیی بێخالەئەسلەن مەعدەنی عیززوشەرەف
بۆکەسێـکی ساحیبی تەبعی سەلیم و نـاوی بێ
بـانی مزگەوتی سەفیدو قـەلعەیی میر ڕەشـید
شوبهی چەرخن جێگەیی قیتانی چەرخن داوی بێ
قـۆتـەلەوهەم سـەردەراووباس وهەم کانی مەعـان
پـردەسۆنەوگۆرمزەش تاڕۆژی مەحشەرنـاوی بێ
کۆنە قەلعەو تەختی خـاوەر دائیما هاوار دەکـەن
یاخودا هەرکەس بلێ ناخۆشە هەر هـاواری بێ
پەرچەم و ئەگریجەکانـی باغ و ئەسـپیندارەکان
ڕەونـەقـی ئیمان و دینن گـول بـەدەم ئەیوانی بێ
لەوەدەمەی گول دێ بگاجاکەنەسیم ڕووی تێ دەکـا
ئیزحـامـی بولبـولان مەسـتن کە دێ عەتـراوی بێ
حۆریـیانی مـوسەویی و ســــاقیانی لەنـجـەوی
سەف دەبەستن ڕادەوەستن نەک دەمێ بێ لاوی بێ
دوتەمریرەو لەیل ومەتتـانەو وەنەوش ویـەکی دیش
ناوی نـالیم شـوبـهی وی نیـە لە ڕۆییـــن یاوی بێ
ماحەســـەل من ناتوانم سەربەسەر مەدحـی بکەم
تاوەکوو ماوم بـلا باسی سوککانانی بێ

*

دەشتی لەم هۆنراوەیەی دا باسی تەواوی خەلکی بێتواتە دەکاتن و یەک بە یەک ناویان دێنێ و ســلاوو خۆشەویستی و ڕێزیان بۆ دەنێرێت و لە هەوالیان دەپرسێت و زۆر بە وەفاوە یادی دلسـۆزی و مەردایەتی ئاوایی بێتواتە دەکاتن.

PDF 4 KURD



دەشتی لە دوای سالەها سالی خوێندن و گەڕان لە دوای دانیش و زانیاری دا کەواسـەر لە زۆربەی قوتابخانەکانی سەردەم و ڕۆژگارانی خۆی دەداتن، ئیتربۆ دوا جار لەمزگەوتی حاجی قادر لە لایەن ماموستاو زانای ئاینی هێژاو بەڕێز و نەمر مەلاحەمەدئەمین بێتواتەیی و دوا جاریش لای ماموەستای هێژاو بەڕێزماموستامەلا عەبدوللاکویی و ماموستامەلاحەمەدئەمین بێتواتەیی لە هەمان مزگەوت دا خویندنی دوا مادەکان تەواو دەکاتن و هەر لە لایەن ئەو زاناوهێژایەو بلیمەتەدا واتە ماموسـتا مەلا عەبدواللا بێتواتەیی ئیجازەی مەلایەتی لە سییەکان دا وەردەگرێتن و گەلێ جاران باسی زانایەتی و لێ هاتوویی و گەورەیی ئەو زاتە دانشمەندەی دەکرد و چەند شیعرێکیشی هەر لە ستایشی ئەو زانایە بە تورکی و کوردی و فارسی و عارەبی نوسیوە کە لە دیوانەکەدا هەیەو هەر چەند جارێ کە دەچووە شاری هەولێریش سەری لەو زاتە دەداو من گەلێ جاران لە گەل دەشـتی داچوومەتە خزمەت ئەو زاتەزانایەو کەسایەتیە مەزنە کوردە، ماموستامەلا عەبدواللە بێـتوایەتی زانایەکی بلیمەت و شارەزاو نیشتمانپەروەر بوو،گەلێکی خزمەت بەکۆمەلی کوردەواری کردووەو دانیشمەندێکی بلیمەت و شارەزا بوو .

دەشتی لە دوای ئەوەش داکە ئیجازەی مەلایەتی لە لایەن ماموستا مەلا عەبدوللەی نەمر لە مزگەوتی حاجی قادر وەردەگرێتن ، ئیتر ژن دەهێنێ و ژیانی خاوو خێزانی پێک دێنێ،خێزانی دەشتی ناوی عائیشە عەبدوللایەو لە عەشیرەتی بندیانانەو کچی بەڕێز و هێژا سۆفی عەبدوللاکاڕەسولە کە خەلکی ئاوایی دێمەکارن ،ئەو گوندەش دەکەوێتە بناری چیای هەمیشە سەربەرزی قەرەچوغ و گوندێکی خنجیلەو جوانی کوردەواریەو باوکی دەشتی و باوکی عائیشە دۆست و هەڤالی دیرین و خۆشەویستی یەکتری بووینە و ڕێزیان لە یەکتر ناوە،عائیشە ئافرەتێکی خوێندەوارو خوا ناس و ژیرە،دەشتی سەش کوڕ وسێ کچی لە عائیشە دەبێت و دوو کوڕی خوا بۆخۆیان دەباتەوە و ئێستاش چواریان ماون بە ناوی ئەحمە د و موحەممەد و کـەریم و موئمین، کچەکانیشی بە ناوی زاهیدە و ساکینە و نەعیمەن .

لە دوای ئەوەی کە ژن دێنێ لە ئاوایی دارەبەن دەبێتە مەلای ئەو گوندە، لەو گوندەدا خەریکی ژیانی مەلایەتی دەبێت و ماوەی هەڤدە سالان لەو دێیەدا لە خزمەت کردنی قوتابخانەی ئاینی دا دەبێت و دەرس دەلێتەوە و گەلێ قوتابی و مەلای دوازدە عیلم لە لایەن دەشتی پێ دەگەن وئێجازەی مەلایەتی وەردەگرن.

دەشتی لە ئاوایی دارەبەن دا تا توانیویەتی خزمەتی بە قوتابخانەی ئاینی کردووە و شەو و ڕۆژ لە پێناوی دەرس گوتنەوە و پێشخستنی ئەو قوتابخانەیەو پێ گەیاندنی قوتابیان خۆی ماندوو دەکاتن و بەوپەیی خۆشەویستی و دلسۆزیەوە دەرس دەلێتەوەو خۆی لە گەل قوتابیەکـانی ماندو دەکاتن،دەشتی ئەویندارى زانست و زانیاری بووە و شەوو ڕۆژ خەریکی خوێندنەوەو موتالای پەڕتوکەکانی

PDF 4 KURD



شەرعی و بەلاغەو مەنتیق و فەلەکیات و بەدیع و نەحو سەرف و بەیان بووەو تا بلێی شارەزاو زانا بوو لە هەموو بوارەکانی زانستی دا تەفسیری قورئانی زۆر بە یاستی و دروستی زانیوە و شێی دەکردۆتەوە، هەمیشە حەزی بەوە دەکرد کە قوتابیەکانی زیرەک و زاناو لە ڕێگەی دانش و هونەردا تێ بکۆشن وهەول بدەن،لە دوای هەڤدە سالان دا دەشتی لە گوندی دارەبەن بار دەکاتن و دەچێتە گوندی گردەچال و کەمتر لە ماوەی دوسالان دا لەو گوندە دا دەمێنتەوەو بەهۆی ئاوی ناسازگاری گردەچال کە زیان بە سەلامەتی دەشتی رادەگەیەنێ و لەوێش بار دەکاتن و دێتەوەە شاری هەولێر و لە گەڕەکی تەیراوە خانوییێک لە قوڕ دروست دەکات و بۆ ماوەیەک لەوشارە دەمێنتەوە،لە شاری هەولێریش بە پێی توانا لە سەر گۆڕەپانی لای مالەکەی خۆیەوە زۆربەی ئێوارانی هەینی و بە تایبەتی مانگی ڕەمەزانان لە دوای نوێژی بەجەماعەتی عەسران لەسەرداوای خەلکەکە لەتەیراوە کۆڕ وسیمینار پێک دەهێنێ و لەو کۆبونەوانەدا ئامۆژگاریەکانی پەیامبەرو قورئانی پیرۆزی بۆ خەلک بە زمانی شیرینی کوردی شێ دەکردەوەوەو ڕۆژلە دوای ڕۆژیش ئەو کۆڕە گەورەتر دەبوو و خەلکێکی زۆر ڕویان لەو سیمینارە دەکرد وجەماوەرێکی زیاتری لێ کۆ دەبۆوە و گوێیان لە ئامۆژگاریەکان و وتەکانی دەشتی دەگرت،دەشتی هەمیشە داوای لە خەلک دەکرد کە خواناس و یەکگرتوودلسۆزی یەکتر بن و خۆیان لە کردەوەی خراپ و نارەواکان و لەنەبوونی گیانی نیشتمانپەروەری دوور بکەنەوە و لە ڕێگەی ڕاست و بەختەوەری ژیان دا خەبات بکەن و دووربن لە ڕق و کینەو گیانی دوو بەرەکێ و هەمیشەهەول بدەن بۆ ژیانێکی بەختەوەرانەوسەر بەرزانەو لە کردەوە ناڕەواکانی دژ بە ئاین وخوا پەرستی ڕاستەقینەوە دووربن و هەرگیز خیانەت بە نیشتمانەوە نەکەن و ئاینی بە واتای بەختەوەری و پێسکەوتنی مرۆڤ زانیوە و ،هەمیشە لە باس و خواسەکانی دا چۆنیەتی ژیانی سەربەرزی و پاکی و ڕاستی و پێسکەوتنی کۆمەلایەتی بە زمانی شیرینیی کوردی بۆ خەلک شێ دەکردەوەو دژی زولم و زۆرداری و چەوساندنەوەدەدواو باسی ژیانی بەختەوەرانەی کۆمەلی هەژاری کوردەوەاری دەکرد،ئەم خەلکە زۆرەش کە دەورەی دەشتیان دەداو زۆر بە ڕێزو دلخۆشیەوە گوێیان لە ئامۆژگاریەکان و وتەکانی دەشتی رادەگرت و حەزیان بە بەردەوام بوونی ئەم کۆڕە مەزنە دەکرد،تا ئەو کاتەی کە دەشتی لە شاری هەولێریش مایەوە ئەوا بەردەوام لە سەر ئەم کارە خەرێک بوو،تا لە ئاخر و ئۆخری سالی 1955دا لە گەل دۆستی دیرینەی حاجی عەزیز خرابەدراوی (خوا عەفویان بکاتن ) ڕێک دەکەون و دەشتی دەبێ بە مەلای ئاوایی خەرابەدراو،ئەوسا لە هەولێربار دەکاتن و دەچێتە گوندی خرابەدراو و لەوێ دەبێتەمەلای ئاوایی و تائەو کاتەی کە خوا بۆخۆی دەیباتەوەو لەوێ نیشتەجێ دەبێتن،خەلکی خەرابەدراویش هەموویان موسلمان و کوردپەروەرن و بەتێکڕایی

PDF 4 KURD



دەشتیان زۆر باش دەناسی و زۆریان ڕێز لێ دەناو خۆشیان دەویست،بەتایبەتی براگەورەی گوند بەڕێزکاک حاجی جەبار کە مرۆیەکی خواپەرست و دلسۆز و مەردانەو خاک پەروەرە، هەمیشە ڕێزێکی زۆریان لە دەشتی دەناو لایان زۆرخۆشەویست بووەو هەمیشە گوێڕایەلی ئامۆژگاریەکانی بووینەو ووەک ڕابەرێکی دلسۆز و زانا هەمیشەدەیان ڕوانیە دەشـتی و باوەڕیان پێ هەبوو،ئێستاش بەڕێز حاجی جەبار گەلێ لە یادگاریەکان و قسە خۆشەکانی دەشتی و باسی هەق و ڕاستی و زانایەتی دەشتی نەمر باس دەکاتن و زۆر بە شانازیوە بیرەوەریەکانی دەشتی دەگێڕێتتەوەو هەمیشە ستایشی لێوە دەکاتن،تەوای خەلکی خەرابەدراوو ئەو ناوچەیە وەک زانایەک و پێشەوایەەکی گەورەو خۆشەویستی ئاینی دەیان ڕوانیە دەشتی و خۆشیان دەویست،دەشتی هەمیشە بە ئاواتی دیرینەو ئەوینی خۆیەوە بوو کە خوا فرسەتی بداتێ و بتوانێتن دیسان قوتابخانەی ئاینی لە ناوچەی بەڕانەتی زیندو بکاتەوەو ئەمجارەش لە گوندی خرابەدراو لە خزمەتی حوجرەو مزگەوت دا بێت وگەلێ لە فەقێ و مستەعیدەکان لە خۆی کۆبکاتەوە و دەرسیان پێ بلێت و قوتابخانەیەکی گەورەتر لە گوندی خرابەدراو دابمەزرێنێتەوەو ئیجازەی گەلێ لەو فەقێیانەی خۆی بداتن کە خوێندنیان لە لای ئەو تەواو کردووە و چاوەڕوانی وەرگرتنی ئیجازەن کە ئەمەش هیوایەکی دیرنەی دەشـتی و گەلێ لە فەقێیە کۆنەکانی بوو،بەلام داخی گرانم کە نەخۆشی دل و تەنگەنەفەسی شەپرێوی دەکاتن وبە تەواوی هێرشی بۆ دێنێ و بەو ئاواتەی خۆی ناگاتن و زۆر بە زوویی و نامرادیوە خوا بۆخۆی دەیباتەوەو بۆ هەمیشە لە دوای تەمەنێکی زۆر کورت مال ئاوایی لە نیشتمانی ئازیزی و خزم و کەس و دۆست و یارانی خۆی دەکاتن ولە مانگی ڕەجەبی سالی 1957دا بە بەهەشتی بەرین شاد دەبێتن و بۆهەمیشە چاو تێک دەنێتن و ژیانی لە دەست دەداتن،لە سەرداوای خۆی لە گۆڕستانی خەرابەدراو لە لایەن دوستی دیرینەو خۆشەویستی نەمرو هێژا شێخ مەلا سەعیدی خەرابەدراوی گەلێ بەڕێز و حورمەتەوە بە خەم و پەژارەیەکی زۆری خەلکی ئەو ناوچەوە لە مەراسـیمێکی گەورە دا بە خاک دەسپێردرێتن،دەشتی ماوەیەکی زۆر بوو لە ژێر ئازاری نەخۆشی دل دەینالاند و نەبوونی داوو دەرمانیش کارێکی زۆری دەکردە سەر ئەو نەخۆشیەی دەشتی و هەتوانی دەردی دلی نەدۆزرایەوە،هەرچەند دکتۆری دەکردن بەلام بێ سود بوو تابەو نەخۆشـیەی مال ئاوایی لەمیللەتەکەی خۆی دەکاتن و زۆر بە نامرادیوە سەر دەنێتەوەو لە باوەشی نیشتمانی ئازیز و خۆشەویستی خۆی بۆ هەمیشە دەمێنتەوە و بەبەهەشتی بەرین شاد دەبێتن و ناوی بەرزیشی هەر زیندوو دەمینێت و وەک ئەستێرە گەش و پڕشنگدارەکانی ئاسمانی بلنـدی کوردەواری هەر گەشەدارەو نامرێت و لە ناو دل و دەروونی خەلکی کوردەواری زیندوو دەمێنتەوە، هەرگیزنامرن ئەوانەی کەوا لە ڕێگەی خـزمەت بە گەل و

PDF 4 KURD



وەلاتیان هەمیشه له بزاف و تێكۆشـان و خەبات دا نەاسـرەوتوون و له ڕێگەی بەختەوەری وسەربەرزی نەتەوەكەیان دابه خامه ڕەنگینەكان و پەیڤ و نوسینەكانیان تا دوا هەناسەی ژیانیان هەرگیز كەم تەرخەمیان نەكردوە،ئەومرۆیە مەزنانەو سەروەرانه هەرگیز له یاد ناچنەوە و قەت نامرن.

دەشتی مرۆیەكی زاناو بلیمەت وخواناس وشاعیرێكی نیشتمانپەروەرو دلسۆزی خاك و نەتەوەكەی خۆی بوو و شیعره نیشتمانیەكانی و قوتابخانەی ئاینی دەشتی هەمویان نمونه و بەلگەی ئەوەن كەوا دەشتی چەند به تەنگ نیشتمانی ڕەنگینی خۆی و میللەتی كوردی چەوساوەو دوور له ژیانی ئازادی و سەربەخۆیی بووە،هەستی پاك و خزمەتگوزاری به زانست و زانیاری وبیرو باوەڕی پاك و ڕاستەقینەی به خاك و نەتەوەكەی نیشانەی سەربەرزی و سەرفیرازین، شیعره نیشتمانیەكانی ئەو زاته مەزنه بەلگەی هەموو ئەم ڕاستیانەن، داخەكەم كەوا زۆر به زوویی وەفـات دەكاتن و له ژیان نامینێت و تەمەنێكی زۆركورت دەباته سەر و تەنیا چل و هەشت سال ژیاوە.

بەرهەمەكانی دەشتی بریتین لەم دیوانەشیعرەی كەوا له بەر دەستانەو به زمانی كوردی و عارەبی و فارسی و توركی شیعری هۆنیتەوە،دیاره كەوا ئەو هەر سێ زمانانەی له پال زمانه شیرینەكەی خۆی دا زۆر به باشی زانیوە و قسەو نوسینی پێ كردوون،مەولود نامەیەكی به زمانی كوردی و له سەر وەزنی شـیعر هۆنیتەوە كه بریتیه له (422) بەیته شیعرو باسی له دایك بوونی پەیامبەرو خێرو چاكەی مەولود كردن و گێڕانی جەژن بەو بۆنەوەدەكاتن،ئەومەولود نامەیەش چاپ كراوەو ئێستاش له زۆر كۆری ئاهەنگی له دایك بوونی پەیامبەردا له ناوچەی هەولێر به ئاوازێكی شادو پڕ له خۆشی دەخوێندرێتەوەو باوە، ئیستعاره له زانستی بەیان كەوا (144) دێره شیعره به زمانی عارەبی وله سەر وەزنی ئەلفیەی ئیبن مالیكه،كەبه داخەوەتا ئێستا چاپ نەكراوەو هەر به دەست خەتی ماوەتەوە،ئەم ئیستیعارەیەش ماموەستای بەڕێز و زانا مەلا قادر بەحركەیی شەرعێكی زۆرپوخت وله بارو ڕێك و پێكی له سـەر نوسیوەو زۆر به جوانی شێی كردۆتەوەوە و زۆری خۆ پێوه ماندو كردوه ئەویش دای بەمن بۆئەوەی به چاپی بگەیەنم له جەنابی ماموستامەلاقادرم وەرگرت،بەلام بەداخەوە كەوا لەسەیتەڕەی توركەكان زۆر به نامەردانەله گەل كۆمەله كتێبیكی تر كەجەنتایەكی پڕ بوو لێیان گرتین و لێیان سەندین و هەرچەند ئەولا ئەولاشم كرد نەیان دامەوە و فەوتاندیان،كه كارێكی زۆر نامرۆڤانەبوو.

باوەڕ نامەیەكی كوردی كه ئەویش هەر بەكوردیەو له سەر وەزنی شیعری نوسراوەو (125)دێره هۆنراوەیەو،وەك له دوای باوەڕ نامەكه نوسیویەتی ودەلێت :له سەر داوای هێژا (شـێخ كەمال ودینی نەقشبەندی ئەم باوەڕ نامەیەم داناوەو نوسیومه.) مەبەست له شێخ كەمال الدین شێخ مستەفا نەقشبەندیه كه زاتێكی

PDF 4 KURD



مەزن و گەورە بوو دۆستێکی نەزیکی دەشتی بوو،من لە یادمە گەلێ جاران دەچوینە خزمەت ئەو زاتەوە و زۆر جارانیش لە حوجرەکەی ئەو بەڕێزە کە لە کۆشکێکی دوتەبەقەیی بوو لە پشت تەکیەکەوە لە مالەکەی خودی شێخ مستەفای نەمرەوەدا دەشتی دەعوەت دەکراو لەوێ نانی نیوەڕۆمان لە خزمەت شێخ دەخوارد،شێخ مستەفا زاتێکی گەورە و بەڕێز و زانایەکی بلیمەت بوو دەشتی زۆر خۆش دەویست خوا عەفویان بکاتن و دەشتی گەلێک ڕێزی لەو زاتەوە دەنا و من گەلێ جاران لە خزمەتیا چومەتە مال و تەکیەکەیان و بە خزمەت سێخ دەگەیشتم لە گەل باوکم..

دەشتی مرۆیەکی خوا پەرست و بلیمەت و زانا و دلسۆزی گەل و نیشتمانی خۆی بووەو لەو ماوەیە کورتەی تەمەنی دا گەلێک خزمەتی بە زانست و زانیاری کردووە،لە ڕێگەی پێشکەوتن وبەختەوەری کۆمەلایەتی تا توانیویەتی تێکۆشاوە،دەشتی هەمیشە حەزی لە ڕزگاری و ئازادی و ژیانی سەربەخۆیی و پێشکەوتنی کورد وکوردستان بووەو هەردەم دژی چەوساوەیی و زۆرداری و داگیرکەرانی کوردستان و ڕژێمە سەر بەداگیرکەرەکانی کوردستان بووە،گەلێ شـیعری لەو بارەوە هۆنیتەوە، زۆربەی خوتبەکانی دەشتی لە ڕۆژانی هەینی دا بە زمانی شیرینی کوردی بووەو باسی ژیـانی کۆمەلایەتی و ڕوداوەکانی سەردەم و چۆنیەتی ژیانی بەختەوەرانەو پێشکەوتن لە هەموو بوارێکەوە بووە و شێی کردۆتەوەو داوای لە خەلک و جەماوەر کردووە کە هەمیشە بۆ سەربەرزی و سەرفیرازی هەول بدەن و تێ بکۆشن، دەشتی هەمیشە دژی زۆرداران و چەوساندنەوەو نەبوونی ئازادی و ڕزگاری میللەتی کورد بووە.

لە سالی 1945دا کە من هاتۆمەتە جیهانەوە دەشتی مەلای ئاوایی دارەبەن بوو،ئەو سەردەمانەی کە وەبیرمە، گەلێ یادگاری و بیرەوەریە تال و شیرینەکانم دێتەوە یاد و لێرەدا هەندێ لەو یادگاری و بیرەوەریانەباس دەکەین و گیانی دەشتی نەمرو هێژا پێ شاد دەکەین.

دەشتی کە لە گوندی دارەبەن بوو،تەواوی خەلکی دێی دارەبەن خۆشیان دەویست و ڕێزیان لێ دەنا،ئاخر ئەو مەلایەکی دلسۆز و پاک و زانا و مەلایەکی باش و بە تواناو دلسۆزی خەلکی ئاوایی بووو خەلکی دارەبەن و ئەو ناوچەیە بە پێشەوای ئاینی و دلسۆزی خویانیان دەزانی،لە ناو کۆمەلی کوردەواریش دا بە تایبەتی لەو ڕۆژگارانەدا زانایانی ئاینی ئەوانەی کە دل و دەرونـیان لە گەل خەلکی هەژارو چەوساوەو جوتیاران دابوو حەزیان بە سەرکەوتن و ژیانێکی شادو بەختەوەرانەی خەلکی کوردەواری و پێشکەوتن دەکـرد،ئەوانە لە لایەن جەماوەرەوە خۆشەویست و ڕێزدار بوون،خۆ ئەو سەردەمانەش کۆمەلی کوردەواری هەموو پرس و ڕایەکیان لە هەموو ڕویەکەوە هەربە مەلای باوەڕ پێ کراوی ئاوایی بوو،تەواوی خەلک مەلای زنایان بە گەورە و ڕابەرو باوەڕ پێ کراوی خۆیان دا دەنا،

PDF 4 KURD



پرس و ڕایان بە مەلای گوند دەکرد،وەک پێشەوایەکی ئاینی تەماشایان دەکرد و ڕێزێکی تایبەتیان بەرامبەر بە مەلای گونددا هەبوو،تەواوی دانیشتوانی دێ بە گەورەو بچوکەوە باوەڕیان بە مەلا و قسەکانی مەلا دەکردو،گوێ ڕایەلی هەموو پەند و ئامۆژگارییەکانی دەبوون وگەلێکیان خـزمەت بە مەلای خۆیان دەکرد و داواو ویستی مەلایان لە بارەی ژیان و گوزەرانەوە بە جێ دەهێنا، خۆ ئەگەر مەلا وەک پێویست لە خزمەتی ئاوایی بوایەو لە بواری کۆمەلایەتی و پەروەردەی ئاینی و نیشتمانی وپێش بردن و خزمەت کردنی بەخەلک لە هەموو ڕویەکەوە درێغی نەکردبایەو بیتوانی بایە کە لە ناو خەلکی وەرزێر و جوتیارانی کوردەواری دا جێگەی خۆی بە تەواوی بکردابایەوە و ڕێزی لە خەلکی گوندەکەی گرتبـایە،ئەوەگەلێ بە ئاسـودەیی و سەربلندی لە ناو جەماوەری خەلکی کورددا دەژیا،دەشتی حەزی بە ژیانێکی بەختەوارەنەو سەربەرزانە بۆ تەواوی جەماوەری کوردەواری دەکردو پەرۆشی دواکەوتن ونەزانی گەلی کوردان بوو،ڕقی لە هەستی دوبەرەکی وکەسانی بێ بیرو باوە بوو،مرۆیەکی تا بلێی هەق و ڕاست و دروست و خوا پەرست بوو،زۆری ڕق لەخراپە و زۆرداری کردن و چەوساندنەوە و خۆ داسەپاندن بە سەر خەلکی هەژارو جوتیارانەوە بوو،هەمیشە لایەنگری سەپان و پالە و وەرزێرانی ئاوایی بوو دژی هەموو ئەوانە بوو کە هەستی زۆرداریان لە ناو مێشک و دەروون دا دەجولاو خەلکیان دەچەوسـاندەوە،دەشتی ، هەمیشە بەرامبەر بە زولم وزۆردای ڕادەوەستاو دژایەتی هەموو ئەوانەی دەکرد کە ئازاری هەژاران و بێ دەرەتانانیان دەداوگەلێ مەردو مەردانەبوو،دلێکی نەرم و گەورەشی بەرامبەر بەڕۆلە چەوساوە و نەدارانی میللەتەکەی خۆیەوە هەبوو،لە سەر کاری ناڕاست لە هیچ کەسێکی قەبول نەدەکرد و زۆریشی ڕێز لە هەژاران و پیاو چاکان و نیشتمان پەروەران دەنا و،ماوەی هەڤدە سالی ڕەبەق لە ئاوایی دارەبەن لە ڕێگەی خزمەت بە قوتابخانەی ئاینی وپێ گەیاندنی ڕۆلەکانی نەتەوەکەی بەوپەڕی سەربەرزی و دلسۆزیوەمەلایەتی کردووەوخەریکی تەدریسی زانستەکانی دینی بووە،دەشتی شارەزایی تەواوی لە هەموو بوارەکانی زانستی نەحو و سەرف و بەلاغە و مەنتیق و بەیان و بەدیع و فەلەکیات و ڕیازیات و شەرع و فیقەی ئیسلامی دا هەبـووەو مەلایەکی دوازدەعیلم و شـارەزابوو، زۆریشی حەز بە پێشکەوتن وسەرکەوتن و یەکتر گرتنی گـەلی کورد دەکردو هیچ باکێکی لە داگیرکەران و نەیارنی کورد و کوردستانەوە نەبوو،هەردەم شانازی بە کوردبوونی خۆیەوە کردووە وباوەڕی وا بوو کە هۆی دوا کەوتن و نەبوونی وەلاتێکیی کوردەواری هۆی نەزانین ویەکتر نەگرتن و دوو بەرەکێ وهاوکاری کردنی دوژمنانی کوردو کوردستانە کەواسەروەت و سامانی نەتەوایەتیمان تالان دەکەن و کوردیش بێ دەرەتان و دوور لە هەموو مافێکی ژیانە، هەروەک دەبینین لەوسەردەم وکاتانەدا ئەم شیعرەی نوسیوەو

PDF 4 KURD



دەڵێت: من کوردم وهەموو هەست و بیرو باوەڕێکیشم هەرکوردایەتیەو شانازی بە کورد بوونی خۆیەوە دەکاتن و دەفەرموێت:

خۆم کوردم و ساقیم کوردمەستی مەیی کوردانم
بۆ مەجلسی یەکڕەنگی گۆیەندەیی کـوردانم
زوهەستن وهەولێدەن ڕۆژ کۆشش وشـەو لێدەن
موسیقەیی کوردستان بۆ گـەورەیی کـوردانم
ڕەشمالی یەشـی کـوردان شیرو چەکی تێدایە
بۆ بەستنی شیرو چەک نەوڕەسـتەیی کوردانم
ئەی قەومی جەفـاکارم ئـەی میللەتی بێزارم
تاکەی لـە سـەفادابێ دوژمن پەیی کـوردانم

دەشتی گەلێ جاران بە هۆی گیانی نیشتمانپەروەری لە لایەن ڕژێمی کۆنەپەرسـتی ئیراقیەوە توشی بە بەلاو گێچەل بووە،ئەمەش بە هۆی ئەوەی کەگیانی پاکی کوردایەتی و نیشتمانپەروەری ڕاستەقینە لە دەروونی دەشتی دا هەمیشە بەرزبووەو گەلی شیعری نیشتمان پەروەری دژی داگیرکەران هۆنیتەوە،لەبەرئەوەش کە لە خوتبەکانیشی دا باسی زۆرداری وچەوساندنەوەی گەلی کوردی کردووە بۆیەکە گەلێ جـاران هەولی گرتن و ئێهانە کردنی لە لایەن دوژمنانی داگیرکەری کوردستانەوە دراوە لە یادمە زۆر جاران دەهاتن بۆ گرتنی دەشتی بەلام خۆی نەدەدایە بە دەستەوەو دارەبەنی بە جێ دەهێشت و بۆ ماوەیەک خۆی دەشاردەوە.

ئاوایی دارەبەن گوندێکی خنجیلانەو جوانی کوردەواریەو یەکێکە لە ئاواییەکانی دەشتی بەڕانەتی، دەکەوێتە سەرووی ڕۆژئاوای شاری هەولێری دیرینەوەو نزیکەی 15 کیلومەترێک لە شاری جوانی هەولێرەوە دوورە،لە نیوان ئاواییەکانی (خەرابەدراو- سەیدان و-بەرحوشترو- گردەچال و ئاشۆکان و -گەزنەو- قەرانچۆغان )دایە نەزیکەی شەست هەفتا مالێک دەبێت و هەموو خەلکی ئەو دێیە بە جوتیاری و مەرداریوە خەریکن، ئاوایی دارەبەن گوندیکی تا بلێی دلگیروجوان و خنجیلانەیە،بۆ کشت وکال زەوی و زارێکی بە پیت و فەری هەیە،خەلکی ئەو دێیە هەمووی کوردن و مرۆی دلسۆز و بەوەفا و نیشتمانپەروەرن،بە ژیانی جوتیاری و مەرداری دەبەنەسەر،ئاغای ئەم ئاواییە ناوی زوێراغابوو کەزۆر بەکەمی لە گوندی دارەبەن دا دەمایەوە و ئەو لە شاری هەولێر دەژیا،کوڕەکەی کە ناوی سواراغابوو لەو رۆژگارانەدا زۆرجاران دەهاتە دارەبەن و لە مالەکەی خۆی کە سەرایەکی گەورە بوو نیشتەجێ دەبوو، هەموو زەوی و زارەکانی دارەبەن لە لایەن جوتیارانەوە بەرێوە دەبردراو دەچێندرا، لەو کاتانەدا سواراغا سەرکارێکی هەبوو ناوی مەلا ئەحمەد کوردە بوو ، کە ئەویش دۆستێکی دەشتی بوو،پیاوێکی باش و بێ زەڕ و دلسۆزی خەلکی ئاوایی بوو،مەلا ئەحمەد

PDF 4 KURD



کوردە سەرپەرشتی کارو بارەکانی سواراغای لە ئاوایی دارەبەن دەکردو مرۆیەکی قسـەخۆش و زیرەک و دۆستێکی نەزیکی دەشـتی بوو،هەروەهاگەلێک مرۆی دلسۆزو بە وەفاو نیشتمانپەروەری تر لە ئاوایی دارەبەن دەژیان،کەسانی وەک مام عەولاو مام سمایل چاوشین و و مام مەجید بالەکی ومام شێنۆو و سەید قادرو گەلێکی تر کە ئەمانە هەموویان مرۆی ڕێزدارو خوا ناس و بە شەخسیەتی ئاوایی بوون و دۆستی نەزیکی دەشتی بوون.

لەو سەردەم و ڕۆژگارانە لە دێی دارەبەن دا حوجرە و مزگەوتێکی زۆر ئاوەدان و ڕێک و پێک هەبوو، هەمیشە بیست تا سی مستەعیدو فەقێ لەو حوجـرەیەدا لە لای دەشتی دەرسیان دەخوێند، لە زۆربەی ناوچەکانی خۆشناوەتی و دەشتی کۆیەو تەواوی دەشتی دزەییاتی و ناوچەی کەرکوکیش گەلێ لە قوتابیەکانی کە لە دوای زانست و زانین دەگەڕان دەهاتن لە ئاوایی دارەبەن دەمانەوە و دادەمەزران و لە لای دەشتی دەرسیان دەخوێند،لە یادمە لەوەرزی بەهاران دا سەر لە بەیانی زوو کە خۆرەتاو تیسکی زێڕینی بە سـەر ئاوایی دارەبەن دادەهێنا،وەرزێرو جوتیارو پالەو سەپانان خەریکی کارو کاسبی خۆیان دەبوون و دەشتیش لە بەر تاوی ژیان بەخش و گەرمی خۆرەتاو دا لە نزیک حوجرەکەی فەقێیان کەلە مزگەوتەکەی دارەبەنەوە زۆر دوور نەبوو خەریکی دەرس گووتنەوە دەبوو و فەقێیە مستەعیددەکان لە دەورو بەری دەشتی کۆ دەبوونەوە و دەشتیش دەرسەکانی خۆیانیان بۆ شێ دەکردەوە و هەندێکیشیان (سەماعیان)دەکرد واتەگوێیان ڕادەگرت ،خۆ ئەگەر تاویش گەرمی دا دەهێنا ئەوا لەبەر سیبەری مزگەوت یان لە مزگەوتەکە کۆڕی دەرس گوتنەوە پێک دەهات و بەوپەڕی خۆشـەویستی و زاناییەوە دەشتی دەرسی فەقێکانی خۆی دەگوتەوە و وانەکانی بۆ شێ دەکردنەوە،ئەمە هەموو ڕۆژێک بەم شێوەیە سەر لە بەیانی تاوەکو نوێژی نیوەڕۆ درێژەی دەکێشاو دەشتی زۆر بە دلسـۆزی و حەزو سـەرکەوتنەوە خۆی لە گەل فەقێکان ماندوو دەکرد ،زۆر جاران دەرس گوتنەوە درێژەی دەکێشاو تا نیوەڕۆ تەواو نەدەبوون ئەوساله دوای نیورۆش کە بەرەبەری عەسران دا دەهات ئەوەی کە دەمایەوە تەواویان دەکرد و زۆر جـاران تا بەرەبەری ئێوارانی دەخایاند،ئەمە هەموو ڕۆژێک بەوشـێوەیە دەشتی خەریکی دەرس گوتنەوە دەبوو،جگە لە ڕۆژانی سێ شەم و هەینی،دەشتی گەلێکی حەز لە خوێندنەوە و موتالا کردن بوو،زۆر جاران شەوانەش تا بەرەبەری بەیانی لە حوجرەکەی خۆی دا لە مالەوە لە بەر ڕۆناکی فانوسەکەی خەریکی موتالا کردن و حوێندنەوە دەبوو،ئاوایی دارەبەنیش لەو سەردەمانەدا نەزیکەی شەست هەفتا مالێک دەبوون ،کە زۆربەیان بە ژیانی مەڕداری و وەرزێری خەریک بوون و ژیان و گوزەرانیان بە جوتیاری دەبردە ڕێوە،ئەوفەقی و مسـتەعیددانەی کە لە ئاوایی دارەبەن لە لایەن دەشتی وە دەیان خوێند هەمیشـە ژمارەیان لەبیست وپیج کەس کەمتر نەبوو، ئەمەش بە هۆی

PDF 4 KURD



کەمی و نەبوونی خۆراک و ڕادبەی فەقێیان بووکە تەنیا ئەوندە لە توانای ئاواییدا هەبوو کە ژیانی ئەو فەقێیانە مسۆگەر بکاتن، ئەگیناقوتابخانەی ئاینی دەشتی لەگوندی دارەبەن گەلێ گەورەتر دەبوو وهەمیشە لە زیاد بوون دادەبوو،ئەو دەورو ڕۆژگارانە خوێندەواری لە زۆربەی ناوچەی هەولێردا بە تایبەتی ئاواییەکان تەنیا لە ڕێگەی ماموەستایانی ئاینی و حوجرەو مزگەوتەوە بوو،زۆربەی گوندەکان ئەوانەی کە مەلای باشی لێ بوو فەقێیان ڕا دەگرت و حوجـرەو مزگەوتەکان لە سوختەو مستەعیدەکان مۆنجەیان دەهات،خۆ لەو ڕۆژگارانەدا دیهاتەکانی کوردەواری جگە لە قوتابخانەی ئاینی هیچ قوتابخانەیەکی تری وەک ئێسـتای لێ نەبوو تەنیا سەرچاوەی خوێندن حوجرەو مزگەوت بوو،بۆیەکەش کە خەلکی بە شەڕەفی کوردەواری هەموو ئامادەییەکی خۆیان نیشان دەداو نانی سێ ژەمەی ئەو هەموو لاوانەیان ئامادە دەکردو شانازیان بەوە دەکرد کە ڕادبەی فەقێیـان دەدەن، لە پێناوی خزمەت بە کەلتورو خوێندەواری و پێ گەیشتنی مەلاکان تەواوی خەلکی کورد ئەمەی بە پێویستێکی سەرشانی خۆیان دەزانی و هەموو خەلکی کورد خۆی بە سەربلند دەزانی کە ژیان و گوزەرانی فەقێکان بدات و بە پێی توانای خواردن دابین بکاتن و ڕۆلە دلسۆزەکانیان خوێندەوار و زانا بن،لە حوجرەکان سوختەو مستەعد دەرسیان دەخوێند، سوختە ئەو چینە بوون کە تازە دەستیان بە خوێندنی سەرەتایی دەکردو ببونە فەقێ و دەرسیان لای مستەعیدەکان دەخوێند،هەمیشەی مستەعدی زیرەک و بە توانا سێ چوار سوختەی هەبوون و دەرسی پێ دەگوتن ،چینی مستەعیددیش ئەوانەبوون کە کتێبەکانی دوا مادەکانیان دەخوێند واتە لە پەڕتوکی جامی بە سەرەوە و دەرسیان لە لای ماموسـتای ئاوایی دەخوێند، سوختە لە حوجرە دا هەموو کارو باری چا لێنان و ڕادبەو خاوێن کردنەوەیان لە ئەستۆ بوو،کەئەو کارو بارانەش هەمووی بە نۆبەت دابەش دەکراو بە شێوەیەکی زۆر دیموکراتیانەو ڕێزدارانە ئەنجام دەدران و هیچ گیرو گرفتێک لە دابەش کردنی کارو بارەکان نەبوو،ئەگەر بیان ویستبایەکارو بارەکانیان یان بەشی خواردن یان هەر شتێکی تر کـە دابەشی دوو بەش کرابایە ئەوا نەفەرەکانیش دەبوون بە دوو بەش،ئەوسا دووکەس هەریەک لە بەشێکەوە دەیان لێ دەکرد،دەلێ کردنەکەش ئەوە بوو یەکێک دەیگوت دە لە من،واتە ژمارەی دە لە منەوە دەست پێ دەکات ،یان دەیگوت دە لەتۆ واتە ژمارەی دە لە تۆوە دەسـت پێ دەکات و دەژمێردرێت ،ئەوسا هەر یەک لەو دوو کەسەبە ویستی خۆیان چەند پەنجەیان لە ڕووی یەکترەوە دیاردەکردو هێـمایان بۆ یەکتر دەکرد و هەریەک لەو دوو کەسە چەندیان پەنجەیەکیان نیشان دەدا،هەرچەند پەنجە نیشان بدرابایە ئەوا لە ژمارەی دەوە ڕا دەژمێردرا،بۆ وێنە ئەگەر چوار پەنجە بایە بە هی هەردولا واتە هەر یەکە دوو پەنجەی بۆ ئەویتر درێژ کردبایە ئەوا ژمارەکە دەبووە بە چواردە،واتە لەوەی کە دەی لێ بوو دەژمێردارا ئەوساکە چواردەمین لە کامەیان بکەوتابایەوە

PDF 4 KURD



ئەوا دەبوو بە یەکەم واتە ئەوان پێیان دەگوت مەلا، یەکەمیش کێ بایە ئەواسەرپشک دەبوو لە هەلبژاردنی بەش یان کاردا،دووەمیش پێیان دەگوت (قرە)واتە دواکەس ، واتە کێ (قرە) بایە ئەوا دوا بەشیشی پێ دەبڕا،ئەمە شێوەیەک بوو کە هەموو لایەک پێی ڕازی بوون و بە دڵێکی زۆر فراوانەوە ئەنجام دەدراو کەس دەنگی لێوە نەدەهات ، خۆشەویستیەکی تەواو و دلسۆزانەو ڕێزێکی تایبەت لە ناو فەقێ و مەلاکان دا هەبوو سوختە پێی دەگوترا فەقێ و مستەعیدیش بە ماموستا ناوی دەبردرا،بە تایبەتی لە حوجرەوە،گەلێک ڕێزلە نێوان گەورە و بچوک داهەبوو،ژیانی فەقێیاتی و مەلایەتی لەو ڕۆژگارانەدا لە گەل ئەوەش کەم دەرامەت بوون و ژیانێکی ساکارانەیان هەبوو،بەلام تا بلێی پڕ لە شادی وخۆشییان دەبردە سەر، هەمیشە فەقێیەکان لە هەول وکۆشش دا گەلێ شەوانە تا درەنگان دەنگی ئارێ بابەیان لە ئاوایی دەنگی دەدایەوەو فەقێکان هەمیشەزۆرجارانیش مستەعیدەکان دەوریان دەکردەوە،خۆ ئەو سەردەمانە ڕۆژگارانێک بوو گیرو گرفتی ژیان ئەوەندە زۆر نەبوو هەرچەندە نەخوێندەواری گەلێ کەمتر بوو ژیان ئەوەندە بە پەناوپێچ نەبوو،تەواوی خەلک زۆر بەسادەیی دەژیان و گوزەرانیان تاڕادەیەک نەبوونی زیاتربوو،خەلک وەک ئێستاکە نەبوون ، خەلکی کوردەواری بە هەموو چین و توێژەکانیەوە زیاتر ڕێزیان لەیەکتر دەناو خۆشەویستی گەلێ لە ئێستاوە زیاتربوو،کۆڕی مەلاو فەقێکان تا بلێی پڕ لە بەزم و سەیران بوو،بە تایبەتی ڕۆژانی دوای نیوەڕۆی دوشەم و ڕۆژانی پێنجشەم کە لە نیوەڕۆ بەولاوە ئیتر دەرس نەدەبوو وکاتی پشودان دادەهات،ئەوا بەزم و سەیران و هەلپەڕکێ و شیعر خوێندنەوە و سەفرە دەستی پێ دەکرد و هەموو کەسێ حەزی بە بەشدار بوون لەکۆڕی ئەو ڕۆژانەی فەقێ و مەلاکان دا دەکرد.یادی بەخێر ماموەستا مەلا عوسمان گەزنەیی ئەو ماموستایە ڕێزدارەو دەنگ خۆشە کە شیعرەکانی دەشتی دەخوێندەوە ئاوازە پڕ لەجۆش و خرۆشەکەی ئەو ناوەی دەهەژاند و کۆڕو مەجلسی فەقێیانی تا بلێی گەرمتر دەکردو هەر حەزت دەکرد کە گوێ لەو ئاوازە دلگیرو پڕ لە شادیە بگریت،ماموەستا مەلا عوسمان فەقێیەکی دیرین و دلسۆزی دەشتی بوو،مرۆیەکی زیرەک و ڕێزدارو خۆشەویست بوو لە لای دەشتی وە،گەلێ لە شیعرەکانی دەشتی لە بەر بوون،هەمیشە بە ئاوازە شیرین و خۆشەکەی ئەم شیعرانەی دەشتی دەخوێندەوە وەک:شیعری موژدەئەی دل بارەپاهی میسرێ شادی هاتەوە،حەبیبی دلیمن بەهارێکی بوو،سەدای یاسینە یاشینە،یاسەمینی پێشەوەی سەبزە کراسی چینەوی،ئەزانی خۆ چلۆن بێزارە ژینم،بە جۆشی دل ئەگەر ئاور لە دونیا بەرنەدەم چی بکەم،شەوێ دیتم کە نوسرابوو،چ غەوغایە ئیمرۆلە باغێ گولان،گەلێ لە شیعرەکانی تری دەشتی کە ئاوازێکی تایبەتی و پڕ خرۆشیان هەیە و لە زۆربەی ناوچەی دەشتی هەولێردا لە حوجرەو مزگەوتەکان دا گەلێ لە فەقێکان ئەو شیعرانەیان لە بەر بوو و دەیان

PDF 4 KURD



خوێندەوەو،ئاوازی شادی ئەو شیعرانە لە لایەن فەقێ دەنگ خۆشەکان بە خوێندنەوە و چڕاندنیان بە ئاوازی تایبەتییانەوە کۆڕی مەجلسانیان پێ گەرمتر دەکرد و خەلک ئاوازی ئەم شیعرانەیان زۆر لا دلگیروپڕ پێ خۆش بوو،لەو ڕۆژگارانەدا شیعرەکانی دەشتی لە ناو خەلک دا باو بوو،من ئێستاش ئاوازی زۆربەی ئەو شیعرانەم لە ناو خانەی خەیال دا دەزرینگێتەوەو بۆخۆشم گەلێ جاران لە ناو فەقێیان بە ئاواز خوێندومەتەوە و هەستی پاکی کوردایەتیشیم هەر لەو شیعرە نیشتمانیەکانی دەشتی وەرگرتووە و هەستی جولاندووم.

یادگاری و بیرەوەریەکانی ئاوایی دارەبەن هەتا بلێی شیرین و خۆشی تەمەنی مندالی منن ئەو سەردەمانە،ئەو فەقێیانەی کە لە لایەن دەشتی وە دەرسیان دەخوێند ، گوندی دارەبەنیان بەڕاستی ئاوەدانتر کردبۆوە و خۆشتریان کردبوو، بە تایبەتی لە وەرزی پڕ لە سەوزایی بەهاری ڕەنگینی دەشتی پان و بەرینی هەولێری کوردەواری کە لەو وەرزە دا تا چاوت هەل دەبڕی و هەتەر دەکات فەرشی سەوزای بەهاری ڕەنگینی پڕ لە کورێک و گولی و زەنوێران دە بوو ، خاکی ڕەنگینی کوردستان کەبەرگی سەوز و نەخشینی بەهارانی ڕا دەخست و تا چاوت هەل دەبڕی ئەوا خوای جوانی وشادی و خۆشیت لە پانتایی ئەو دەشتەڕەنگینەوە وەدی دەکرد ، هەر حەزت دەکرد کە شەو و ڕۆژ لە لای حوجرەی فەقێکان و مزگەوتی دارەبەن بمابایەوە و تۆش بۆ خۆت فەقێیاتیت کردبایەو لەو جیهانە تایبەتیەی فەقێیاندا ژیانت بردبایەسەر،ئای کەدیمەنی ئاقاری دارەبەن چەندە شیرین و جوان و ڕەنگینە لەو دەمانەدا کە دەغرو دان کەروێشکە دەکاتن و قۆمەتە دەغرەکان بە شنەبای فێنک و خۆشی سروەی بەهاران شەپۆلان دەدەن ، کە بەڕاستی دیمەنێکی پڕ لە جوانی یە،من ئەو سەردەمانە بچوک بووم تەنیا لەو کاتەوە یادگاریەکانم لە یادە کە لەلایەن دەشتیەوە دەستم بە سیپارە خوێندن کرد،سیپارەش بریتیە لە ئەلف و بێتکەی عارەبی وسوڕەتی ئەلفاتیحا،یان تەنیا ئەلف و بێی عارەبی کە لە پیتی ئەلف یا تا پیتی یێ دەبوایە هەمووی لە بەر بکرێتن،لە ناو فەقێیان دا باو بوو کە هەموو پیتەکانی عارەبی کە بریتی بوون لە سیپارە ،کرابوون بە گۆرانی منیش زۆرم حەز لەو گۆرانیە دەکردو کە بۆ شایی سێ پێیی دەگوترا،ئەویش بەم شێوەیە بووو: پیتی ئەلف ئاوا بەم جۆرەیان دەگوت:ئەلفەکی ئەن وەلا ئەئەن ئەئلەموئیی ئوونە، بێ یەکی بەن وەلابەبەن بەبلەموبەیی بوونە،. تێیەکی تەن وەلاتەتەن تەتلە موتەیی توونە، سێیەکی سەن وەلا سەسەن سەسلە موسەیی سونە، جیمەکی جەن وەلا جەجەن جەجلە موجەیی جونە، حێیەکی حەن وەلا حەحەن حەحلە موحەیی حونە، خێیەکی خەن وەلا خەخەن خەخلە موخەیی خونە، دالەکی دەدن وەلادەدەن دەدلەمودەیی دوونە، زالەکی زەن وەلا زەزەن زەزلە موزەیی زوونە، ڕێیەکی ڕەن وەلا ڕەڕەن ڕەڕلە موڕەیی ڕوونە، سینەی سەن وەلا سەسەن سەسلەموسەیی سوونە،

شینەکی شەن وەلا شەشەن شەشلە موشەیی شوونە،ئیتر بەم شێوەیە هەتا پیتی یێ ی دوا پیتی سیپارە بەوجۆرە دەیان گوت و بە ئاوازی تایبەتی خۆی بۆ هەلپەڕکێ دەیان چڕاند،لە ناو فەقێکان دا ئەمە باو بوو،منیش دوای تەواو کردن و ڕەوان کردنی سیپارە هەمووم لە بەرکردبوو و ئێستاش هەر لە یادم ماوە، گەلێ جارانیش لە لایەن دایکم وخوشکی گەورەم زاهیدە کە دەرسم دەور دەکردەوە ئەوەم دەخوێندەوەو ئەوانیش یارمەتیان دەدام بۆ لە بەر کرنی، زۆر جارانیش دەرسـەکانم بە تایبەتی دەرسی قورئان ڕەوان نەدەکردن ئەوا دایکم دەیناردمەوە لای دەشتی و ئەویش هەمیشە لە سەر ڕەوان نەکردنی دەرسەکانم سزای دەدام ، سزایەکەشم چەند جار دەورکردنەوەی سیپارەو چەند جار خوێندنەوەیان بوو،جارو باریش دەبا لە گۆشەیەک دا دەمیک بە چوار چمکی ڕوو لە دیوار بکەم و ورتەم لێوە نێتن،دەشتی گەلێک هەولی لە گەل دەدام کە دەرسەکانم ڕەوان بکەم و فێریان ببم،کەدەشتی پرسیاری دەرسەکەی لێ دەکردم و زۆر جاران کە بە تەواوی ڕەوانم نەدەکردن ئەویش دەیناردمەوە لای یەکێ لە فەقێیەکان بە تایبەتی ماموستا مەلا سەید ڕدێن سۆر و ماموستا مەلا ڕەسول و ماموستامەلائیسماعیل سمایلاوەیی جەزنی کە زۆرخۆشەویست بوون لە لایەن دەشتیەوە و هەرسێکیان تا بلێی سـەنگین و گران و زانا و دلسۆز بوون دەشتی گەلێکی ڕێز لێ دەنان و ئەوانیش وەک قوتابیەکی دەشتی زۆردلسـۆزو بە وەفاو داواکاری زانست بوون وتا بلێی مەردانەو چالاک بوون منیش هەمووم خۆش دەویستن و ماموەستا مەلا سمایل هەمیشە وەک ماموەستایەکی بەڕێز و دلسۆز دەرسی پێ دەگوتم دەوری پێ دەکردمەوە و وازی لێ نەدەهێنام تابە تەواوی دەرسەکەم ڕەوان دەکردن، ئەوسا دیسان دەشتی لێی دەپرسیمەوە، لە بیرمە هەموو جارێ ئەگەر دەرسەکەم بە تەواوی ڕەوان کردبایە ئەوا شەکرۆکەیەکی ڕەنگاو ڕەنگی دەدامی و جار جاریش نەعنەعەیەکی خڕ و سپی بوو، خۆ ئەگەر دوای گەڕانەوەم لای ماموستا مەلاسمایل دەرسەکەم لە بەر نەکردبایە ئەوا دەشتی دیسان سزای دەدام، ئەویش ئەوەبوو کە دەبوایە چەند دەقیقەیەک ڕوو لە دیوار بکەم و لە سەر پێیان ڕابوەستم و جولەو ورتەش نەکەم یان لە قوڕنەیەکی حوجرەکەیەوە دەبوایە ڕوو لە دیوار بکەم و چوارچیمکە بۆی دانیشم و جولەنەکەم، تاکاتیشم تەواو دەبوو نەدەبا ورتەم لێوە بێت،گەلێ جاران لە خۆمەوە پێکەنین دەیگرتم و هەرچیەکم دەکرد ئەو پێکەنینەم بۆ ڕا نەدەوەستاو ئەگەر لە کەنین نەوەستابام ئەوا کاتەکەی ڕاوەستانم یان ڕوو لە دیوار کردنەکەم و سزایەکەم زیاتر دەبوو،پۆرە ئامینم گۆڕەکەی پڕ بێت لە ڕۆناکی یەزدانی کە خوشکە بچکۆلانەی دەشتی بوو من و تەواوی خوشک و براکانمی زۆر خۆشمان دەویست و هێشتان مێردی نەکردبوو ئەویش هەر لە گەل ئێمە دەژیاو هەمیشەزۆر دلسوزانە چاوەدێری لەبرازاکانی خۆی دەکردو ژنێکی تا بلێی ئازاو گیان قوربانی مـالە براو

PDF 4 KURD



برازاکانی بوو،ژنێکی ڕوو خۆش و هەمیشە بە پێکەنین و،شێرەژنێکی بە وەفاو پاک و گیان فیداکار بوو،ڕۆژێکیان دیتی کەوا من لەدەرەوە ڕوو بەرەو دیوار وەستاوم ،پورە ئامینم هات و زۆر بە هیواشی گوتی ئەوە بۆ دەگری ؟ منیش گوتم ناگریم پێ دەکەنم گوتی بە چی پێ دەکەنی گوتم لە خۆمەوە،من کە منال بووم گەلێ جاران ئاوا پێکەنین دەیگرتم و تا شلو کوت دەبووم پێکەنینم ڕانەدەوەستا،پور ئامینم گوتی وا دەچم بە کاکم دەلێم کە لێت ببووری،لەو کاتەدا دەشتی هاتە دەرەوە گوتی برۆ کاتت تەواو بووەو، دەبێت دەجاران دەرسەکەت بخوێنیتەوە،جارێکی تر دەرست ڕەوان نەکەی زیاترت سزا دەدەم ئەوسا کەیفی خۆتە، دەشتی حەزی دەکرد کە هەمیشە دەرسەکەم ڕەوان بکەم و زیرەک بم و لە حوجرە دەرس بخوێنم و خوێندنی مەلایەتی تەواو بکەم و جێگەی ئەو بگرمەوە،منیش کە زۆر جاران لای ماموستا مەلا ئیسماعیل دەرسـم دەخوێندەوە هەموو جارێک کەدەرسەکەم باش ڕەوان کردبایە ئافەرینی دەدامێ و دەیگوت لای ماموەستاش مەدحت دەکـەم کە ئەمڕۆ زۆرت کۆششت کردووە، ئەگەر بۆ سەیرانی گەرە سۆریش بچین ئەوا بە ماموەستا دەلێم کە ڕوخسەتت بداتن و لە گەلمان بێی،من زۆرم حەز لەسەفرەی فەقێیان دەکرد بە تایبەتی لە وەرزی بەهاری ڕەنگین دا بۆ (گەرە سوور) و (گۆمی چراغێ )،چونکە گۆمی چراغێ لە بەهاراندا پڕ دەبوولە ئاوو و گۆماوێکی قوول و خۆش بوو بۆ مەلەوانی کردن تیادا، هەردەم حەزم دەکرد کە بچینە سەر ئەو گۆماوە،من کەسیپارەو جوزئی عەممەم لە لایەن دەشتی تەواو کردو دەسـتم کرد بە خوێندنی جوزئی تەبارەکە و ئیتر زۆر جاران دەرسەکانی تری قورئانم بەبێ ماموستا دەزانی بۆ خۆم دەم خوێندەوە و حیجەم دەکرنەوە باوکم زۆریی پێ خۆش بوو کەوا بۆخۆم ئەودەرسانەی کە نەم خوێندوون و دەزانم بیان خوێنمەوە،لە تەک خویندنی قورئانی پیرۆزیشدا دەشـتی ئەحمەدیە و عەوامیلی جورجانی پێ دەگوتم و بە کوردییەکی زۆر ڕەوان و ڕێک بۆی شێ دەکردمەوەو هەمووم لە بەر کردبوو لەحیجـە کردنەوەی وشەکانی قورئانیش دا گیرو گرفتم نەما بوو، دەشتی زۆر خۆی لە گەل ماندو دەکردم و بە شێوەیەکی زۆر هاسان هەمووی فێر دەکردم،دایکێشم وەک شێرە ژنێکی خوێندەوارو ئازا هەمیشە لە دەرسی قورئان دا یارمەتی دەدام،دایکیشـم قورئانی تابلی ڕەوان و گەلێ لە سوڕەتەکانی قورئانیشی هەموو لەبەربوون،هەروەها خوشکی گەورەو ئازیز و بەڕێزم زاهیـدەخان ئەویش ئافرەتێکی تا بلێی زیرەک و خوێندەوارێکی بە توانا بوو،تەواوی قورئان و وتەکانی قودسی و باوەڕ نامەکەی دەشتی هەمووی لە بەر بوون، ئەویش هەمیشـە یارمەتی منی دەداو زۆریان چاو لە من بوو،پورە ئامین و ساکینەی خوشکیشم هەمیشە چاویان لێمان بوو و هەرگیز لێمان خافل نەدەبوون تەنیا ئەوکاتە نەبێ کە لە حوجرەی فەقێیان دەبووم.

PDF 4 KURD



لەو سەردەمانە دا هەندێ لە برا بارزانیەکان بە هۆی گیانی نیشتمانپەروەری و شۆڕش و خەبات کردن لە پێناوی ئازادی و ڕزگاریخوازی دا لە شوینی باوک و باپیران و زێدی شیرینیان لە ناوچەی بارزانەوە ئاوارە کرابوون و لە زۆربەی دێهاتەکانی کوردستان واتە دوور لە ناوچەی بارزانەوە نیشتەجێ کرابون، بە زۆرداری و بەناهەقەوە لە جێگەی باوک و باپیرانیان دژ بە ویست و حەزی ئەو ڕۆلە دلسوزانەو نیشتمانپەروەرانە ڕەتێندرا بوون، هەندێ لەو برا بارزانیە شۆڕشگێرانەش لە ئاوایی دارەبەن نیشتەجێ کرابوون،ئەوسەردەمانە بزوتنەوەی ئازادی خوازی و شۆڕشەکانی بارزان لەمێژبوو سەری هەلدابوو و دوژمنـان بە خەیالی خاویان بەو شێوەیە دەتوانن سەرکوبی بکەن،بۆیەکە بیر لەو شێوە نامرۆڤایەتیە دەکرایەوە،خەلکی خەباتگێرو دلسۆزانی کورد لە شوێنی خۆیانەوەکەناوچەی بارزان بوو ئاوارە دەکران، بێ ئاگا لەوەی کە ئەم شێوە ڕەفتارو کردەوە ناپەسەندانە گیانی کوردایەتی و دلسۆزی و خەبات و تێکۆشان لە پێناوی کوردو کوردستان دا پتەوتر دەکاتن، ئیتر خەلکی ئاوایی دارەبەنیش وەک تەواوی خەلکی کوردستان زۆریان ڕێزلەو برا بارزانیانە دەگرت و خۆشیان دەویستن،هەتا توانیان یارمەتیان دان،دەشتیش کە مەلای ئاوایی دەبێت و خەلکی ئاوایی گوێ ڕایەلی مـەلای خۆیان دەبن و لە خوتبەی ڕۆژانی هەینی و لە حوجرەو مزگەوتەوە لە ناو کۆڕ و مەجلیسانەوە یارمەتی دان و خۆشەویستی بەرامبەر بەو برا بارزانیانە بە پێویستی شــەرعی ڕا دەگەیەنێ و ئاگاداری خەلک دەکاتن کە دەبێت بە هەموو شێوەیەکەوە ڕێز لەو برا بارزانیانەبنێن، هەر لەو سەردەم وکاتانەش دا ئەم شیعرە دەنوسێت و دەلێت:

ســـــــاقی وەرە یەک بادە شەڕابت بدە مـادەم
واجیب بە مەلەک وەسلی تۆبووەسـوجدەیی ئادەم
ئەگریجەو و زولفی تۆ وەکو لـەشــــکری کوردن
یەک تاجی ویســــــــالت بـە بەریتانیـە نـادەم
سـەد مەرگە لەهەر لەحزە کە فرمێسکی دوچاوم
جاری بەوەلەندەن غەمی دڵ ســـا بەچـی لادەم
هیجرانی من و ســــــــەیتەڕە و زولمی یەقیبم
لاسیـلکیە بـۆ دەنـگی هـەلاو دەم بە هـەوا دەم
گەر خونچەیی وەســلی تۆ سحەربێتە تەبەسوم
بۆ ناوی شـــــــــــیووعی لە سواریوە پـیادەم
هەرکەس کە بە بـەرزی وەتەنی یـــارانە نەنازێ
نـازی نیە جـەژنی ئەو هەر شــــەککـەر و بادەم
قەددت عەلەمی کـوردە لە ســــــەر گـردە بنـاری
بۆ نـوســــــــرەتی بارزانـە کـە دوژمن بە فەنادەم

PDF 4 KURD



دەسـتووری دیموقراتیـە شومشیری دوو ئەبرۆت
موسـتەعمـەرە بۆیێ لە جـەفا کەوتە سـەفادەم
ئـەی بولبـولی کـوردی وەرە نێو باغی تەحەڕوڕ
نالەی تووە دەشـتی بـە هەموو دەم لە نەوادەم

بەلێ دەشتی گیانی نیشتمانپەروەی و دلسۆزی بۆ خاک و میللەتەکەی هەمیشە لەو پەڕی خۆشەویستی و سەربلندی دابووەو بۆیەکە ئاوا بە دلسۆزیەوە باسی گیانی پاکی کوردایەتی و هەستی نیشتمانپەروەری و دیموکراتیەت و ڕزگاری گەلانی چەوساوەو هاوکاری و سەرکەوتنی بزوتنەوەی ئازادی خوازی بارزان دەکاتن و دژی داگیرکەرانی کوردستان لەو ڕۆژگارانە دا ئاوا دەدوێت ،پەرۆشی ئـاوارە و دەربەدەر کردنی ئەو ڕۆلە تێکۆشەر و خەباتگێڕانەی بارزانی بە دەستی داگیرکەران دەبێتن و دلی دەسوتێتن و داوای ئازادی و ڕزگاری گەلی کورد دەکاتن.

لەوبرابارزانیانەی کە هاتبوونە گوندی دارەبەن و لە شوێنی باوک و باپیرانیان ڕەتێندرابوون، مرۆیەکیان لە گەل دا بوو ناوی مام ئەحمەدە درێژ بوو، چونکە مرۆیەکی بالا بەرز بوو بۆیەکە پێیان دەگوت مام ئەحمەدە درێژ،دەشتی زۆر ڕێزی لە هەموو ئەو بارزانیانە دەناو خۆشی دەویستن و داوای لە خەلکیش دەکرد کە هاوکاریان بکەن و ئەو مرۆیانە ئازیزی کوردن و لە ڕێگەی کوردستان دا ئاوارە کراون و لە شوێنی باوک و باپیرانیان ڕەتێندراون و هاتوونەتە ئاوایی دارەبەن و ئێرەش مال و خاکی خۆیانە ئەمە بە ویستی خۆیان نەبووە و زۆرداریان بەرامبەر کراوە،ئەو برا بارزانیانەش دەشتیان خۆش دەویست و لە گەل دەشتی دا دۆست و ئاشنابوون،دەشتی هەمیشە دەیگوت:ئەمانە ئازیزی ئێمەن و مێوانی ئێمەن،ئەمانە نیشتمانپەروەرن و کوردی دلسۆزن لە سەر خاک و نەتەوەکەیان وا دەربەدەر کراون،سا دەبێ و ئەمەبۆ هەمووکوردێک ئەرکێکی سەر شان بێت کە بە گیان و بە مال هاوکاری ئەم برایانەی خۆمان بکەین،ئەمانە بە دەستی دوژمنان ئاوارە کراون و لە سـەر مال و حـالی خۆیان بە زۆر داری دەرپەڕێندراون، دەیفـەرموو ئەم کردارەی دوژمنان بەرامبەر بەم کوردە بارزانیانە دژایەتی کردنی گەلی کوردە وکارێکی نامرۆڤانەیەو دژ بەویستی ئیسلامەتی ڕاستەقینەیەو پێویستی سەرشانی هەموو موسەلمانێکی کوردە کە ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە لە هەموو ئەوانە بروانین کە لە سەر خاک و میللەتی خۆیان ئاوارەدەکرێن و دەبێت ئەوپەڕێ هاوکاریان بکەن و دژ بە ئەم کردەوەی ڕژێم بن،من هەر لەو کاتەوە ناوی بارزانی و بارزانیانم خۆش دەویست و ڕێزم لێ دەنان، یادیان بەخێر،سالح بارزانی کەمێ لە من بەتەمەن ترو گەورەتربوو،ئەویش تازە دەستی بەخوێندن کردبوو، گەلێ جاران بەیەکەوە لە بن دیوارەکەی مزگەوتەوە لەبەر خـۆرەتاوی وەرزی بەهاری سەوزو پڕلە شادی ئەو ڕۆژگارانەدا ڕوو دەنیشتین و بە یەکەوە لە گەل هەندێکی تر لە

PDF 4 KURD



هاوتەمەنەکانی خۆمان کە ئەوانیش هەر سیپارەیان دەخوێند دەرسمان دەور دەکردەوە،من زۆر متووی ئەو کوڕە بوو بووم،سالح کە هەمیشە سەری خۆی بە موس دەتراشی و سفری دەکرد و کلاوێکی سپیشی لە سەردەنا و کراسێکی سپی و دەرپێیەکی سپیشی لە بەر دەکرد و زۆر خاوێن و باوێن بوو،منیش زۆر حەزم لە جل و بەرگی وەک سالح دەکرد و بە چل و بەرگێکی کوردی زۆر جوانم دەزانی،سالح هەتا بلێی کوڕێکی ژیرو بە فام بوو،ئەو زۆر کەمدوو بوو،تا بلێی ڕەوشت پاک و ژیر بوو جارێکیان کلاوێکی بە دیاری دا بەمن ومنیش هەمیشە ئەو کلاوەم لە سەر دەکرد،منیش گەلێ جاران کراس و دەرپێیەکی وەک سالحم لە بەردەکردن،دایکم حەزی لەوە دەکرد کە من هەمیشە کورتەک و شەروال لە بەر بکەم و جامانە لەسەربنێم،دەشتی باوکم حەزی دەکرد کەمن ڕەفاقەتی سالح بکەم و هەموو جارێک دەیگوت لە گەل خۆتا بیهێنەوە مالەوە،جار جارە من دەچوومە مالی ئەوان وئەویش جارجار دەهات بۆ مالی ئێمە،دایکم و پلکم ئامین و زاهیدەو ساکینەی خوشکم زۆریان ڕێز لێ دەنا،(تەوێ )و (میسریش )کە ئەو دوو کچە ڕوو سپیەو پڕ ئابڕووە بارزانیە بوون وخزمی سالح بوون ئەوانیش متویان بە مالی ئێمەوەگرتبوو، ببونە هەڤالی زاهیدەی خوشکم وساکینەو پورە ئامینم هەموو بەیانیان دەهاتن لە حەوشەکەی ئێمە یارمەتی پورە ئامینمیان دەدا و مەشکەیان لە گەل پورە ئامینم دەژاند و ئەوسا دۆیان دەبرد، ئەو دوو کچەش هەروەک خوشکم زاهیدەو پوورە ئامینم وا بوون ، لە دوای کارەساتە پڕ شومەکەی 1975 دا من لە ژیانی ئاوارەیی دا کە ئاوارەی ئێران و مازەندەران بووین ئەو خوشکە گەورەیەو بەڕێزەم تەوێ خانم لە ژیانی ئاوارەیی چاوم پێی کەوتەوەو دۆزیمەوە،ڕۆژێکیان کاک مەلا عومەر بارزانی شەهیدی نەمر ئەو ڕۆلە قارەمان و ماندو نەناسە کە هەڤال و دۆستێکی خۆشەویستم بوو مرۆیەکی ئازاو دلسۆز و خاکپەروەربوو،لە گونبەد کاوس لە ئێمام زادە یەحیا بە مال و مندالەوە دەعوەتی کردین و چوینە مالی شەهید مەلا عومەر لەوێندەر باس و خواس هات و ڕا بوردو باس کراو ئیتر خوشکە تەوێ هاتە بەرامبەری من و ڕونیشت و گوتی تۆ کوڕی ماموستا مەلاخدری ئەتۆ برای منی ئێمە لە گەل ئێوە یەکمال بووین،کە ئاوارەی دارەبەن کرابووین و گەلێ یادگاری و بیرەوەری بۆ گێڕامەوەو دیاریش بوو چاوەکانی پڕ بووبون لە ئەسرین و دەیگوت بە ناشکوری نەبێت بەشی ئێمەی کورد هەر ئاوارەییە و ئیتر لەو ساوە لە گەل مالی کاک مەلا عومەر بارزانی کە دۆستێکی ئازیزم بوو زیاتر بووینە یەکمال و بە گەرمی هات و چۆی یەکترمان دەکرد و یەکترمان خۆشتر دەویست،داخەم بۆ مەلا عومەر عیسا کە شەهید بوو،دوای گەڕانەوەمان لە مازەندەران و پەیوەندیمان بە شۆڕشی گولانەوەو بووینەوە پێشمەرگە کاک مەلا عومەر عیسا گیانی پاکی بەخشی بە کورد و کوردستان و لە ڕێگەی خاک و نەتەوەکەی لە شۆڕشی گولانی پیرۆزەوە شەهیدبوو

PDF 4 KURD



گۆڕەکەی پڕ بێت لە ڕۆناکی یەزدانی و هەزاران سلاوبۆ گیانی پاکی ئەو نەمرەو خۆشەویستی و ڕێزمان بۆ تەواوی مال و منداڵەکانی و خوشکی گەورەمان تەوێ خان و هەموو ئەوانەی کە ڕەنج و ئازارو کوێرەوەریان لە ڕێبازی کوردایەتی و بارزانی نەمر دا کێشاوەو بوونەتە قوربانی بۆ کورد و کوردستان.

دایکیشم کە ئافرەتێکی خوێندەوارو کابانێکی تا بلێی زیرەک و وریای مال و منداڵانی خۆی بوو دایکم کە لەبنەماڵەیەکی وەرزێرو جوتیارانی هۆزی بندیانانە هەرچەندە زۆربەی کارەکانی مالی ئێمە پووری ئازیز و دلسۆزو هەمیشە زیندووم بە سەریان ڕادەگەیشت و دایکم ڕێنمایی دەکردن وگەلێ کاریشی ئەنجام دەدا و بەلام پلکم هەمیشە حەزی بەوە دەکرد کە زۆربەی کارەکان ئەو ئەنجامیان بداتن،ئافرەتێکی تا بلێی ئازاو کارامە بوو، دایکیشم سەرپەرشتی هەمووانی دەکرد و گولی مەجلسی ژنانی ئەو سەردەمەی ئاواییش بوو،لە یادمە کەزۆر جاران داوای لە ژنانی ئاوایی دەکرد کە بێن دەرس بخوێنن و قورئان فێر ببن و خۆیان فێری خوێندەواری بکەن بەلام ئافرەتانی گوند زۆر حەزیان لە خوێندن نەدەکردو ملیان بۆ خوێندن کەچ نەدەکردو دوور دەکەوتنەوە.

زاهیدەی خوشکی گەورەشم گەلێ زیرەک و وریابوو زۆری حەز لە خوێندن و قورئان فێر بوون بوو، ئەویش لە لای دایکم و دەشتیەوە دەرسی سیپارەو قورئان و چەند کتێبێک و گەلێ لە فەرمودەکانی پەیامبەری ئیسلامی خوێندن و هەمووی لە بەر کردبوون، هەروەها باوەڕ نامەکەی باوکیشمی کە بە زمانی شیرینی کوردی لە سەر وەزنی شیعر نوسراوە ئەویشی هەمووی لە بەر بوو،زۆر جاران بانگی ئێمەی دەکرد و ئەو باوەڕ نامەیەی دەشتی بۆ دەخوێندینەوە و گەلێ لە منداڵانی تری خەلکی ئاواییش لەو کچ و کوڕانەی کە لە لای زاهیدەی خوشکم دەرسیان دەخوێند کۆ دەبوونەوە و هەموومان گۆێمان بۆباوەی نامەکەی دەشتی قوراغ دەکرد و حەزمان لە گوێ ڕاگرتنی دەکرد، موحەممەدی براشم هێشتان منداڵ بوو،ئەو لەمن بچوکتر بوو،لە ساڵی 1955دا کە ئەو کاتە لەشاری هەولێر بووین،موحەممەدی برام لە قوتابخانەی نەهزەی کوڕان دا لە پۆلی یەکەم دا قوتابی بوو،باوکم ئەم شیعرەی بە زمانی عارەبی بە تایبەتی بۆ ئەو نوسی و ئەویش کە هێشتان بچوک بوو شیعرەکەی زۆر بە جوانی لە ئاهەنگێکی ئەو قوتابخانەیەخوێندەوە و بەڕێوەبەری قوتابخانەکە و ماموستاکان زۆریان پێ خۆش بوو و ستایشیان لە موحەممەد کرد و بەو بۆنەوە دیاریەکیان دایێ کە شیعرەکەی زۆر بە جوانی و لە باری خۆێندەوە کە هۆنراوەیەکی تایبەتی و تازە بوو شیعرەکەش ئەمەبوو:

يا لتلميذ سعى في درسه يوم الدوام
قـم به للأمتحان لا تــكن مثل العوام

PDF 4 KURD



ان ّ فــی السعی جهادا جهل شیء سمنا
لیس للأنسان الا ّ ما سعی حسب المرام

حق ّ من ربــّالعلــوما حق رب العالمین
لیس فی المیدان ذا حــظ سفیه راحنام

فأغتنــم ّ انت فیـــه من شـباب کیتنــل
ماله الشیب علـــی ندم بقلب ذی سقام

لاتضیعـــوا حقّکـــم فیمـــا قـرئتم سابقا
مثل دشتی وذا نصحی لکـم منه السلام

ئەمرو خوا لێ خۆشبوو سالحی مامیشم کەبرا چکۆلانەی دەشتی بوو هەمیشە شوان بوو، ئەو مەڕ و مالاتەی کە ئەو سەردەمانە هەمان بوو ئەوبەخێوی دەکردن و سەرپەرشتی دەکردن،مامم سالح مرۆیەکی نەخوێندەوار بوو گوێ ڕایەلی دەشتی بوو، هەرگیز لە قسەکانی دەشتی دەرنەدەچوو،مرۆیەکی خواپەرست و دلسۆز و بە وەفابوو گەلێکی حەز لە مەڕداری دەکردو پسپۆرێکی زۆر شارەزا بوو لە بواری مەڕ ناسی دا،ئەگەر شوانی هەزار سەر مەڕبوایەو یەک مەڕ لە ناو مەڕەکان دیار نەبوایە ئەوا ڕاستەو خۆ دەیزانی کە فلانە مەڕ لە ناو گەللەدا نەماوە،دوو بەرانی قۆچداری گەورەمان هەبوون،هەمیشە ئەگەر بمان ویستبایە ئەوا مامم سالح هەریەک لە من و مەحەمەدی برامی سوار یەکێ لە بەرانەکان دەکرد و تا لە ئاوایی دەردەچووە دەرەوە بە سواری بەران لە گەلی دەچووین و پاشان ئێمە دەگەڕاینەوەمالەوە.

ئەو ڕۆژگارانە بۆ ئێمەی مندال تا بلێی ڕۆژگارانێکی پڕ لە شادی و خۆشی بوو،لەو سەردەمانەدا مندالان کیژ و کوڕان تا نیوەشەوان بەیەکەوە یاریمان دەکردن،وەک یاری پەلیکانێ و چاو شیلکانی و قۆرت قۆرتانێ ودونگە مەڕانێ وحێللانێ و توزەکێ و گەلێ یاری تر کەتا دونیا تاریک دادەهات ئەوە هــەر لە دەرەوە بووین و یاریمان دەکردن،پلکە ئامینم ئەو ژنە ئازایەو دلسۆزەمان کە زۆری خۆش دەویستین هەرگیز لێمان خافل نەدەبوو لە هەموو ســات و کاتێک دا چاوەدێری دەکردین هەمیشە بە دوامانەوە بوو و هیشــتان مێردی بە کاکە ڕەحمانم نەکردبوو،وەک گولێکی بۆن خۆشی هەمیشە گەشاوەی ناو مالی ئەو برایە ئازیزەی بوو،هەموو

PDF 4 KURD



کارو بارێکی مالەوەی لە گەل دایکم و خوشکەکانم و مامە سالحم ئەنجام دەداو دەشتیش ئەوانی زۆر خۆش دەویست .

مامە سالحیشم دەچووە بەر مەڕان و لە پلە ئامینەم بچکۆلە تربوو،مامە سالحم زۆری حەزی لە مەرداری دەکرد و مرۆیەکی موسلمان و خوا پەرست بوو،ئەو شومشالێکی گەلێ خۆشی لێ دەداو لە شومشال ژەنی دا هونەرمەندێکی بە توانا بوو،گەلێ داستانەکانی شیرین وبە تام و پڕ لە شادی و دلخۆشکەرەی گوێ ئاگردانانی دەزانی و زۆربەی شـەوانە دەورەمان لێ دەداو زۆرجاران شومشالی بۆ لێ دەداین و گەلێ شـــەوانیش زۆر لە داستانەکانی شیرین و پڕ لەخۆشەویستی کوردەواری بۆ دەگێڕاینەوە، ئێمەی دەبردەوە خەیالێکی قوول و یادی ڕابوردووەکان و هەر حـەزمان دەکرد کە مامە سالحم ئەم جۆرە داستانە ئەفســانەییانەمان بۆ بلێت و ئێمەش لە دەورو بەری کۆ ببینەوەوگوێی لێ ڕا بگرین و ئەویش بۆمان بگێڕێتەوە،ئای کە چەندە خۆش بوو ئەوشەوانەی کە مامە سالحم داستانەکانی سەرمەرکوند،یان مام سمایل یان سەر ئاسنی قون مشار،یان کەچەری کۆتر باز،یان ئاقل و بێ ئەقلی بۆ دەگێڕاینەوەودلمان شادو خەندان دەبوو، ئیستاش بیرەوەری و یادگاریەکانی ئەو شەوە دوور و درێژانە و پڕ لە شادی و خۆشیانەم هەر لە ناو خانەی خال دا ماوەتەوەو گەلێ جاران بەیادی ئەو ڕۆژانە لــەم غوربەت و دووری خزم و کەس و کوردستانە ئازیزکەم دا ئەسرینی حەسرەت و پەژارە هەل دەڕێژم و دەڕۆمەوە ئەو ڕۆژگارانەو سەردەمانەی ژیانی مندالی و باوکی ئازێز وخۆشەویستم ، هەرگیز ئەوکات و ئەو دەمانەم لە یادا ناچێتەوە،هەر چەندە لەو ڕۆژگارانەدا گەلی کورد چەوساوەو ژێر دەستەی داگیرکەران بوو، سەردەمی بەرخودان و ڕاپەیین بوو بەلام هەستی نیشتمانپەروەری بەم شێوەی ئێســتاکە پەرەی نەسەندبوو، تەنیا گەلێ لەکەسایەتیەکانی وەک دەشتی لەو سەردەمانەدا هەستی نیشتمانی و کوردایەتیان لە دەروون دا گڕی گرتبوو و دەجولایەوە،بەلام بۆ ئێمـەی تازە پێ گەیشتوو ومندال جیهانێکی تر بوو،من ئێستاکەش گەلێ جاران هەندی لەو داســتانانە و باسی ئەو ڕۆژگارانەم بۆ مندالەکانم دەگێڕمەوەو کاکــە عەزیزی نەوەی خۆشەویستم کوڕی نەمر لیوا موحەممەد هەموو شەوێک داوام لێ دەکاتن و دەلێت بابەگەورە (قون مشار)م بۆ بگێڕەوە،خۆ حکایەتەکانی مامە سالحم تا بلێی بە تام و خۆش بوون کە داخی گرانم لەو سەردەمانەدا نەوارێک نەبوو کە هەموویان تۆمار بکەین و ئێستا بیکەین بە کتێب و بیخەینە کتێبخانەی کوردەواری ،کە بەڕاستی ئەو داستانانە هەمووی پەند و ئامۆژگاری و بەسەرهاتی ڕابوردوەکانمان بوون و یەک لە یەک بە تام تر و خۆشترو پڕلە ماناتربوون ، داستانەکانی مام سمایل و پەریخان وسەمەرکوند و،ئەشکەوتی قارەمانان و خۆشەویستی گولەندام ومامزەکەی مالی پاشاو،درۆزن و ڕاستگۆ و کەچەری کۆتر باز و تیتل و بیبل و گەلێ لە حکایەتەکانی تری شەوچەرەی شەوانی دوورو درێژی

PDF 4 KURD



زستانانی ئێمەی مندال بوون،خۆ لەو سەردەمانە دا نە قوتابخانە هەبوو نە کتێبی کــوردی و نە ڕادیۆو نە تەلەفیزیۆن، کەبە داخەوە ئەو هەموو داستانە شیرن و پڕ لە مانایانەی ئەو کاتەم لەیاد چـوون و تەنانەت ناوی گەلێکیشیانم لە بیرنەماون،خۆ شتێکی دیارە کە گەلی کوردیش وەک تەواوی گەلانی جیهان فەرهەنگ و کەلتورێکی زۆر دەولەمەندو تێرو تەسەلی هەیە،بەلام ئەوەی کە جێگەی داخە فەوتانی گەلێ لەو داســتان وشوێنەوارانەی کەلتوری و فەرهەنگیەکانی کورداوەریە،کەواگەلێکمان لێ دزراون و بوونەتە هی میللەتانی تر،ئەوەش هەر دەگەڕێتەوە هۆی نەبوونی قەوارەیەکی میللی و کیانێکی سەربەخۆی کوردەواری،کە تا ئێستاکەگەلی کورد پێی شاد نەبووەو کوردستانێکی ئازاد و ســـەربەخۆمان کە مافێکی ڕەوای نەتەوایەتیمانە وەدی نەهاتووە، نەیارانی دڕندە و داگیرکەرانی کوردستان ئێســـتاو هەمیشە هەولی تواندنەوەو لە ناو بردنمانیان داوەو دەیدەن،زۆرجێگەی داخە کە گەلێ شـــتی بە ســـودو بە نرخمان لە فەرهەنگ و ئەدەب و کەلتوری کوردەواری دا فەوتاوەن و نەخراوەتە سەر کاغەز و نەماوە،کە ئیمڕۆ دەتتوانرا گەلێ باس و شێ کردنەوەیان لە سەر بنوسریت و فیلمیان لە سەر دروست کرابایەو کتابـخانەکانی کوردەواری پێ دەولەمەنتر کرابایە،بەلام دیسان جێگەی سەرفیرازیە کە گەلی کورد لە گەل نەبوونی وەلاتێکی سەربەخۆ و ئەم هەموو هەول و تەقەلاو دابەش کردن و وێرانی و خاپور کردنی خاکی کوردستان و ئەنفال و کیمیا باران و ئەو هەموو هـــەولی تواندنەوە و دڕندەیی نەیارانمان بۆ لە ناو بردن و داگیرکردنی خاک و دزینی فەرهەنگ و کەلتووری میللی کوردەواری دیسانەکە هەر لە فەوتان و نەمان ڕزگاریمان بووەو وەک میللەتێکی قارەمان بەرامبەر ئەو هەموو زولم و زۆر داری و چەوساندنەوەمان هەر ماوین و لە سـایەی خەباتی بێ وچان و دلسۆزانەی ڕۆلە قارەمانەکانمان لە ناو نەچووین و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش بە هـۆی گیانبازی و خەبات و تێکۆشانی ڕۆلە دلێرەکانمان بەرەو پێشـەوەتر دەڕۆین و گیانی نەتەوایەتی و کوردایەتیمان هەر بەرز تر دەبێتەوەو بەرەو قۆناغی ســـەر بەخۆیی و ڕزگاری هەمیشەیی کورد و کوردستان دەڕۆین و لەڕێگەی قارەمانان و دلسۆزان و نەمران دا ناسرەوین،لە گەل ئەو هەموو گیرو گرفت و کاری گەریەتی دوژمنانمان دا لە سەر بزوتنەوەی ڕزگاری خوازیمان وهەستی تەســـکی دوور لە کوردایەتی و خۆ کوژی وگەلێ سیفاتی خراپ و تری ڕۆلەکانی کوردو بێگانە پەرســـتی،ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش زیاتر بەرەو قوناغی هەمیشــەیی دەڕۆین و نەزیک ئامانجە پیرۆزەکانی میللی و نەتەوایەتی خۆمان دەبینەوە،کەئەمەش هەر لە گەورەیی وبیری نەتەوایەتی ڕۆلە دلسۆزو بە شەرەفەکانی میللەتی کوردی سەربەرز وخەباتگێـــڕە.

دەشتی خوشکێکی تریشی هەبوو بەناوی فاتم ، ئێمەش لە خۆشەویستییان پێمان دەگوت پلەفاتە کە ببوە خێزانی مامە جەژنیم،مامە جەژنیم خزمێکی پشتی

PDF 4 KURD



دەشتیە و لە ئاوایی تەلەلخێم جێ نشین بوو، ئەوانیش لە ئاوایی تەلەلخێم ژیانێکی کوردەواری و ساکارانەیان دەبردە سەر و چەند سەر مەڕ و ئاژەلێکیان هەبوو خەریکی گوزەران و ژیانی خۆیان بوون وگەلێ شادو دلخۆش بوون بەو ژیانەیان، من گەلێ جاران دەچوم بۆ سەردانیان و ئەوێندەرێم زۆر پێ خۆش بوو، یادی مامە جەژنیم بە خێرو گۆڕیان پڕ بێت لە ڕۆناکی خوای جوانی،مامە جـەژنیم و پلـە فاتەم هەرکات کە دەهاتنە سـەردانی ئێمە،ئەوا هەمووماں دەگەشاینەوەو دلمان پێیان شاد دەبوو،تا درەنگی شەوان لە گەل مام جێژنی و مامە سالحم دەماینەوە و گوێمان لە شومشال لێدان و داستانەکانیان ڕا دەگرت کە بەڕاستی دەریایێ بوون لە گێڕانەوەی داستانەکان و هونەری بلوێر لێ دان،مامە جەژنیم شـومشال ژەنێکی تا بلێی کارامە بوو،مامە سالحیشم هەر لە مامە جەژنیم فیری ئەو هونەرە گەورەیە بووبوو،ئای شومشالەکەی مامە جەژنیم چەندە، شادو پڕ لە ئاوازی شیرینی کوردەواری بوو کە مامە جەژنیم دەسـتی دەدایە شمشالەکەی و ئاوازە کوردیەکانی بۆ هەلدەداینێ و گەلێ لاوک و حەیرانی بە شـومشال لێ دەدا وناوە بە ناوەش شومشالەکەی دەبڕی و ئەوا باسی ئەو داستانانەی بۆ دەگێڕاینەوە کە بە شـومشال لێی داوە،شومشالەکەی بە ئاوازێکی ئەوەندە شـاد و پڕ لە جۆش و خرۆشەوە دەژەنی هەرکێ کە گوێی لەو ئاوازانە دەبوو ئەوا دەویست کە تەنانەت ساتێکیش بێ دەنگ نەبێتن، چونکە شمشالەکەی مامە جەژنیم ئاوازێکی تایبەت و ئەوەندە شـاد ودلگیری هەبوو کە زۆر جاران خەلکی ئاواییش دەهاتن و گوێیان لە شماشالی مامە جەژنیم رادەگرت،کە بەڕاستێ لە شومشال لێدان هونەرمەندێکی زۆر بە تواناوکارامەو لێ هاتوو بوو،ئەوەش هەر جێگەی داخە کە ئەو ئاوازە شیرن و پڕ لە جۆشەی مامە جەژنیم و سەدان هونەرمەندانی تری کوردەواری فەوتاون و هیچ ئاسـەوارو دەنگێکیان لێوە نەماوە،ئەمەش هەر دەگەڕێتەو سەر هۆی نەبوونی کیانێکی میللی کوردەواری و کە ئاوا گەلێ بەرهەم و نوسین و شتی بە سودمان فەوتاون و نەماون و ئێستا لێیان بێ بەشین،کە سەدان سالە ئاوا دوور لە هەموو ماف و ژیانێکی پڕ لە سەربەستی و ئازادی میللی کورداەوارین،ئێستا ئەگەر ئەوهونەرو بەرهەمەکانی کەلە پیـاوان و هونەرمەندان و وبلیمەتانی کوردەواریمان مابان وهەستی پاک و هونەر و ستران وبەرهەمەکانیان تۆمار بکرابانایە و بخرابانە سـەر ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن چ مەحشەرێک و چ بەرهەمێکی نرخدار دەکەوتە ئەرشیفی کوردەواری،بەلام داخەکم داری خۆزیا بێ بەرەو،ئەو هونەرەگەورەیەی رابوردووی کوردەواریمان زۆربەیان لە کیس ڕۆییون و یان دزراون ، لەو سەردەمانەدا کە من مندال بووم.ئای کەیاری چاو شیلکانێ و تەندوورە سوورەو قیلم قاچێ و حوحایێی کچانەو قۆرت قۆرتانێ و کەلالایانێ وحێللانی و هەدگدگەو سابوونە ڕەقەو گەلێ لە یاریەکانی تری کوردەواریمان پێ خۆش بوو،تا درەنگی شەوانە یاریمان دەکردو قەتیش لەو یاری کردنانە تێرو

PDF 4 KURD



وەڕس نابووین،چەندخۆش و پڕ لە شادی و بەزم و سەیران بوون، خۆ لەو دەمەش کەپشـودانی فەقێیان دەهات،واتە لە ڕۆژانی دوای نیوەڕۆی دوشەمان و پێنجشەمان دا،گوندی دارەبەن هەمیشە پڕ لە بەزمی شایی و شیعر خوێندنەوە و سەیران دەبوو،خۆ ئەگەر ئاوازی شیعر خوێندنەوەی فەقێیان بهاتابایە ئەوا ئەو ناوە پڕ دەبوو لە خەلکی ئاوایی و دەهاتن گوێیان لە ئاوازی شادی و خوێندنەوەی شیعرەکان دەگرت و بەرەو حوجرە و مزگەوت دەهاتن و شایی و گۆوەند گەرم دەبوو،تا درەنگی شەوان ئەوا هەر بەزم و شـــیعر خوێندنەوەو ئاوازی شادیی بوو،دەنگی خۆش و شادی مەلا عوسمان گەزنەیی و مەلا عوسمان گردجوتیاری وگەلێ لە فەقێیە دەنگ خۆشەکانی تر بە تایبەتی لە خوێندنەوەی شـیعرەکانی دەشـتی وەک (سەدای یاسینە یاشینە- موژدە ئەی دل- چە غەوغایە ئیمێۆ لە باغێ گولان- حەبیبی دلێمن بەهارێکی بوو،یاسەمینی پێشەوی، یاری عەلەمدارەکەم،یان ئیمێۆکە غەریبم من ، خۆم کوردم و ســاقیم کورد) وگەلێ لەشیعرەکــانی تری عیرفانی و خۆشەویستی کەبە ئاوازی تایبەتی خۆیان دەیان چڕی و دەنگیان دەهات بەڕاستی دلگیر و شــاد بوون ، تەواوی خەلکی ئاواییش ئەوەندەیان ڕێز لە فەقێ و مەلایان دەنا کە قەت جارێ نەبوو ئەم خەلکە لەو هەموو هەراو هۆریاو ئاوازی شایی و بەزمی فەقێیان گلەییەک بکەن و دلیان پێ نارەحەت ببێ بە پێچەوانەوە ئەم شــەوانەیان زۆر لا خۆش و پڕ لە شادی بوون،ئەوەی کەمنیش وەک بیرەوەری مندالی دێتەوە یادم وکە بەڕاســتی لە ناو خانەی خەیالی خۆشیم داجێگەی خۆیان گرتووە ئەوشــەوانەو ئەو ڕۆژگارانەن کە فەقێیەکان بەزمیان تیادا دەگێڕا،ئەو ڕۆژانەی پشودانیش کە دەچوونە دەرەوەی ئاوایی و لە بەیانی هەتا ئێوارە ئەوە بەزم بەزمی قاشـوانێ و تۆپانی و سێبازی و لە سەر گۆماو پازدان لە نزیک گەڕەسۆربوو، کەشوێنێکە لە نەزیک دارەبەن،گۆماو و کەندی ئاوی لێیە بە تایبەتی لە وەرزی بەهاران دا.

وەک دێتەوە بیرم دەشتی هەمیشە دژی چەوسینەران بوو،زۆری ڕق لە خەلکی خراپ و زۆرداران دەبۆوە ، جارێکیان توشی بە کـابرایەک دەبێت لە گەل دەشتی تێک دەگیرێن و لێک تورە دەبن ،کابرا بە دەشتی دەلێت خۆ ئەگەر مەلا نەبای واو وام دەکرد ولێم قــەبوول نەدەکردی، دەشتیش لە شێوەی ڕەفتارەی کابرا زۆر تورە دەبێت و ڕوو دەکاتە کابراو ڕاستەو خۆ مەندیلەکەی فڕێ دەداو دەلێت فەرمو جەنابی فلانی ئەوا من ئێستاکە مەلا نیم جا هەرچی نەت کردوە بیکە،وەرە بزانم چە شەکرێک دەشکێنی و چیت پێ دەکەرێت؟. ئیتر کابراش کە دەشـتی ئاوا دەبینێ و وززەی لە بەر نایێت و ڕێ دا دەگرێت و دەڕوات .

لە سالی 1952دا دەشتی ئیجازەی ماموەستا مەلا ئیســماعیلی جـەزنی کە ببوە ێ ئاوایی سمایلاوە دەداتن بۆ مەلایەتی،خەلکێکی زۆر زۆر لە ماقــولان و گەورەپیاوانی ناوچەو شاری هەولێر و کۆیەو شەقلاوەش داوەت دەکرین و دێن

PDF 4 KURD



بۆ بەشـــداری لەو ئاهەنگە مەزنەداو روو دەکەنە گوندی دارەبەن کە سێ چوار ڕەشمالی چەند هۆبەیی بۆ میوانان هـەلدرا بوو، کە چەند ڕۆژێکی خایاند،باوەڕ ناکەم هیچ ئاهـەنگێک لە کوردەواری دا لەو سەردەم و کاتانە دا ئەوەندەی ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتنی مەلایان پڕ لە شادی و سەیران و سەرکەوتوو وخۆش بووبێت ،ئەو جۆرە ئاهەنگانە گرنگیەکی زۆری پێ دەدراو ڕێزێکی زۆریشی لە لایەن خەلکی کوردەواریوە لێ دەگیراو هەموو یارمەتی و هاوکاریەکیان دەکرد،ئەو ئاهەنگەی ئەو سالەش بۆ وەرگرتنی ئیجازەی ماموستا مەلا ئیسماعیل جەزنی لە لایەن دەشتی وە هەر کەلە ئاوایی دارەبەن ئەنجام درا پڕبوو لەشادی و خۆشی وبەزم و سەیران، تا بلێی ئیجازەدانێکی سەرکەوتوو بوو ،کەسایەتیەکانی وەک شێخ مستەفا نەقشبەندی وشێخ محێدین بەرزنجی وشێخ کاکەشـێخ عەبدوالکریم و ماموەســتا مەلا عەبدوللابێتواتەیی و ماموەستامەلا سالح کۆزەپانکەیی و ماموستا ڕەشـــادە فەندی و ماموستامەلا مەعسوم کۆیی و مدیر ئەوقافی ئەوسەردەمەی شاری هەولێرو گەلێکی تر لە گەورە پیاوانی تەواوی شاری هەولێرو دەشـــتی دزەییاتی و کۆیە وشەقلاوەو مێواندای کرابوون و بەشداریان لەو ئاهەنگە مەزنەداکردوە،وەبیرمە کە سێ چوار ڕەشمالی چەند هۆبەیی هەلدرابوون،چەند ڕۆژێک ئاهەنگی ئیجازە دان بە ماموەستا مەلائیسماعیل جەزنی درێژەی کێشا و تەواوی مەسروفات و خواردەمەنی و پیویستیەکانی ئەو ئیجازەیە لە سەر خەلکی ئاوایی دارەبەن وگوندەکانی تری دەورو بەری دارەبەن و کەسایەتیە کوردەکان بووە، دەبینین کە خەلکی بە شەرەف و دلسۆز و بەوەفای کوردەواری چەند بە تەنگی زانست و زانیاری بووینەو چۆن لە خـزمەت کردن بە قوتابخانەی ئاینی دریغیان نەکردووە و هەمیشە خزمەت گوزاری حوجرەو مزگەوتی ئاواییەکان بووینە،ئەمە نیشانەی میللەتێکی پاک و خوا پەرست و مرۆ دۆستەکە بەو جۆرە ڕێزیان لە خوێنـدن و خوێندەواری ناوەو حەزیان بە پێشکەوتن و سەرکەوتنی ڕۆلەکانی خـۆیان بوو وەو تا توانراوە درێغیان لەو بارەوە نەکردووە.

ماموستا مەلا ئیسماعیل دوای وەرگرتنی ئێجازەی مەلایەتی بوو بە مەلای ئاوایی سمایلاوا کە لە گوندی دارەبەن زۆر دوور نیە،لە دوای ئەو هەموو بەزم و سەیرانەی کە لەو ئێجازەیە کراوە لەدوای چەند ڕۆژێک دەشتی نەمرو هێژا ئەم ئیجازەیەی کەبە زمانی عارەبی بە دەست خەتی خۆی دەنوسێتەوەو بە ئامادەبوونی ئەو مرۆیە مـەزنانە دەیخوێنێتەوەو دەدرێتە ماموەستا مەلا ئیسماعیل جەزنی کەوادەقی ئەو ئیجازە نامەیەپێشکەشی خوێنەرانی ئازیزی دەکەین ولەلاپەڕەکـانی دوایی دا بۆ یادو بیرەوەری ئەو سەروەرو زاناو نیشتمانپەروەرانەی کە سالەهای سال لە خزمەتی ڕۆشەنبیری وقوتابخانەی زانستی و زانیاری دا بووینە بلاوی دەکەینەوە.

PDF 4 KURD



هەزاران سلاو لە گیانی پاکی ئەو زاناو شــاعیر و نیشتمانپەروەرانەی کە تا دوا هەناسەی ژیانیان لە ڕێگەی خزمەت بە خاک و نەتەوکەیان لە هیچ سەردەم و کاتێک دا درێغیان نەکردووەو هەرگیزلە ڕێبازی پیرۆزی دانش و زانیاری دا نەسرەوتوون و هەمیشە بۆ ڕوناک کردنەوەی خاکی کوردستانی ئازیزو ڕزگاری و سەربەخۆیی میللەتەکەیان سوتاون.

شتێکی ڕوونە کە لەوســـەردەم و ڕۆژگارانەدا گیانی کوردایەتی و خەبات لە پێناوی ڕزگاری و سەربەخۆیی ئەوەندە بەرزنەبوەوەو زۆر بە دەگمەن باسی کوردایەتی و شۆڕش و ڕاپەیینی دەکرا،لەو کاتە دا کە هەستی نەتەوایەتی وکوردایەتی وەک ئیمڕۆ لە ناو تەواوی جەماوەردا دیمنێکی گوندی گردەچاڵ

هەستی پێ نەدەکرا،ئەگەر کراباش ئەوا لە ترسی ڕژێمی کۆنەپەرســتی ئێراق کەس نەدەوێرا ئاشــکرای بکاتن و دەری ببڕێتن و کوردایەتی بکاتن،خــۆ

## دیمنێکی گوندی گردەچاڵ



هەرکەسێ لەو ڕۆژگــارانەدا داوای کوردایەتی کردبایە ئەوا مۆرکی کۆمۆنیستی لە لایەن میری و بەکرێگیراوانی پێوە دەندرا ئەمەش بۆ خــۆی بەلایەکی گەورەبوو هەرکێ لەو ڕۆژگارانە دا بەو ناوە گیرابا ئەوا پێستی دەچوە دەباخانەو جگە لەوەش لە ناو خەلکی نەزانی کوردەواری دا بە کافر دادەندراو ئیتر تۆشی بە گیرو گرفت و ناخۆشی دەبوو.

ڕۆژێک کابرایەک دێتە لای دەشتی و دەلێت ماموستا خراپم لێ قەوماوە ئاغای گوند وا لە ئاوایی دەرم دەکاتن هەڕەشەشم لێ دەکاتن و پێم دەلێت ئەتۆ شــیوعی ودەبێ لێرە نەمینێ وبار بکەیت،ئەگەر نەشڕۆی ئەوا بەو ناوە بەگرتنت دەدەم ، حەز دەکەم کە بزانم شیوعی چیە وا ئاغــا زۆرم لێ دەکات و لە خۆیەوە منی کردوە بە شیوعی خوا دەزانی ئەمن تەنیا وەلاتی خۆم خۆش دەوێت و نازانم شوعیش هەر چیە،ئاغا پێم دەلێت ئەگەر زوو بار نەکەیت ئەوا بە گرتنت دەدەم و

PDF 4 KURD



شـــکایەتت لێ دەکەم خۆ ئەگەر شکایەتیشم لێ بکات هەر خوا دەزانی چیم وەسـەر دێت جانازانم چی بکەم و ئاغا دەڵێت دەبێ بە زووترین کـات لە ئاوایی باربکەیت و ناشزانم ڕوو لە کوێندەر بکەم ،ئێستاش واهاتومە لای تۆ کە چارەیەکم لێ بکەیت ئەگەر نەشڕۆم ئەوا ئاغا بەلایەکم بە سەر دێنێ زۆر سوپاسی تۆ دەکەم کە ڕێگەیەکم بۆ دابنێی چی بکەم ، من خاوەنی ماڵ و منداڵی وردم ،دەبێ بەم زستانە هەر چۆنێ بێت چارەسەریەکم لێ بکەیت، دەشتیش لەم ڕەفتارەی ئاغا زۆر نا ئارام دەبێت و بە کابرای دەڵێت هەستە هەڕۆوە ناو ماڵ وحاڵی خۆت هەرچیەکیان پێ گوتی خۆت تێک مەدەو تەنیا بڵێ من لە سەر قسەی مەلاخدر لێرە ناڕۆم ئەو بە منی گوتوە بار مەکەو من لە گەل ئاغـا باس دەکەم،دوای چەند ڕۆژێکی تر دیســان داوایان لێ کردبۆوە کە لە ئاوایی بار بکاتن ئەویش گوتبووی ماموستا مەلا خدر بە منی گوتووە جارێ مەڕۆ،تا ئەویش نەلێت من ناڕۆم،ئەوانیش دەچنــەوە لای ئاغاو پێی دەلێن ئەوسا ئاغا دەلێت وازی لێ بینن،من قســە لە گەل ماموستامەلا خدر دەکەم،دوای چەند ڕۆژێک ئاغا یەکێ دەنێرێت بۆ لای دەشتی کە بچێتە لای ئاغ،دەشتیش بە قاسیدەکە دەڵێت:بە ئاغا بڵێ من کارم بە ئاغا نیە ئەگەر ئەویش کاری بە منە با بفەرموێ بێتەمزگەوت،ئاغا زۆر بە نارحەتیەوە دێتە مزگەوت، زۆرگلەییان لە دەشتی دەکات ودەڵێت چۆن دەبێت من فلانەکەسم لە ئاوایی دەرکردووە کە لێرەر بار بکات و تۆش گێراوتەوە،دەشتییش دەڵێت:جەنابی ئاغا تۆ هــەقی گلەیی و زولم کردنت بە هیچ شێوەیەک نیە،بە چە قانوون و شەرعێک ئەم کابرایە کە خاوەن ماڵ و منداڵەو مرۆیەکی خوا ناس و بێ زەرەرە هەروا لە خوت و خۆیڕایەوە بە قسەی خراپکاران دەتەوێ لێرەی دەر بکەیت ؟ئەوەی کە پێی گوتراوەو بۆی هەلبەستراوەو بوخـتانی پێ دەکەن، ئەوە چەند ســالەئەو کابرایە لێرە دەژیت و هات و چۆی مزگەوت دەکاتن و مرۆیەکی موسـلمانەو زیانی بۆ هیچ کەسێک نیە،فەرمو با خەلکی ئاوایی بە تێکڕایی کۆ بکەینەوە بزانین کێ گلەیی لەو کابرایە هەیەو کێ لە گەل ئەوەیە کە ئەم پیاوە باشە لێرە بڕوات و دەربکرێت،ئەگەر گوناهێکی کردووە قەیدی ناکاتن،بەلام ئەو کـابرایە تا توانیویەتی خزمەتی حوجرەو مزگەوتی ئاوایی و گوندی کردووە و لە هەموو کارێکی خیر بەشدارەو تا چاکە هەبێت خراپەش ناکات و کەسێ خراپەی لەم کابرایە نەدیوە ، من لە تەواوی خەلکی ئاواییم پرسیوە هەموو شایەدی دەدەن کە ئەم کابرایە درۆ و دەلەسەی بۆ هەلبەستراوە،ئەی باشــە چ خوا قبول دەکات کە ئـاوا ئەزیەتی دەدەن و بەم زستانە ساردو سیڕە لە شوێن و جێگەی سالەهای ژیانی دەری دەکەن و ڕەنجی دەدەن،ئەمە کارێکە دژ بە ئاین و خودایەو خواش هەرگیز ئەم شێوە ڕەفتارانە دژ بە مرۆیاتی قەبول ناکاتن کەوابەم شـێوەیە زۆرداری لە خەلک بکرێتن، ئەم کابرایە کە دەردەکەیت و زۆری لێ دەکەیت بەو هەشـــت ســەر خێزانەوە ڕوو لە کوێ بکاتن نازانی کە

PDF 4 KURD



ئەمە کارێکی دژ بە خوا پەرستی و ئیسلامەتیەو خوا هەلی ناگرێتن و زولمێکی زۆر گەورەیە؟ئەی ئەگەر ئەم کابرایە لێرە باری کردو منالەکانی لە برسان و سەرمان بمرن کێ بەر پرسیارە جگە لە جەنابی تۆنەبێت؟ کەواتە بە پێی ئاین و ڕەوشتی مرۆیاتی و ئیسلامەتی هەقی ئەوەت نیە ئەم کابرایەلێرە دەر بکەیت و وێل و دەربەدەری بکەیت، دەشتی گەلێ قسەی تر لەم بابەتانەو لە گەل جەنابی ئاغا دهاکاتن و دلی ئاغا نەرم دەکاتن و ئیتر ئاغاش لە سەر ئەم قسانەی دەشتی لە بڕیارەکەی خۆی پەشیمان دەبێتەوەو واز لە کابرا دێنێت و بە دەشتی دەلێت ئەوە لە بەر خاتری تۆ دەری ناکەم و با هەر لێرە بمێنتەوە،کابراش زۆر مەمنونی دەشتی دەبێت و گەلێکی سوپاس دەکاتن. دەشتی لە دوای هەقدە سالان لە ئاوایی دارەبەن دلی لەکردەوەکانی ئاغای گوند دەشکێتن و،بۆیەکە بڕیار دەداتن لەو ئاوایە بار بکاتن و چیتر لە ئاوایی دارەبەن نەمێنتەوە،وابوو لە گوندی دارەبەن مالمان بار کرد و لە سالی 1953 چوینە ئاوایی گردە چال و لەوی نیشتە جێ بووین،گوندی گردەچالیش سەربەناوچەی گەردیایەتیەو هەر لە سەر سنوری دارەبەنەو گوندێکی خنجیلانەو دلگیرە،حەسەن ئاغا خاوەنی ئەو گوندەیە گردەچال ئاوێکی ناساز وگرانی هەیە،دەکەوێتە سەرووی شاری هەولێرەوەو ئەویش بیست کیلۆمەتریک لە شاری هەولێرەوە دوورە،کە ماوەی کەمتر لەدوسالان دەشتی لەو ئاواییەدا بە مەلایەتی مایەوەو تاتوانی لەوێش خزمەتی بە کۆمەلی کوردەواری کردوە،تەواوی خەلکی گوند و حەسەن ئاغاو مندالەکانی ئەوپەڕی ڕێزیان لە دەشتی دەناو لە قسەی دەشتی دەر ناچوون و دەشتیان خۆش دەویست،ڕۆژێکیان لە مانگی ڕەمەزان دا لەپیش ڕۆژی شکان و فتارکردنەوەدا حەسەن ئاغا بە دەشتی دەلێت( مەلا وەرە لای ئێمەلە دیوەخان فتار بکەوە،دەشتی بەم قسەی حەسەناغاو شێوەی دەر برینی بە سوکایەنی دەزانێت و ڕوو لە حەسەن ئاغادەکاتن و دەلێت حەسەن ناغا دەزانیت کەوا(مەلاژن بەم شێوەیە بانگم دەکات و پێم دەلێت مەلا !) ئیتر حەسەناغاش زۆر تورە دەبێت وبەلام بێ دەنگ دەبێت و پاش ماوەیەک بە دەشتی دەلێت : ماموستا خوا دەزانێ من هیچ مەبەستێکم نەبووە کە بەو شێوەیە ناوی جەنابتم هێناوەو تۆ ئازیزی ئێمەی و تۆ بە هەلە لە من گەیشتی و ئیتر لە گەل دەشتی پێک دێنەوە!.لە دوای ماوەیەک مانەوەی دەشتی لە ئاوایی گردەچال کە دکتۆر بە دەشتی دەلێت دەبێت کە لە ئاوایی گردەچال نەمینێی چونکە بۆ نەخۆشیەکەی تۆ زیان بەخشەو ئاوی گردە چال ناسازە و گرانە،ئیتر لە گردەچال بارمان کرد و هاتینە شاری هەولێری دێرین و ڕەنگین و لە گەڕەکی تەیراوە لە سالی 1954دا دەشتی خانوێکی لەقوڕ لە تەیراوە دروست دەکات و تیادا نیشتەجێ بووین .

ئەو ماوەیەی کە لە شاری هەولێر بووین دەشتی زۆری هەول دەدا کە کارێک بدۆزیتەوەو گوزەرانی مال و مندالانی پێ بەرێوە بباتن و ئەم شێوەبێ کاریە

PDF 4 KURD



دەشتی زیاتر ڕەنج دەدا و بەلام لە گەل ئەو هـەموو هەول و تێکۆشانەی کە لەوسەردەمانەدا هەولی بۆدا کارێکی دەست نەکەوت و چووینە ئاوایی خرابەدراو،لەوێ نیشتەجێ بووین و بالاًم نەخۆشی تەنگە نەفەسی و دل بەتەواوەتی دەشتی شپرزە دەکاتن و هەمیشە ئازارو ڕەنج و ژانی پێوە دەکێشاو گەلێ جاران دلی لە خۆ دەبۆوەو بۆ ماوەیەک بێ هۆش دەبوو،تەنانەت جارێکیان وا بێ هۆش دەبێت لە حوجرەکەی خۆی دەستی دەکەوێتە سەر مەقەرەی ئاگری ڕەژوو و دەستی دەسوتێتن ئاگای لێ نابێت تا بە خۆی دێتەوەو ماوەیەکی زۆر بەو برینە ئازار دەکێشێت،خۆ ئەو ڕۆژگارانەش وەک ئێستا نەبوو دەرمان و دکتۆر دەست نەدەکەوتن،داخی گرانم تا لە مانگی یەجەبی سالی 1957دا لە دوای تەمەنێکی زۆر کورت بۆ هەمیشـە مال ئاوایی دەکاتن وئەو دلە گەورەیەی لە لێدان دەوەستێتن، واتە تەنیا48 سال ژیانێکی پڕ لە ڕەنج و ئازار بە دەست نەخۆشیەوە دەباتە سـەر و بە ئاواتی ڕزگاری و سەربەخۆیی گەل و نیشتمانی ڕەنگین و خۆشەویستی نەگەیشت و بۆ هەمیشـە چاو تێک دەنێت و دەبێتە خەم و پەژارەیەکی نەبڕاوەی خزم و کەسان و دوست و تەواوی خانەوادەکەی، بەوپەڕێ ڕێزەوە لە خەرابەدراو لە دوای مەڕاسیمێکی گەورە دا لە سەر داوای خۆی لەگۆڕستانی خەرابەدراو لای شێخ مەلا سەعیدی دۆستی دێرینەی بە خاک دەسپێردرێتن و بۆ هەمیشە سەر دەنێتەوە.

دەشتی یەکێکە لەو مرۆیە مەزنانەی کە هەمیشە حەزی لە ڕزگاری کوردو کوردستان کردووە و هەتا ئەو ڕۆژەی کە چاویشی تێک ناوە هەرگیز بە قسەو نوسین وهۆنراوەی نیشتمانی درێغی نەکردووە و لە خەبات و تێکۆشـان دا نەوەستاوەو داوای لە گەلی کورد کردووە کە بۆ ژیانێکی ئازاد و سەربەخۆ دەبێ هەمیشە یەکگرتوو دلسۆزی خاک و میللەتەکەیان بن و لە پێناوی ڕزگاری لە چنگ نەیاران دا تەنیـا یەکێتی نێوان ڕێزەکانی گەل هۆی سەرکەوتن و بەختەوەریە بۆ کورد و کوردستان،دەشتی حەزی بە پێشکەوتن و سەربەخۆیی کوردستان و یەکگرتنی گەلی کورد کردووەو لە زۆربەی شیعرە نیشتمانیەکانی داباسی ڕاپەڕین و خەبات و تێکۆشانی ڕاستەقینەی لە پێناوی کوردو کوردستان کردووە،شیعرە نیشتمانیەکانی دەشتی هەموویان بەلگەی بیری کوردایەتی وهەستی پاکی خەبات و تێکۆشان لە پێناوی ڕزگاری و سەربەخۆیی کورد و کوردستانن .

هەزاران سلاو لە گیانی پاک و دلسۆز و نیشتمانپەر دەشتی نەمرو هەموو ئەو سەروەرو ڕۆلە دلسۆزانەی کە لە ڕێگەی زانست و زانیاری گەلی کورد و نیشتمانییان خۆیان بەخت کردووە وبۆ ژیانێکی ئازاد و سەربەخۆی کوردو کوردستان لەهەول وخەبات و تێکۆشان لە پێناوی ڕزگاری و ئازادی و سەربەخۆیی میللەتەکەیان نەسرەوتوون.

ئەحمەد دەشتی بەرلـین 2001

PDF 4 KURD



# هۆزانەکانی دەشتی نەمر

*

**ئیمرۆکەرەقیبم**

ئیمڕۆکە یەقیبم کەوتە بــــــەڵا
اذ اشـرق شـمسـی وحْتــفلا

سەد شوکـر خودا بۆدل کە نەما
همّ ونــجی القـلب وخـــــلا

هات و وتی‌ئەی عاشق وەرە دەر
مـن رغم عـــــــدّوّ قد افلا

بۆ بەزمی تەماشا چووم و گوتم
قد اســــــتوقد بدری وعلا

ساقی‌بەلەبی خۆشخەنـدە گوتی
اهلا بـک یامــن انتـــقـلا

دەسـتم کە ئـەدا فینجانی مەمی
بالعین و بالـرّئـس امتثـــــلا

دەشتی لە چ لا غە م بـۆ تۆ نەما
والحـبّ غـــلب و اللّـطـف جلا

*

**مانا ی وشە کان :**

ڕەقیب : نە یــار ، دوژمن . بە لا : گـێـچەل و گـیرو گـرفت، موسیبەت .اذ: کە .اشرق: هەلات ،دەرکەوت،درەوشایەوە. شمسی: ڕۆژم . واحتفلا : کەوتــە جەژن و شادی گـرتن .

سـەد شوکرخودا: سـەد جارسوپـاس بۆ یەزدان . بۆدل کە نـەمـا: پـەژارە و یەنج و ئازاری دل نەماو یۆیـــی و لە ناو چـوو.

همّ : خەم وپـەژارە . نجاالقلب وخـلا: دل ڕزگار و ئاسودە بوو. هات وگوتی : هاتە دوان و گۆتی .ئــەی عاشق: ئەی دلــدار. وەرە دەر: وەدەرکەوە وەرە بۆ دەرەوە ، دیاربە .

**من رغــم عدوّ:** لــە دژى دوژمن **قد:** بەڕاســتى. **افــلا:**ون بوو.نەما،لە ناوچو . **بۆ بەزمى تەماشا :** بـۆ شادى وسـەيران. **چووم وگوتم :** ڕۆيشتم و ووتم .
**قد استوقد :** بەياستى ڕۆناكى دا، بەياستى درەوشايەوە. **بدرى : مانـگـى من .**
**وعلا :** بەرزبۆوە.
**ساقى :** مەيگـێر. **بە لەبى :** بە لێوى **.خۆش و خەندە :**بەبزەی شاديەوە
**گوتى:**ووتى ، فەرمووى .
**اهلا بک :** يۆژ باش ، سـلاو لە تۆ، بە خێر بێى . **يا من :** ئەى ئەو كەسـەى .
**انتـقـلا:** گواستيە وە .
**دەستم كەئە دا :** كە دەســتم لێ دەدا . **فنجــانى مــەمى :** گۆى مەمكولانى
**بالعين وبالرئس :** بە چـاوو . ســەرى . **امـتثلا** سەرى دەنواند.دەى گێياوە.
تەمسيلى دەكرد.

---

**مانا بە گشتى :**

ئيمرۆكە دوژمنـى من لە داخاندا تووشى بە بەلاو موسيبە ت و گيرو گـرفت و ئازارو پەژارە هات ، چونكە يۆژى هيـواى من وەدەر كەوت ويۆنـاک بـــووەوە و بوو بە ئاهەنگ و سـەيران و شـادى من ، زۆر سوپـاس بۆ خوا كە خەم و ئازار و دەردى دلى من نەما و رزگـار و شاد بووم و لە خەم و خەفەتان دوركەوتمەوە،چونكە يارى من هات و گوتى ئەى خۆشەويستـەكەم وەرە دژ بە ويستى هەموودوژمـــنـان وەدەركەوە و شـاد و خەندان و دلـخوش ببە و پەژارەوحەسرەت و ئـازاران وەلابـدە، منيش كە بۆ بەزمى سەيران و شـــادى چووم و گوتم: ئۆخەى خۆ بەياستـى مانگى خوشـەويستى من لە بەرزاييدا درەوشـــايەوەو دەركەوت و خۆى نواند،واســاقى
مەيگێريش بە يووى خۆش و بزەى لێــوانيەوە هات و يۆژباشى لێ كردم و گوتى: ئەى ئەو كەسەى كەوا بۆ ديدار هاتووى سلاوت لـێ بێت و زۆر زۆر بە خێر بێيت، لەو كاتەشدا كەوا دەستم لەمەمكولانى يارەوە دەداو ئەويش بەشادمانى و يەزامــەنديەوە بە ســەروبەچاوانيەوە خۆى دەنواندوبەوەيازى بوو،هەر لە بەر هەنديشە كەوا منى دەشــتـى لەهەمـــوو لايەكەوە بێ خەم و پەژارەو ئاسـودەو دلشادبـوووم خەم و رەنج و ئازارەكانم لە ناو چوون و نەمان،چونكە وا خۆشەويستـى بەتەواوى پـەرەى سـە ندوە و لــوتـف و دلۆڤانى و دلسـۆزى زێاتر چەســپـاوە و جێـگـەى خۆيانيان گرتوە .

*

PDF 4 KURD



## ئەی سەروی حەیاتم

ئەی سـەروی حەیاتـم بەوەفا دڵ بکە ڕازی
بۆ زەهـری مەمـاتم بە تـەماتـم کە بسـازی

بەینێکە لەســـەر ڕێگەیی وەسـلی تـۆ دەناڵم
چـۆن لایقە تـۆهەندە بە ئەم زولمـە بنازی

کێ بێ کە نەفەوتابێ لە بەر عیشقی جەمـالـت
مەئمون و ئە مین و شـوهەدان فـەیسـەل وغازی

لەم جیسمە چ جوزئێ نیـە وینـەی تـۆ نـەداتـن
سـاری بووە عیشـقت لـە بەدەن بـویتە ڕیـازی

لـەم ڕۆژەوە دل فیکـری ویسـالی تـۆ دەکاتـن
دووتیغی برۆت بوونە بە جووت موفتیی و قـازی

هەر نەوعە تەبیبێ کە بلـێ غـەیـری ویسـالت
بـۆ ئـێش و ئـەلـەم شـافیە عیلمی نیــە حازی

دەنـگـی جەرەسی عیشقی تۆ ئەعلامی کەدەشتی
ڕوهـبانی دوو لیمــــۆنە لە ناو دێـری مـەجازی

*

---

**مانای وشەکان**:

**ئەی سەروی حەیاتم** : ئەی خۆشـەویسـتـر و بەرزتر لە هەموو ژیانم دا.**بەوە فـا :** بە دلسۆزی. **دل بکە یازی**: دلم ڕازی بکە ، دلنیام بکە . **بۆ زەهری** :بۆ ژەهری . **مەماتم**:مەرگم: یان(**بۆ زەهـری : گولی . مەماتم : مەمکۆلان )بە تـەماتم :** بە هیـوای تۆم ، بەئارەزووی تۆم .**کە بسازی :** کە ئـامـادەبی، حازربی.
**بەینێکە :** زۆر لە مێژە ، ماوەیەکە. **لە سـەر ڕێـگـەیی تۆ :** لە سـەر ڕێی تۆ دا لەسەر ڕێبازی تۆدا.**دەنالم :** هاوارمە و پڕ لە ئازار و ئێشـم.
**چـۆن :** کوو،چلۆن . **لایقە :**شایستەیە.**تـۆ هەنـدە :** تـۆئەوەندە . **بەئەم زولمە :** بەم زۆرداریە **بنازی :** ناز بکەی. شانازی بکەی ،شاییت بە خۆوەبێت.
**کێ بێ :** کێ هەیە ، کەسێ هە یە. **کەنەفەوتابێ :**کە لەنـاو نەچـوو بێ . **لە بەر:** بەهۆی . **ئەشقی جەمالت :**عیشقی ڕووی جـوانی تۆ.**مەئمون :** بـاوەڕ پێ

PDF 4 KURD



کـــراو.**ئەمین:**ڕاســتــگــۆ،کەسێ کە خەلک باوەڕی پێ بکەن. **شوهەدان:** شاهێدن .یان شەهیدن **فەیسەل :**مەلیکی یەکەمی عیراق **: غــازی :** مەلیکی دوەمی عیراق

**لە م جیسمە :** لــەم هەیکەلە،لەم جەستەیە. **چ جوزئێ :** چ شوێنێ ، چ بەشێ . **وێنەی تۆ:** شــێوەی تۆ ،سیمای تۆ ، ڕەنـگــی تۆ، شــکلی تــۆ. **نەداتن :** نەهێنێ، پێ یەوە دیارنـــەبێ. **ساری بووە :** واتە بڵاو بووەتەوە ، تیادایە ،درمە. **عیشقت :** خـۆشەویستیت ،ئەوینت. **لەبەدەن :** لەتەن ، لە جسم،لەجەستە لە دەروون . **بـۆتە ڕیازێ :** واتە بووە بەوەرزش ، لەناو تەندا چەسپــاوە و بەهێزە.

**لەم ڕۆژەوە :** لەو کاتەوە . **دل :**قەلب ، هەست . **فیکری :** بــیری، یادی. **ویسالی تۆ:** گەیشتن بە تـۆ. **دووتیغی برۆت:** هەردوو ئەبـــرۆکانت **بوونە بە جووت :** یەکتریان گـــرتووە و بوونە بەیەک.ئەم وشەیە بۆ ئەوە بەکار دێتن کاتی کەدوکەس بە جووتە بۆ مەبەستێک یەک بگرن. **مفتی:**خــاوەن فتوا، قازی،حاکم کەسێ کە مافی دەرکردنی بیرياری دادگاوشەرعی هەبێت . **قــازی:**حاکم ، کەسێ کە فەرمان دەردەکات ، ڕەواکـار ، دادپـەروەر .

**هەرنەوعە:** هەرجۆرە . **تەبیبێ :** دکتۆرێ ،پـزیشکێ . . **کە بلێ :** کە بلێتن کە بێژێت .**غەیری ویسالت :** جـگـە لە گـەیشتن بە تۆ .

**بۆ ئیش و ئەلەم :** بۆ ئازار و ڕەنج و ژان . **شافیە :** چـارە سـەری هەیە . **عیلمی نیە :**زانستی نیە،زانینی نیە ،نازانێ بێ ئاگایە.**حــازی :** پێی بــڕاوە کەسێ کە شتێک وە دەست بێنێ.،پێ براو **دە نگ :** ، ســەدا.**جــەڕەس:** زە نـگ . **عیشق:** دلداری .ئەوین .**ئەعلام :** کۆی عەلەم ، نیشانەکان ، پێشەوا. **دەشــتــی :** نازناوی شاعیری هێژا مەلا خدری نانەکەلیە . **ڕوهبان :** پارسا ، کەسێ کە لەکەنیســەی مەسیـحیان خەریکی نیایش بێت . یان ڕەهبان **:** کەبەو کەسە دەلین کە زۆر بترسێت . **دوو لیمۆ:** تەشبیهە بۆ جووتە مەمکۆلان . **لە ناو دێــر:** لە کەنیســەدا .لێرەش سینەی یار بە کەنیسا تەشبیەکراوە .

**مەجازی :**غەیرە حەقیقی، بەومانایەوەیە کە بەکارهێــنانەکەی وەک مانای ڕاستییەکەی خۆی وابێت .یان کەسێ کە شتێک ئەنجام بدات یان **موجاز:**واتە ڕەوا ڕوخسەت پـێ دراو .

مانا بە گـشتی

ئەی ئەو کەسەی لە سەرووی هەموو ژین و ژیانمی و خۆشەویست تر و بەرزتر لە هەموو شتێکمی تری،دەوەرە بەوەفا و دلسۆزی و خۆشەویستیەوە دلم یازی بکە، من وا بە هیوای گولی جوانی تـۆمە کەوا ببێت و وەفادارانە و دلسۆزانە دلنـــیاو یازیم بکەیت ، وا من زۆر لە مێـژە لە ســە ر ڕێگــەی گەیشتن بە تـۆدا

PDF 4 KURD



دەنالێنم و هاوار دەکەم ، چۆن یەوایە و ئاوا دەبێت کە تۆ ئەوەندە بەو زولم و زۆر داری یەوە شانازی بکەیت کێ هەیە کە لە تاو خۆشە ویستێ و ئەشقی تۆدا نەفەوتابێت ؟ خۆ مەلیک فە یسەل و مەلیک غازیش هەردوکیان لەو بارەوە شاهیدانی یاستگۆ و باوەی پێ کراون ،وا لە ناو ئەم جەستەی مندا هیچ شوێنیک ،نیە کە وێنەی تۆی تیا یەنگ نەداتەوە و تۆی تیادا وەدی نەکرێت ، ئەشق و خۆشەویستی تۆ وا تەژی ناو هەست و دەرونی من بووە و زۆر بەهێزوکاریگەرە هەرلەو یۆژەوە کە دل بەیادی گەیشتن بەتۆوەیە ، وا هەردو ئەبرۆکانی تۆ پێکەوە یەکتریان گرتووەو بوونەتە خاوەن فوتوا و فەرمان یەوا و بێیاری نەمان و لە ناو چوونی من بە یەکەوە دەردەکەن ، خۆ هەر جۆرە پزیشک و پسپۆڕێکیش

کەوا بێن وجگە لە چارەسەری شاد بوون بە تۆ و گەیشتن بە تۆی خوشەویستم هەرجۆرە هەتوانێکی تر بدۆزنەوە و باسی لێوە بکەن ، ئەوە دیارە کە ئەوان دوورن لە بواری زانیاری و زانستیەکان دا و شارەزا نین و نەزانینیان پێ بیاوە و بێ ئاگان ، خۆ لە ئاوازی زە نگی ئە شق و خۆشەویستی دا دیارەو یوونە

کەوا دەشتی وەک راهیب وایە و هەمیشەخزمەت گوزاری هەردوو لیمۆکانی سەر سینەی تۆیە.

*

PDF 4 KURD

## ئەی وای چ ئیشێکە

ئەی وای چ ئێشێکە لە سەر بـەنـدی جـگـەرم مـا
بـرژاوی چ شـیـشێکە دلم بەم شـەبی سـەرما

جێـی خـەنجـەری شـۆخێکە لـەمەیـدانی جوانی
بـۆ تەجرەبە زەخمێکە بە ڕوو دا لە حـەزەرمـا

تاریکـە شـەوی زولفەکـانە ڕوخـە بۆیـێ
تـالیب بـە نـەسـیمم لـە حیسباتـی خـەتەرمـا

هەرچی نـەیە ڕوو چینـەیە بـۆ سـەیری پیاسـەی
تیـرە لـە کـەمانـایە لە ڕێبازی خـەبـەرمـا

بـەیـداغی قـەدی ئایـەیی نـەسری لـەسـەرایە
بێ شـوبهەیە ئاخیرکەڕەمی خـاکـە وەسـەرما

پێم خـۆشـە کەلەم ڕێگـە بکوژرێمەوە ئەمما
سـەد حەیفە ڕەقیب بێتە تەماشایی سەیرما

شێتی ئـەگـەنا تـازە ئومێـدی چیتـە دەشتـی
ڕوح و سـەرو مـالت کە لە پێنـاوی قـەمـەرمـا

*

**مانای وشە کان**:

**ئەی وای :** وشەی هاوار کردنە لە تاو ژان و ئازارو برینان و ڕەنج و خەمان دەگوترێت. **ئێش:** دەرد ، ژان ،ئازار.**بە ندی جـگـەر:** یەگی جەرگ وناو. **بـرژاو:** بە ئـاگـر سۆربووەوە ،بوون بە کەباب. **شـۆخ :**جوان ،لاو، نـازدار قەشەنگ،دلبەر. **دل:** قەلب .**شەبی سەرما:** شەوی ساردوسی ،.شەوی بە ئاوات نەگەیشتن و خەمباری .

PDF 4 KURD



**جـیَ:** مەکان،شویَن.**خەنجەر:** کـیَردیَکی خوارە پیاوان لە بەرپشتی خـۆیان یادەکەن و ئامرازیَکە بۆ شـەیی سـارد بەکاردیَت . **مەیدان :** چەق هەلیَر ، ناوەنـد **جوان :** شۆخ ، قەشـەنـگ ، نازدار ،لاو.

**تەجرەبە :** تاقی کردنەوە . **زەخـم :** زام ، بـرین . **بەیوو:** لە یوو **حەزەر:**ئەندازە ، تەخمین ، بەروبووم .

**تاریکەشەو:**شەوی تاریک ، شەوی قەقنەس ، لیَرەدا زولف لە یەشیاندا بە شەوی تاریک تەشبیە کراوە. **زولف :**پـرچ ، بسک .**یوخ :**مەلی ئەفسانەیی ،یوخسار،.

**بۆیێ :** لەبەرهەندیَ. **تالیب :** داواکار. **نەسیم :** سروە ،شنە. **حسـابات :** ژماردن بۆچوون . **خەتەر:** بـقـە

**هەرچـی نەیە :** هەرچـی کە قەددی وەک نەی وایە و لە بارە و شۆخ و شەنگە.**یوو :** بەرەو لای، **چـیـنە :** دانەویلـە،بەو دیوارەش دەلیَن کە بە گول هەلچیَندرابیَت. **سەیر :** یوانین تەماشـاکردن . **پیاسـە:** قەدەم لیدان گـەیان و سویان .**تیر :** گوللـەی کەمـانە . **کەمان :** ئەو ئامرازەیە کە تیری پیَ داویَـن و لە کونەوە بۆ شەی کردن بەکار هاتوە ،لیَرە کنایەیە بۆ یاری نازدارو شۆخ و شەنگانی لەبار،کە دلداران وەک تیر بە جوانی و زیبـاییان زامدار دەکەن. **ییَـباز :**ییَ ، ریَگا . **خەبەرما :** هەوال ما .

**بەیداخ :** عـەلەم ،پـەرچەم . **قـەد:** بالا ، بەژن . **ئـایەت :** نیشانە.**نەسر :** سەرکەوتن . **لە سەرایە :** لە سەردایە،لە سەر نوسراوە.

**بـیَ شـوبـهە:** بیَ ویَنەیە. **ئاخیر:** دوایـی . **کەیەم :** بەخشین ، ویَدان ،سەخاوەت . **خاک :** گـل ، خۆل . **وەسـەرما :** لەسەر سەرم دا .

**پیَم خۆشە:**حەزدەکەم .**لەم ییَگـەوە :** لە و ییَبازەوە. **بکوژریَمەوە :** بمـرم.لە ناو ببریَم بکوژریَم ، لە ناو بچم،ببم بە قوربانی و سەرم ببین. **ئەمما:** بەلام **سـەدحەیف :** سـەد مخـابـن. **یەقیـب :** دوژمـن ، نەیار .

**بیَت :** بـەهیَت ، بیَتن . **تەماشا:** یوانین سـەیـرکردن . **سەیرما :** یوانینم تەماشاکردنم،سەیرم.

**شیَتی :** دیوانەی . **ئەگـەنا :** ئەگـەرنـا. **ئومیَدی چتە :**هیـوای چیتە، ئاواتی چیتە . **دەشتی :** نازناوی شاعیـر مەلا خدری دەشتی یە .

**یووح :** گیان **سەرومال :** سەرو سامان . **پـیَـناوی قەمـەرما :** لە ریَگـەی مانـگـی مندا،لیَرە تەشبیهی یار بە مـانـگ.کراوە.

---

**مانا بەپشتی**

ئەی داد و هاوار، ئەم ژان وئـازارە چیە کەوا لە ناو دەروون و هەناوی من دا خۆی دەنویَنی و ئاوا رەنجـم دەداتن و وا گیی تیَ بەرداوم ، ئەم سوتان و پەژارەیەم لە تـاو چ نـازدار و جوانیَکە کەوا لەم شەوە سـاردو سیەدا ئاوا

PDF 4 KURD



دلی برژاندووم و گری لە هەناوان بەرداوم ، ئەمە شـوێنی زام و برینی خەنجەری چ شۆخ و نازدارێکەکەوا بۆتاقی کردنەوە لە مەیدانی جوانی دا بەم شێوەیە دلی بردووم و ئاواش هەمیشە لە بەر چاوانمە،من کەوا بەهیوای پرچی یەشی وەک تاریکە شەو و ئەفسانەیی یارەکەمم و واهەردەم بەیادی هاتنی سروەیەکی فێنکی لای ئەو یارە دلگیرەی خۆمم و چاوەیوانم کەوا شنەیەک لە رێگەی ئەو ئازیزە خۆشەویستەمەوە هەلبکات و دلم شادو خەندان و ئاسودە بکاتن ، وا ئێستاکە هەموو نازدارانی لە بارو بالابەرزانی وەک نەی وان لە رێگەی ژوان و گەیشتن بە دلداران و یارانی خۆیانەوە لە کەیف و سەیران و بەزمی شادی دان، کەچی وا یارەکەی من خەریکە جەرگم دەبێت و تیری خۆی ئامادە کردوە و منی کردۆتە ئامانج و هەوالی مەرگم پێ دەداتن هەرچەندە کەوا قەدو بالای وەک پەرچەمی ئەویارەی من نیشانەی سەرکەوتنیشی لەسەر نوسراوە، بەلام لێم یوونەو دیارە کە دوا بە خشین و کەیەمی یارەکەی من ئەوەیە کە تەنیا خاک وەسەر سەرم دا بکەم و قوی وەسەر بم،خۆ منیش هەرچەندە ئەوەم پێ خۆشەو یازیشم کەوا ببم بە قوربانی ئەو رێبازەو سەرم لەو ییگەوە دابنێم و بکوژرێم و نەمێنم و لە ناو بچم، بەلام تەنیا حەیف و مخابنم دەمینێ کەوا نەیارو دوژمنانم بێن و ئاوام ببێن و دلیان بەوە شادببێ کەوا من بە ئاوات نەگەیشتووم و ئاوا خاک وەسەرسەرکراوم و ئەوسا کە دوژمنانم بەم شێوەیە دلخۆش و شاد دەبن و بە ئاواتی خۆیان دەگەن ، دەشتی خۆ دیارە کەوا تۆ دیوانەی ئەگەرنا تازە چە هیواییێکت ماوە و بە تەمای چیت ؟، واتۆ سەرو مالی خۆت و هەموو دارایی و شتێکت لە پێناوی یاری شیرین و نازدارەکەی وەک مانگی جوانی خۆت داناوە و بویتە قوربانی و پێشمەرگەی ئەویارە شیرین و خۆشەویستەت .

*

PDF 4 KURD



## ئەی پەری

ئەی پەری پڕ داخــە دڵ بۆڕەونــەقی پەرداخـی تۆ
بـەروە ڕویی ئاســمانم بـەر لـە پـێـرووی چـاوی تـۆ

رووتی ڕووتم ڕوو لەتـــــاوی ڕویی ڕۆژی ڕوومەتم
بـەم چـلەی زســتانـە تـاواوەم بـە تـاوی تاوی تۆ

ئەی شەهی عالی جـەناب و ئەی مەهی پڕ نــورەکەم
بــۆچـی وا بێ بـاکە زولف وکولمـەیی گـولنــاری تۆ

دەم بەدەم خـوێنی جگەرما وا خـــەریکە نیـگـبەتم
پـەنجەرەی دەستی غەم و چۆک وەچەنەم سەیرانی تۆ

مـانـی دەرمـانـم لـە مـــانا کەوتە ئـامانـی جــەفا
بـۆنەجـاتی مـانی خۆم خســـتۆتـە بــەر ئەیوانی تــۆ

ڕوحی من قــوربانی زولـفی تـا قەدەم بەرپێیـچکـەت
چاکە ڕەحمـێکەی بەهـاوارم لە نــــــــێو زیندانی تۆ

ڕەنـگـی زەرد وچـــاوی روبـاریم و قەلبی پڕ بریــن
وادەلـین دەشــــتی مــەزاتی ڕۆحە وەســلی یاری تـۆ

*

**ماناى وشه كان**

**پـەری** : فریشتە ، حـۆری. **پـــڕ** : تەژی . **داغە** : داخ کـراو،بە گـەرمی سـوتاو . **دل** : قەلب .رە ونەق : ڕۆناکی ، شەوق . **پەرداغ** : ڕێک و پێک ، لە بار،شیک و جوان ،گلاس .

**بە روە ڕوو**: ڕوو بە ڕەو . **ئاسمان** : حەوا ، سەما . **بەر** : لە ژێــر ، لە خوار

**پــێرووی** : ناوی ئە ستیرە یەکە،کە چـاوی یارلە گەشـی و جوانیدا بەوئەستیرەیە تەشبیە کراوە . **چـاوی تۆ** : دیدەی تۆ . **ڕووتی** : بێ بــەشی ،ڕووتی و عوریان.

**ڕوتــم** : ڕووی تــۆم ، وەجهی تۆم ،ڕوخساری تۆم .**ڕوو**: ڕوو وەجە،ڕوخسار،تاو

PDF 4 KURD



: حەسیەت حەژمەت، لەتــاوان. **یوویی** : یوخسار،بەرامبەر، بەرەو ،موقابل.**یۆژ**: خۆر، خۆرەتاو.ی.ومەت : کولمە ، گــۆنا . **چلەی زســتان** : چــلەی زستان چل یۆژە کە زۆرســارد دەبێت. **تاواوەم** : تــواوەم ، توایمەتەوە لە حەژمەت و گەرمیدا . **بە تاوی** : بە هەتــاوی، یان لەبەرتاوی تۆ، لەحەژمەتان. **تاوی تــۆ** : خۆرەتاوی تۆ هەتاوی تۆ ، یۆژی تۆ،گەرمایی تۆ،لە،حەژمەتی تۆ.

**ئەی شە هی**: ئەی شاهی ،ئەی مەلیکی ،ئەی پادشاهی. بەیێــز. **عالی جە ناب** : ئەی هێژاو بەیێز ، گــەورە و پایەبەرز. **ئەی مەهی** : ئەی مانــگــی . پــی:نــوورەکەم: تەژی یۆناکیەکەم .

**بۆچی** : لە بەرچی . **وا بێ باکە** : وا بێ ترسە ، وامەغرووورە. **زولف** : پـرچ کەزی .**کولمە** : یوومــەت ، گــۆنا . **گو لنار** : یومـەتی یـار بە گولنار تەشبیە کراوە .

**دەم بەدەم** :وەخت بە وەخت ، کات بەکـات . **خــوێن** : خوون دەمی عەرەبی. **جگــەر**: هەناو.**خــەریکە** :لــە زگـە ، وەختە . **نیـگــبەت** : نەحس ، بەدبەخت .**پـەنجە رە** : لێرە دا جەســتەی خۆی تەشبیە کردوە بە پەنجەرە کە لە تاوان و لە خەمــان وەک پەنجەرەکون کون بووە و وایە. **دەســتی غەم** : واتــە لە چـنـگ خەم و پەژارەدا .**چۆک وە چەنەم** : واتە داماوو پی لە خەم و یەنج و جەفام لە تاوی تۆدا،دەستەو ئەژنۆ دا کەوتووم.یان (**پەنجەرەی دەستی غەم و جێی کۆچەنم سیرانی تۆ**):واتە:من دەستەو ئەژنۆ داکەوتووم و تۆش لە شوێن و جێی کۆچ و هەواری من دا سەیران و خۆشیتە.مانی : مانەوە. **دەرمان** : هەتــوان ، چارەســەری. **لە مانا** : لە شێ کرنەوە دا،یان لە مانەوە دا.**کەوتە بەر**: چووەژێـر. **ئامان** : پـەنا .**جـەفا** : رەنج و ئازار. **بۆنەجاتی** : بۆ یزگـاری . **مانی خۆم** : مانەوەی خـۆم .بوونی خۆم. **خستۆتە بەر**: چـوومەتە ژێر **ئەیوانی تۆ** : سـایەی تۆ . هەیوانی تــۆ ،کەیەمی تۆ.

**رووح** :گـیان. **قوربان**: بە قوربان بوون .**زولف** : کـەزی.پـرچ . **تا قەدەم** : هەتا سـەرپـا . **پێچەکەت** : بەگـروازەکەت .

**رەحم** : لوتف ، مهرەبانی ،دلۆقان، **هاوار**: داد ، رەنــج . **نێو زینــدان** : لە ناو بەند **رەنـگــی زەرد**: نەخـۆش.زەردرەنگ. **چـاو** : دیدە.**یوبار**: چۆمی ئاو.**قەلب** : دل **برین** : زام. **وادەلێن** : وا دەبێـژن. **دەشتی** : ناز ناوی شــاعیرە . **مەزات** : هەیاچ . **یوح** :گـیـان . **وەسلی یار**: گـەیشتنی یار .

---

**مانا بە گــشتی**:

ئەی ئەوکەسەی کە وەک پـەری شۆخ و جوان و نـازدار و لە باری وا من بۆ تۆ دلم پـی لە ئاخ و داخە و یوو بە رەو ئاسمانەوەم و هەمیشە دەیوانمە پـێرووی چـاوەجوانەکانی تۆی بالا بەرزەوە. من کە بێ بەشم ودوورم لە یووی تۆدا بۆیەکە هەردەم لە تــاو یوومەتی پــی لە نــووری وەک خۆرەتاوی تــۆ بەم

PDF 4 KURD



چـلەی سارد و سیی زستانمەوە لە بەر ســوتان و گـەرمی دا لە تاوان و وحەژمەتی جوانی وشۆخ و شەنگی تۆی نازدار دا دەسوتێم و دەتـوێمەوەو وا دلم برژاوە و پـیلە ئاگروگیوگلپەیە. ئەی بە رێــز و هێژا و مانـگـە پـی لە شەوق و یۆناکیەکەی من، لە بەرچـی ئاوا زولف و ئـەگـریجەکان و گـۆنای جوانی وەک گولنــاری تۆ ئەوەندە بێ بــاک و مەغروورن ؟. ئا بەم شێوەیەی تۆ وا یۆژ لە دوای یۆژیش خــوێنی هەنـاوی من خەریکەلە تاوی تۆدا ووشک و چـک دەبێتن و نامێنی و بە رەو نیـگـبەتی و نەمـانی دەیۆم، وا تەوای جەستەم کون کون بووە و لە تاو خەم و ئازاران دا دەستەو ئەژنۆ داکەوتووم و دل پی لە خەم و پەژارەم (یان پەنجەرەی دەستی غەم و جیێ کۆچەنم سەیرانی تۆ)واتە( جێی کۆچ و هەواری من شوێنی گەیان و سویان و بەزم وسەیرانی تۆیە)من هەرچەند دەکـەم و دەیوانم و لێکی دەدەمەوە ، تەنیا ئەوەم بۆ دەردەکەوێت کە هەتوانی دلی من بۆ ژیان و مانــەوەم بێجگەلە تۆ چارەیەکی ترم نیە، خۆ تەنیا ئەوەی کە پێشـمەوە دیارە جگە لە رە نج و ئـازارو نەهامەتی و پە ژارەو ئازاردا شتێکی تر وەدی ناکرێت ، بۆیەکە وا بە دل و بەگیان بۆرزگـاریم لەو ئازار و میحنەتانەمدا خۆم خستۆتە ژێـر سایەی لوتف و بەخشینی تۆوە ،وا ژیان و گیانی من قوربانی پـرچـی جوان و پـــی لە گـروازە و ئەفسانەیی و درێــژی تا سەر پێیانی تۆیە ، جا وا باشە کە تۆش بە هاوار و دادمەوە بێیت و چارەیەکم لێ بکەیت چونکە وا من لە ناو بەند و زینـدانی تۆ داگیرم بۆیەکە وا پر لە یەنج و ئـازار و جەفاو پەرێشانم ،دەساتۆ وەرە یەحمێ بەم ژیانە سەختە و حـالی من بکە و لەم هەموو یەنج و جەفاو ئازرانەم دا یزگارم بکە، خــۆلە یەنـگـی زەرد و چـاوی پـی لە ئەســرینی وەک یوبـاری من و دلی پـی لـە زام و برینانم دا دیارە کەوا من چۆنم و بە چ شێوەیەک دەژیم و هەمیشە هەر هاوارو داد و یۆیۆمە،هەر بۆیەشە کەوا هەموو لە هەموو دەلێن ئەی دەشتی دەبێ تۆ بــۆ بە ئاوات گـەیشتن و وەدی هاتنی ئارەزووەکانی خۆت گـیانت پێشکەش بکەیت و خۆت لە ییی گەیشتن بەیاری خۆتەوە دابنێیت و هەموو ژیانت بخەیتە مەزاتەوە و خۆت بە قوربانی یارەخۆشەویستەکەی خۆت بکەیت و لەم ییەداگیانباز و پێشمەرگە بیت

*

PDF 4 KURD



## ئیمرۆکەغەریبم من

ئیمرۆکــە غــەریــبــم من بــۆییکه پەریشـانــم
هەردەم لـە مــەکانێکـم بۆ ڕوویــی پەریخـــانم

ڕەحمـت نیـە ئـەی زالـم بـەم چـاوە نـەمـاحـالم
جـــاریَ بکە دەرمانــی ئەدنـایی برینـــانــم

قــەد دالــە بەتیغـی تـۆ شـــێواوە بــەتیری تـۆ
بەم قەددەی نـەمـامـی تـۆ مــوحـتـاجـی تـەبیبانم

بـەوسلکه سـلکبـازی بـەم سلکه ئـەکەی وازی
دل جاریَ بــکـە ڕازی بۆ ڕەغـمی ڕەقــیبــانــم

بــەم تـۆڕە گرفتــارم بەم دوگــمـە بــرینـدارم
بۆئەتلــەسـی سـەرسینەت ڕوو خاکی مەریـوانم

مـردوومــەلـە هیجــرانـت تـۆ ڕەونـەقـی ئیمانـت
گەرجاریَ نـەکـەی مـەیلیَ لـەم دەرگــەیە مێـوانم

عومروڕوحی دەشتی هەی فیدیەی سەری کولمەت بیَ
ڕەحمــیَ بکەئــەی دلبەربـەم چاوەی بـە گـریـــانم
*

### مانای وشە کان

**ئیمرۆکە** : ئیرۆکە،ئەمرۆکە. **غەریب** : بیێگانە ، نامۆ، بیانی، غەوارە.**بۆیێکە** : لە بەر هەندی. **پـەرێشان** : عاجز، پـەشێو ، خەمبار.
**هەردەم** : هەرکات . هەروەخت . **مەکان** : شوێن ، جیێـگا .
**یوو**: یوخسار،دم و چاو.**پـەریخانم** : ناوی ئافرەتانە ، یان ئافرەتێکی وەک حۆری ئاسا
**ڕەحمت** : بەزەییت، کەڕەمت،میهرەبانیت، لوتفت . **زالم** : زۆر دار.**چـاو** : دیـدە.
**نەما** : فەوتا ، لە ناو چوو . **حال** : وەزع ، ژیـان ،ئێستا.
**جاریَ** : دەفعەییَ،یەکبار. **دەرمـان** : هەتوان ،چارەسەری. **ئەدنـا** : خراپـتریـن ، یان کەم ترین . **بریـنان** : زامەکان .

PDF 4 KURD



**قەد دال:** قەدی وە ک پیتی دال خـــوارەوەبوو، چەماوە. **تیــغ :** شیر. هەر ئامرازێکی کە تـیـژبێت،بە مانـای ڕۆناکی و شەوقیش هاتووە. **شێواو :** تێکـچوو . **تیر :** تەشبیهە،دارێکی ڕاست و باریکە کە ئاسنێکی تیـژی لە سـەردەگـرن و دەیهاوێـــن بۆ ئامانج لە رابوردو ئامرازی ڕاوو شەڕ کردن بووە، زامدار دەکاتن و یان دەکوژێت.خۆشەویستی بە تیر تەشبیە کردوە کە لە تاو یارەکەی بە تیر پێکراوەو زامداربوە. **بەم قەددە :** بەو بەژن و بالإیە . **نەمــام :** شـــەتل ، بەژن بە نەمـام تەشبیە کراوە،باریک و جوان و لە بار. **تەبیب :** دکتۆر ،پـزیشـک .

**بەوسیلکە :** سیم ، بەو دەزووەش دەلین کە شتیکی پێوە بکەن یشتەی مرواری بە مانای یێزیش هاتووە.**سیلکباز :** یاریــچـی ،بە سلک یان خاوەن مەنسەب **وازی :** یــاری کردن ،گەمە. **دل:** قەلب . **جاریٚ :** یەکجار . **ڕازی :** قــایل . **ڕەغم :** بە پـێچوانە بە دژ . **ڕەقیبان :** نەیاران ، دوژمنان .

**بەم تۆڕە :** بەو داوە ، بەو تەلەیە . **گـرفتارم :** گـیرودەم، توشم بە ناخۆشی هاتوە. **بەم دوگـمە :** ئامرازێکە یەخەی سنگ و بەرۆک پێ دەبەستنەوە،قۆپچە،بەم بەندە ،دوگمەی یەخە،دوگمەی تیر.**بریندار:** زامدار.

**بۆ ئەتلەسی:** واتە بۆ مەمکولانت. **ســەرسینەت:** لە سەر سنـگـتا. **ڕوو:** بەرەو. **خاکی مەریوان :** مەبەست شاری مەریوانە کە دەکەوێتە کوردستانی ڕۆژهەلاتەوە.**مردوومە :** نەماوم ، لە ناوچووم . **لەهیجـرانت :** لە فیرقەتت ، لە دوور بوونەوەت . **ڕەونەق:** تیشک ، ڕۆنــاکی. **ئیمانت:** باوەڕت. **مەیــل:** ڕەغبەت.**دە رگـە :** دەروازە. **عومـر :** تەمەن . **رووح :**گیان . **دەشتی :** نازناوی شــاعیرە. **فیدیە :** قوربــان . **سەری کولمەت :** ســەرگۆنات ،سەر رومەتت. **ڕەحم :** مێهرەبانی، کەڕەم کردن،دلۆڤانی ، بە خشـش ،لوتف **دلبــەر:** یاری دل فرێـــن . **چـاو:** دیدە. **گـریان :** زاری.

**مانا بە گشتی** :

ئەمرۆکە من وا نامــۆ و غەریب و دوور لە یاری شیرین و خۆشەویستی خــۆمم هەر بـۆیەشە کە هەمیشە دل بەخەم وپـەرێشانم و هەردەم لە شـوێنیکم و وێلی خۆشەوویستی ڕووی وەک پـەری جوانی یارە دلگراوەکەی خۆمم،ئەی زالم،تـۆ کەوا ڕەحمێ بەو چاوەی پــڕ لە گریانی من ناکەیت ،کەوا من ئاوا بێ حــال و پەرێشان و خەمباری دووری تۆم و هەردەم وا تۆی یاری ئازیزم لە ناو هەست وبیرخەیالم دای، دەســا تۆش وەرە تەنیا چارەسەری و هەتوانی کەمترین زامــەکـانی ناو دەروونی من بکە، وا من لە تاو جوانی و قەدی وەک نەمامی تۆدا کووڕ بویمەتەوە و زۆر پەرێشان و خەمباروپڕ لە ڕەنج و جەفاو دل نەخۆشم و پـێویستیم بە تۆی دکتـۆر و پـزیشکی برینانم هەیە ئەی یارەکەی من تـــۆ ئاوا بەو جۆرە چلــۆن یـارێکـی کە ئەوەندە لە خۆت ڕازیی و ئاوا مەغـروورییت، دەوەرە تەنیاجارێـــک تۆ بەدژی هەموو ناحەزان و نەیاران هەستەو دلی منی

PDF 4 KURD



پەژارەدار ڕازی بکەو کەمێ شاد و خەندان و دووره خەمم بکە . وا من لە دووری و جیابوونەوەی تــۆی ئازیزدا مردوومەو نەماوم، ئەگـەر تــۆش نەیەیت و جارێک مەیلێــک بەلای منەوە نەکەیت و ئــاوڕێکم لێ نەدەیتەوە و هەر ئاوام لێ بـگەڕێیت ئەوا مەجبـوورم کەوا بەخۆم ڕێ دابگرم و بێم بۆمیـوانیت و ڕوو لە دەروازەکەی تــۆیا بکەم ، تا وەکو هەموو تەمەن و ژیانی دەشتی بە قــوربـانی گۆنای جوان و خۆشـەویستی تۆ ببێــتن سا کەواتە ئەی شوخ وجوان و نازدار و ئاواتی من، دەوەره دلۆڤانیەک بەو دیدەی پـڕ لە گریــانی من بکەو هەتا منیش بۆ خۆم ئاسوودەو دلنیاو دووره پەژاره ببم و ئەم هەموو خـەم و ئازارو جەفایانەم نەمینێت و منیش بۆ هەمــیشە حەسرەت و کوێرەوەری و نەهامەتیەکانی پڕ لە ڕەنج و ئازارەکانم ببرێـتەوە و ئاسودەو ئارام و دلنیا ببم .

*

PDF 4 KURD



## ئەی بەسەرما

ئـەی بەسـەرما وەقتی گەرما سـێبەری بـەرزت چنار
وەی لەگەرما وەقتی سـەرما هیممەتی بەرزت چنار

پـاشی خـاکی دەر زیارەت کـردنت عەرزت بکـەم
بـۆئـەدای واجبـی ئـەمـرت کـە دوێـنی بـوو دیار

کەس بەسێ وچارەکەی نەیدا لەکن زۆرکـەسان گەڕام
بـاوجوود نەم دیوە بیفـرۆشن بە سـعری سـێ و و چار

لێرە قـوربان چـشـتی وا سەبرێکی زۆری پێـدەوێ
ئیمـڕۆ نیمە و نیمەیەکی تـر،سبەی تا یەک دوو بـار

چونکە حەققی تووروسلق و قەسپ وسابون و دەزوو
زۆرە گەر دەرچێ بە تەننێ هەرلە ئیسـتە تـا بەهار

ئەوکەسەی فەللاحە ئەسلەن نەبووەدوولـۆری هەبێ
لێـرەدا جـا بیفـرۆشێـتن بـە سـعرێکی دیـار

چونکەعەردی ئاشە تۆی باراشە جوتیاری غـەریب
قەت بـەتەنیا نـابێ بـەردانک لـە وێ بۆی نـێتە خوار

تالیعی دەشتی وە کو ئـەم دەشتە بـێ تالیع وەیـە
بـۆیێ ئەمرێکی لە بۆ هات و ئـەویش نـەیبوو چ چـار

**مانای وشە کان :**

**ئەی بەسەرما :** واتە ئەی لە کاتی سەرمادا ، یان ئەی ئەو کەسەی کە سەروەری منی،لە سەرووی من دای.**وەقتی :** کاتی . **گـەرما :** گـەرما بوون. **سیـبەر :** سـایە **بەرز :** بلند .**چـنار :** داری چـنار .**وەی :** ووشەی هاوارە و بۆ تەعەجوبیشە.

PDF 4 KURD



**سەرما :** ساردی . **هیممەت :**گرنگی ،توانا، هانا. **پاش :** دوای . **خاک :** خۆل ، وار .دەر:دەروازە ،دەرگا. **زیارەت :** چاوپێ کەوتن ،مولاقات . **عەرز :** پێشکێش ، پێ گوتن .ئاگادارکردن . **ئەدا:** جێ بەجێ کردن ، ئە نجام دان . **ئەمر :** فەرمان .دوێنێ : ڕۆژی ڕابوردوو. **دیار :** دەرکەوتن ، ڕوون بوو .کەسێ: یەکێک ، هیچ کەس . **سی و چوار:** ژمارە 34.**لەکن :** لەلای. **با:** لەگەل . **وجوود:** بوون. **ئەم دیوە :** ئەم بینیوە،نەبووە. **بیفرۆشن :** بیفرۆشێتن. **بە سعری :**بە نرخی سی و چوار: 34 یان سێ وە چوار.

**لێرە :** لێرانە،لەم کاتەدا : **قوربان :** ئەزبەنی . **چشتی وا:** شتی ئاوا . **سەبر :** شەکیبایی .پشوو . **زۆر :** پڕ ، زیاد ، فرە . **پێیدەوێ :** دەیەوێ .**ئیمرۆ:** ئێستا ، ئەورۆ **نیمە :** نیوە. **نیمەیەکی تر :** نیوەیەکی تر **سبەی :** ڕۆژی دا هاتوو . **تایەک دوبار :** تادەبێ بە دووبار.**چونکە :** لە بەرئەوەی . **حەققی :** مافی. **تور و سلق :** توور وە سلق جۆرێکە لە سەوزیجات ودەخورێت **قەسپ:**خورمای دەنک دەنک.**سابوون :** هەمان سابوونە . **دەزوو :** نەخ ،داوێکی فرەباریکە بۆ دورمان بەکاردێت .

**فەللاح :** جوتیار،وەرزێر **ئەسلەن نەبووە :** بە هیچ جۆرێک وا نەبووە . **دوو لۆری :** دوو ماشێن ، دوو سەییارەی گەورە. **هەبێ :** بیبێ . **لێرە:** لێروکانە **بیفرۆشێتن :** بیفرۆشێ.**سعر :** نرخ . **دیار :** ڕوون ، مەعلوم. **عەرد:** خاک . **ئاش:** شوێن و ئامرازی دانە وێلە هارین و ئارد دروست کردنە . **باراش:** ئەودانەوێلەیە کە تەنیا بەشی نان کردن و خواردنە. **جوتیار :** فەللاح . **غە ریب :** بێکە س ، نامۆ ، غەوارە،بێگانە . **قەت :** هەرگیز . تەنیا :تەنیایی،بە تەنیا.نابێ:نابێت.بەردانگ:بەو پارچە زەویەکەمە دەلێن کە جوتیار دەیچێنن و تەنیا بەشی خودی وەرزێر دەکاتن بۆ باراشی مال و مندالانی خۆی و لەوەی زیاتری نیەکەتەنیا چەند قەسناغێک تۆ دەکاتن.نەک:نەوەکو،نەبادا.

لەوێ بۆی نێتە خوار:واتە ئەو جوتیارە هەژارو کەم دەرامەتانە هەر ئەوەندەیان هەیە کە بەری بەردانگێکەو ئەوەندەی کە هەیەتی و دەستی دەکەوێت هەر بەشی باراشی مال و مندالانیەتی و لە خۆیان زیاتر نیە کە بیفرۆشن و چەند تەنێکی لێ دەربچێت.

**تالیعی :** بەختی. **دەشتی :** نازناوی شاعیرە.وەک :وەکو. ئەم دەشتە:مەبەست دەشتی ڕەنگینی کوردستانە.بێ تالع:بێ شانس و بەخت.وایە:وەهایە.بۆیێ:لە بەر هەندێ. **ئەمر:** فەرمان.لە بۆ هات:بۆی هات.نەی بوو:نەیتوانی ،پێی نەکرا. **چەچار:** هیچ چارەیەک.

**مانا بە گشتی** :

ئەی ئەو کەسەی کە هەمیشە بەرز و سەروەر و هەردەم هێژا و مەزنی و لە کاتی پێویستیدا سایەی بلندت هەمیشە وەک دار چنار بلندە و هیممەتت

PDF 4 KURD



جێـگەی خۆی دەگرێت و سود دەبەخشێتن و لە کاتی گەرماییشدا سایەی فێنکت و شادی دەبەخشێت و لە کـاتی سەرماش دا ما یەی گەرمی و گوڕیت و وەک داری چنار هەمیشەسەر بەرز و پڕ لە هیممەت و تواناییت ، لە دوای ڕێـز و خۆشەویستی و هەوال پــرسیتتان ،وا وەرامم پێتان ڕا دەگەیەنم دەربارەی ئەو فەرمانەی کە بۆ جێ بە جێ کرنی بەنامەپێم گەیشت و وا بۆبەڕێزتانی ڕوون دەکەمەوەو پێتان دەلێم ، لە سەر ئەو داوایەی کە جەنابتان کردبووتان ،لە دوای پـرسینێکی زۆرەوە کە لـە لایەن زۆر کەسان گەڕام و گەلێکم پرسی بۆ کڕینی ڕاسپاردەکەتان، بە داخەوە کەسێکم بۆ نەدۆزرایەوە کە ئەو ڕادەیەی هەبێت و ئەوسا بەو نرخەی کە فەرموبوتان بیدات و بیفرۆشێتن ، قوربان لێرەدابۆ کارێکی ئاوا لەم کاتەدا سەبرێکی زۆری پێ دەوێت تـــائەو ڕادەیەی کە فەرموبوتان پەیدا ببێتن ، ئەمرۆکە نیوە و سبەی نیوەیەکی تـر تــا دەبێـتە یەک دوو بار ، کە ئەمەش زۆری پێ دەوێتن چونکە هەقی توور و سلق وسابــوون و قەسپ و دەزووی جوتیاران ماوەیە کی دەوێتن تاوەکۆ دەبێت بە تەنێک ،خۆ ئەو کەسانەی کە جوتیارن قەت وا نەبووە کە دوو لــۆریان دەغل و دان هەبێتن ، ئەوساکە بە نرخێکی دیاری کراو بیفرۆشێتن ، چونکە وەرزێــری هەژارو بێکەس ئەوەی کەهەیەتی تەنیا تۆی باراشە و بەشی گوزەرانی مال و مندالانی خۆیەتی و جگە لەوەش شتێکی تری نیە کەلە خۆیەوە زیاتر بێتن و ئەوسا بەو نرخەوە بیفرۆشـێتن ، خــۆ شانسی دەشـتی وەک بەختی ئەم دەشت و خاکە وایەو هیچ چارەیەکی نییە تا بتوانێتن و ئەوفەرمانەی کەلە بۆی هاتووە وجی بەجێی بکاتــن و وەدی بێنێت ، زۆر بە داخەوە ئەو کارەی کەبەرێـــزتان لە منتان داوا کردبوو نەمتوانی ئەنجامی بدەم و جێ بەجێی بکەم .ئم شعرەی سەرەوە وەک نامەیەک بۆبەڕێزو هێژاو نەمر شـــیخ محێدینی بەرزنجی کە کەسایەتیەکی ناو دار و لە پیاو ماقولانی شاری هەولێری دێرینە نوسراوە،ئەمەش لەوەرامی نامەیەکی ئەو بەڕێزەدا کە بۆ دەشتی ناردوە و داوای لە دەشتی کردوە کە هەندێ گەنم و جۆو دانەوێلەی لە ئاوایی دارەبەن بۆ بکیێتن ، ئەویش لەبەر ئەوەی کە ئەو میقدارە گەنم وجۆیە زۆر بووە،دەشتی ڕاستەو خۆ نەی توانیوە جێ بەجێی بکاتن،بۆیەکە بەو شیعرەی سەرەوە وەرامی دۆستی لە مێژینەو خۆشەویستی خۆی شێخ محیەددینی بەرزنجی داوەتەوە شێخ محیەدینی بەرزینی دۆستێکی دلسۆز و خۆشەویستی دەشتی بووەو لە پێش ئەوەی کە دەشتی ببێتەمەلای ئاوایی دارەبەن ، زۆرجاران کە فەقێ بووە لەمانگی ڕەمەزاناندا بووەتە مەلای مزگەوتی شێخ محێدین و هەر ئەو بەڕێزەش لە گەل شێخ مستەفا نەقشبەندی خوا عەفویان بکاتن بوونەتە هۆی ئەوەی کە دەشتی ببێتە مەلای گوندی دارەبەن،دەشتی ڕێزێکی تایبەتی لە لایەن ئەو هەرد و زاتە نەمرانە واتە شێخ محێدینی بەرزنجی و شێخ مستەفا نەقشـبەندی و تەواوی زاناو دانیشمەندەکانەوە جێگەیان بە هەشتی

بەرین بێتن هەبووە،دەشتیش ڕێزێکی تایبەتی بۆ ئەوان هەبووە و زۆری خۆش ویستوون،ئەوانیش دەشتیان وەک زانایەکی ئاینی و نیشتماتنپەروەر هەمیشە ڕێز لێ ناوە و خۆشیان ویستووە. دەشتی لە سەرەوەی ئەم شیعرەدا نوسیویەتی و دەڵێت :

**گفت و گۆی دەشتی لە جەواب ئەمرنامەی سەعادەتی شێخ محیەددین بەرزنجی لە بەعزێ خسوس دا.**

ئەوەش یەکێکە لەو نامە هۆنراوەییانەی کە دەشتی نوسیویەتی و لە ڕۆژگارانی خۆی دا گەلێکی لەم جۆرە نامانە بۆ کەسایەتیەکان نوسیوە .

*

PDF 4 KURD



## ئەی ئەوکەسەی بی میسلە

ئەی ئەو کەسەی بێ میسلە لە ئەتــراف و جەوانیب
وەی ئەو کەسەی بێ شـیبهە لە ئەغیار و ئەجـانیب

ئــەی عالیمی ئەم عیلمــە کە مـەوجودە ئەوێستا
وەی مەعدەنی عیلم و فـەلە ک و مەنتـیق و واجیــب

بـۆ ئەسـپـی فەسـاحەتیا چ سوارێکە لـە مـەیـدان
ئەی عیلمی بەلاغـەت ئەسـەر و رەحمەتی واهیـب

کورســی لەجـەفــا دایە، بەوە لەوحت لە حـــــەولدا
بەم سێ کــورە لەوح و قەلەمت خســتە ڕەواتیـب

هەردەم لە تیجــاراتی ئــەحــادیسی شـــــەریفی
بــۆ تالیبــی مـەفهومیی و ئــەلــفـاز و قـــەوالیب

ئەی شـێری دەس وپـە نجــەیی ئەسبابی زەکـاوەت
گـوێ ڕاگـرە لەم عــەرزە کـە ئەیکەم بـە زەرائیـب

مەعلوومە ریــا مـەقسـەدی دەشــتی نیــە ئەمما
جـەوهەرا ئــەفرۆشێتە کــەڕەمـگـاهــی مـەواهیب

*

---

**مانای وشەکان**:

**ئەی : وەی** ئامرازی بانگ کردنە. **ئەو کەسەی:**ئەی کەسێکی . **بێ :** بە بێ **میســـل :** بێ وێنە .**ئەتراف :** دەورو بەر ، هەرچوارلا .**جەوانیب :** هەرچوارلاکان،ئەملاو ئەولا.

**وەی :** ئەی. **بێ شوبە:**بێ وێنە.**ئەغیـار:**خەلکی تر کۆی غەیر بێگانە. **ئەجانیب:**بیگانە.کۆی ئە جنەبی.نامۆ.

**عالم:**زانا .دانیشمەند. **عیلم:**زانست. **مەوجودە :** هەیە .**ئێستا:**هەنوکە ئەم کاتە.

**وەی:** ئەی .**مەعدەن :** کانی ، سەرچاوە.**عیلم :**زانست . **فەلەک:** گەردوون . **مەنتیق:** لۆگیک ،زانیسنێکە تەرازووە بۆقسەی یاست و یەوان گوتن.ناوی ئەو

PDF 4 KURD



عیلمەیە کە مرۆ بە زانینی یاست و یەوان دەبێژێت و دوور لە هەلە کردن دەبێت.
**واجیب:** پێویست ، دانشی خوا نــاسی .
**ئەسپ:** لێرە یەوانی گوتن بە ئەسپ تەشبیە کراوە.**فە ساحەت:**یەوانــی یاست
**سوار:**کەسێ کە لە سەرئەسپ یان ولاغێکی ترسوار ببێت سواری پێ دەلێن.
**مەیدان:** هەلێر،چەق ،مەرکەز،هەلێر.
**عیلم:**زانست ،دانیش .**بەلاغەت:**فەسیح،یەوان،زانستیەکە کە مرۆ بەو زانینە و زانستیە لە ووتارو قسەکردن و نوسین دا بێ هەلە دەبێت و یاست و یەوانگۆدەبێت،یەوان بێژ.**ئەسەر:**نیشان،گۆتن ، هەوال ،ئەوەی کە لە پاش کەسێک بەجێ بمێنێ . **ی**ە**حمەت :** میهرەبانی ،سەخی، لێخووٚش یوو، بەخشین .
**کورسی:**تەختی لە سە ر یونیشتن، **جەفا:** یەنج ، ئازار. لەوح **:** تەخت .
**حەول:** دەور و بەر،گــۆیان .
**بەم سێ کویە:**بەو هە رسێ دانیشەی کە لەوپەیی شارەزایی و زانین دایەکە (زانستی،1- فەلەک 2- مەنتیــق 3- واجیبە). لەوح: تەخت . **قەلەم :**پێنوس .
**خستە:**بە جێت هێنا ، داتــنا.**یەواتیب:**کۆی راتیبە.جیرە،معاش. **هەردەم:** هەمیشە، هەمووکاتێ.**تیجارات:** کۆی تجارەت بازرگانی.**ئەحادیس:** کۆی حەدیسە،قسەوباس گوفتار،ووتە. شەریف: پاک ،یاست،هێژا، خاوەن شەیەف.
**بۆ تالیبی:** بۆ خواستن، بۆ داواکردن،بۆ قوتابی . مەفهوم: دیار، ئەوەی کە تێی دەگەی،مەعلوم.**ئەلفاز:** کۆی لەفزە،وشە ،ئەوەی کە بەزار دەیلێن.**قەوالیب:**کۆی قالیبە،تەن ،داییژراو، پوخت دەرهێنراو.
**ئەی شێر:** ئەی وەک شێر. **دەس وپەنجە:** دەست و پەنجە. **ئەسباب:**کۆی سەبەبە، هۆ. **زەکاوەت:** زیرەکی ، تێگەیشتوو.
**گوێ یاگــرە:**گــوێ بگــرە.**لەم عــەرزە:**لەم داوایــە،لەم گۆتنە . **کە ئەیکەم:** کەوا دەیکەم . **بە زەرائیب :** بە چەندان .(یان مەبەست باجە.)
**مەعلوم:**دیار ،یوون،ئاشکرا . **ییا:**چاپلوسی،خۆیەپێش خستن . **مەقسەد:** مەبەست .**دەشتی:**نازناویی شاعیرە.**ئەمما:**بەلام.
**جەوهەر:**گەوهەر، هەمووشتییکی بە نرخ،لێرە مەبەست وتەی بە نرخە.**ئەفرۆشێتە:**دفرۆشێ بۆ .**کەیەمگاە :**شوێنی سەخاوەت، جێگای دلێری و گەورەیی. **مەواهیب:**کۆی مەوهبە **:**شوێنی بەخشین ،ئەوەی کە بە یەکێ دەدریت .

---

مانا بە پشتی

ئەی ئەو کەسەی کە لە زانست و زانین و لە هەموو رووێکەوە لەو ناوەدا بێ وینەی و کەسێکی وەک تۆ لەناو بێگانەو خەلکانی تر پەیدا نابێت و نیە، ئەی ئەوکەسەی کە زۆر زانای و سەرچاوەی هەمووئەو زانستییانەی کەوا ئێستا لە کایە دایە، لە زانستی فەلەک ومەنتیق واجیب دا بێ وێنەی وئەوەندە بلیمەت و

PDF 4 KURD



سوارئەسپێکی چـاک و لێ هاتووی کەلە مەیدانی زانایی وبلیمەتی و رەوان بوونت دا بێ وێنە و بێ هاوتای،ئەی ئەوکەسەی کەوا گەلێ سەرکەوتوانە زانستی بەلاغەت دا ئەسەر بە کەسانی تر دەبەخشی و مایەی شانازی و سەربەرزیت و لەهەموو بوارێک دا بلیمەت و شارەزای لە تەواوی زانستەکان دا،تۆی کەوا گەورەیی و زانا بوونت هۆی هەمیشە سەربەرزی و سەرفیرازیە لەو ناوەیەدا،تۆ بە توانای زانایی و شارەزایی خۆتا شادی و خۆشـــیت هێناوەتە کایەوە و سەرفیرازیت نوانـــدووە و هەمیشە گفت و گۆو و دایشتنی وتەی بەرز و یوون ویەوان و لە بارو پـــی لە نرخ و جوانیتان بووەتە باس و خواس و جێی سەربەرزی هەموو کەسایەتی ولایەنێک، ئەی ئەوکەسەی کە لە زانین و زانستی مەنتق و فەلەک و واجیب دا وەک شێر وای و زیرەکی و ناوی تۆیە کەوا هەر بلند دەبێتەوە ، دەساتۆ گوێم لێ یابگرە لەوەی کەوا من دەیلێم و پێشکەشت دەکەم و بۆت یوون دەکەمەوە ، ئەوەش بزانە کە مەبەستی منی دەشتی لێرەدا بۆ هیچ خۆ بەپێش کردن و بیاییبەک نیە، تەنیا ئەوەیە کە دەمەوێت دوریوگەوهەران پێشکەش بە ئێوەی مامۆســتاو زاناو ســەرچاوەی سەخاوەت ومەردایەتی و زانــیاری و زانستەکان بکەم .

ئەو شیعرەی سەرەوەی دەشتی بریتیە لە ستایشی ماموستای نەمر وبەرێزو زانا ماموستا مەلا عەبدوللا مەلا موحەممەد ئەمین بێتواتەیی کە لە کات و زەمانی خۆی دا ماموستایەکی دانیشمەند و زاناو شارەزاو مەلای مزگەوتی حاجی قادر لە هەولێر بووە ، ئەو ماموستایە زاناو بلیمەتەکوردە گەلێ زاناو کەسانی دلسوز و نیشتمانپەروەرانی پێ گەیاندون و زۆری خزمەت بە ئاینی ئیسلام و زانست و زانین کردوە و دەها کەسانی وەک دەشتی لە لایەن ئەو سەروەرەو بەیێزە ئێجازەی مەلایەتیان وەر گرتوەو بوونەتە چرای یێنیشاندان و پێشکەوتنی یۆلەکانی گەلی کورد و کوردستان ، هەتا توانیویانە لە یۆژگارو زەمانی خۆیان دا خەباتیان کردووە و لە بواری زانست و زانیاری دابۆ بەرەو پێشەوەچونی ژیانی کۆمەلایەتی کوردەواری هەرگیز کەم تەرخەمیان نەکردووەو لە یێگەی خوا ناسی و دلسۆزی بەگەل و وەلاتی شیرینیان ، هەمیشە بۆ میللەتە چەوساوەکەیان چرایەکی پیشنگنداری یێگەی خۆشبەختی وسەرفیرازی بووینە،باوک و باپیرانیان لەو یێگەیە پیرۆز و مەزنەدا خۆیان بەخت کردووەو چرای یێنیشاندان و یوناک کردنەوەی یێگەی بەختەوەری کوردو کوردستان بووینەو لە یۆژگاران و زەمانی خۆیان دا بەوپەیی شانازیوە تێکۆشاون،دەشتیش کە ماوەیەکی زۆری لە لایەن ماموستا مەلا موحەممەد ئەمین و دواییش لە لای ماموستا مەلا عەبدوللای کویی ماموەستا مەلا حەمەدئەمیی بێتواتەیی نەمر دەرسی خوێندووە و گەلێ لە پەیتوکەکانی دوا ماددەکانی وەک شەریعەت و سەرف و نەحوو وبەلاغە و مەنتیق وفەلەکیات و بەیان و زانستەکانی تری لە لای ئەو ماموستایە زاناو هێژایە و بەیێزە دا

PDF 4 KURD



خوێندووە،هەر لە لایەن ئەو سەروەرە مەزنەدا لە مزگەوتی حاجی قادر لە شاری هەولێر ئێجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و ئەوسا بووەتە مەلا،جا بۆ وەفا و دلسۆزی ئەو ماموستایە بلیمەت و دانیشمەندە و بۆ بیرەوەری و یادی ئەومرۆیە مەزنەو بەیێزەوە ئەو شیعرەی سەرەوە و یەک دووشیعری تری بە زمانی عارەبی و فارسی لە ستایشی ماموستای گەورە و بەیێزی خۆیا نوسیوەتەوە،کە دەشتی لەم جۆرە نامە شیعریانەی زۆرن،هەزاران سلاو لە گیانی پاکی ئەو زاتە نەمرانەو هەموو ئەوانەی کە لە پێگەی زانیاری و زانست دا خزمەتیان بە گەل و نیشتمانیان کردووە و هەمیشە چرای یوناک کەرەوەی ژیانی شادی و بەختەوەری کورد و کوردستان بووینە.

*

PDF 4 KURD



# ئەی دڵ

ئەی دل وەرە سـەر جەدوەلی پرگاری موحەممـەد
دائیم بـە دەلائیل بکە دەعـوایی موحـەممەد
دوڕ و سـەدەفی وەحدەتـە ئـەنـواری موحەممـەد
غەوواسـە لە عـوممانەوە ئەلقـابـی موحـەممەد
لەولاکـە ئیـلا مـەرکـەزی ئـەفـلاکە موحەممـەد

شاهێکە لەسـەر تەختی نبووەت لە خـوداوە
کورسیی و قەلەم عەرش و سـەما ڕوو لـە سـەماوە
ئیدریسی عەدەن حوور و مەلەک دەس بە دوعـاوە
ئەی خوایـە بە ڕووح و بـە جیسم بێـنە سـەماوە
ئەسـرایە دەسـا شـاهـدی میعـراجی موحەممەد

ئـەی ئەو کەسـە رەیبی هەیە لەم زاتە بە ناهەق
پرسن لە ستەخەر کێ بوو ئەتـۆی کردە موعـەللەق
پرسـن لە قەمەر کێ بوو ئەتۆی کردە شـەق و لەق
مـەعـلوم ئـەبولقاسـمە ئـەلێن موعـجیزەتـولحەق
سـا ڕوکنە نیشـانـەیی سـەرشانەیی موحەممـەد

بـۆئـەووەلـی بـیعسەت لەسەرکورسی بوو زهـووری
بـۆ سـەلبی تـەعـەللوم بـیسـمی ئیقرەأبە حوزووری
بۆ سـەلبی تەئەددوب لە چ کەس مورشـیدە نـووری
ئەی ئەو کەسـەی کە غەففاروسەببارو شەکـووری
ڕوحم بکە قـوربانی قـەدەمـگاهی مـوحەممـەد

گولزاری فەسـاحەت بـووە جێگەی تەڕەبـی ئـەو
ڕەیحانی بـەلاغـەت بووە ڕێگـەی عـەقـەبی ئەو
ئیعلامی نەجابەت بووە سـەیـوانی سـەری ئـەو
ئیقدامی سـەخاوەت بـووە ئـەیـوانی دەری ئـەو

PDF 4 KURD



ئـەڕقـامی شـەجـاعـەت بووە میــرانی موحەممـەد

ئـەی ســـــەییدی جاری لەدەس و پەنجەیە كەوسەر
بـــۆنەسبی عەقیدەی دل ئەســحابـەیەمـوخـــەییـەر
ئەو ڕەحمەت و ئەو مـیننەتـی مەنـــــانە لە دەفتـــەر
بۆخەلقی هەموو شــــت ئەوە باعیس بووە جـەوهـــەر
مەعـلومـە لــە ئـایـات و ئـەحــادیسـی موحـەممەد

هەردەم كە ئــە ســــووتێم و هەمـوو خوێنە هەنـاوم
بەم چاوەی بە لیشـــــــاوم و بەم جــەرگەی بــڕاوم
بـــەم حــالــەی پـەریشـانم و بـــەم مالەی مـاوم
بەم پشتی قەفەس جێگــــەم وبەم چۆكەی شكـاوم
وا چـــاكە كە دەشـــتی ببی مــەجنــونی موحـەممەد

**مانای وشەكان** :

***ئەی***: وشەی بانگ كردن و هاوارە . ***دل*** : قەلب . **وەرەسەر**: وەرە بالای.
**جەدوەل**: یوبار ، بەو چەندهێلە ستونی و ئاسوییەش دەلێن كە خشتەیەكی لێ دروست دەبێت. **پی**:تەژی. **گـار**: پاشگرە و مانای ئامۆژگاریش دەدا.
**موحەممەد**: ناوی دوا پەیامبەری خوایە درودی خوای لە سەر بێت.
**دائیم**:هەمیشە، هەردەم.**دەلائیل**:كۆی دەلیلە،بەلگەكان ،بەلگە . **دەعوا**: داوا.
**موحەممە د**: ناوی دوا پەیامبەری خوایە(د).
**دەر**:دەرگا،یان فارسیە بەمانای لەی كوردی دێت .**سەدەف**:شوێنی تێدا یسكانێ مرواریە،گیانداركی دەریاییە لە دەروونی خۆیدامرواری دروست دەكات.
**وەحدەت**:یەكێتی . **ئەنوار**: كۆی نوورە:واتە یۆناكی موحەممەد ناوی دوا پەیامــبەری خوایە (د).
**غەوواس**:كەشتی ژێر دەریایی . **عومان** : مەبەست دەریاوكیشوەری عومانە.
**ئەلـقاب**: كۆی لەقەبە:واتە شـوەرەت . **موحوممەد** : مەبەست ناوی دوا پەیامبەری خوایە (د).
**لەولاكە**: ئەگەرنەبی . **ئیلا**:بۆ.مەركەز:چە ق ، ناوەند،هەلێر . **ئەفلاك**: كۆی فەلەک ، و اتە گەردوون . **موحەممەد**:مەبەست ناوی دوا پەیامبەری خوایە(د).
**شاهێكە**: مەلیكێكە ، پادشاهێكە **تەخت**:كورسی **نبووەت**: پەیامبەرایەتی .**لە خوداوە**: لە یەزدانەوە، لە پەروەردیگارەوە.
**كورسی**: تەخت. **قەلەم**: پێنوس. **عەرش**:تەخت،سەریر یوكن، سەقف.بارەگا.
**سەما**:ئاسمان ، حەوا ، سەماوە:هەلپەیین.گۆوەند،شایی .

PDF 4 KURD



**ئیدریس:** ناوی پادشای عەدەنە. **عەدەن:** بەمانای هەمیشە لەشوێنێک بوونە ، بۆ ئەوەیەپێی دەڵێن بەهەشتی عەدەن کەمرۆ بۆهەمیشە لەوێ دەبێت . **حۆری:** پەری **مەلەک:** فریشتە .**دەس بە دوعا:** دەست بە نیایش و پایانەوەبۆ خوا.
**ئەی خوایە:** ئەی پەروەردیگار. **بەیووح:** بە گیان. بە جسم **:** بە جەستە. **بێنە:** بیهێنە. **سەماوە:** ئاســمانەوە. **ئەسرا:** ناوی ئەو سووڕەتەیە کە لە قورئانداییە و باسی چوونی پەیامبەرلە شەوی میعراج بۆخزمەت خوا دەکاتن .
**دەسا:** جا. **شاهید:** شایەد، بەلگە. **میعراج:** ناوی ئەو شەوەیە کە پەیامبەرتیادا چووەتەئاسمان بۆ بارەگای یەزدانی مەزن. **موحەممەد:** مەبەست دوا پەیامبەری خوایە(د). **ئەی :** وشەی بانگ کردن .**کەس:** شەخس . **یەیب:** گومان، شەک.
**زات:** مرۆی مەزن
هێژا،گەورە ئەم وشەیە بۆ کەسانی مەزن و باش وموبارەک وپیاو چاکان بە کاردێت .**بەناهەق:** بە نایاست ،بە نادروست.
**پرسن:** بپرسن **سەخەر:** بەردە یەشەی مالی خوا کە لە مەککەیە **کێ بوو:** چ کەسێ بوو. **موعەللەق:** یاوەستاو لە حەواوە، هەلواسراو.
**پرسن:** بپرسن قەمەر**:** مانگ. **ئەتۆی:** تۆی. **شــەق:** کەرت . **لەق:** شل،بە پێچوانەی توند.
**مەعلوم:** دیار،یوون،ئاشکرا. **ئەبولقاسم:** باوکی قاسم ،کە ئەویش پەیامبەری خواموحەممەدە (د).
**ئەلێن:** دەبێژن ،ئێژن. **موعجزە:** کارێکی گرنگ کە خەلکی تر نەتوانن ئەنجامی بدەن. **حەق:** یاست،یەوا.
**یوکن:** گەورەیی،پایە وستون،یابەری میللەت،لای گەورە وبەهێزی هەر بەشێک .
**نیشانە:** یەمز. **سەرشان:** لە سەر شـان . **موحەممەد:** ناوی دوا پەیامبەری خوایە(د).
**ئەووەلـی :** یەکەمی **بیعسەت:** ناردن ، ریسالەت **بووە:** هاتۆتە کایەوە. **زهووری :** دیارکەوتنی ، پەیدابوونی.
**بۆ:** لـۆ،لە بەرچی .**ســەلب:** وەرگرتن ، جیاکردنەوە. **تەعەللوم :** فێربوون.
**بسمی :** بە ناوی ،**ئیقرەأ:** بخوێنە،ناوی یەکەم سـویەی قورئانە کە بۆ پەیـامبەر(د) هاتۆتە خوارەوە. **بە حزووری:** بۆجەنابی،بۆ پێشگاهی وشەی گەورەییەکە بۆ ناوی مرۆیانی مەزن بەکار دێت.
**بۆ سەلبی:** بۆوەرگرتنی ،بۆجیاکردنەوەی شتێک لەشتێکیتر،فیاندن . **تەعەللوم:** فیربوون **لە چ کەس :** لەکێ **: مویشید:** یابەر ، نمایەندەی یاست پاک . **نوور:** یۆناکی .
**ئەی:** وشەی هاوارە، **ئەوکەسەی :** ئەوەی ،ئەوزاتەی. **غەففار:** یەکێکەلە ســیفەتەکــانی یەزدان،زۆرلێخۆشبوو،لێبوردو. **سەببار:** یەکێکە لە سیفەتەکانی .

PDF 4 KURD



بە فیرۆ دەیوات و دوژمنان وادەیبەن وتالانی دەکەن ، گەلی کوردیش هیچ سوودێکی لێ وەرناگرێتن و لێی بێ بەشە، هاکا بینیت دیسانەکە نەیاران و دوژمنان بۆ پەلامار دان و شەیی کورد وکوردستان هاتنەوە، هەر بۆیەشە و لە بەر ئەوەشە کەوا دلی من هەمیشە پی لە پەژارەو رەنج و ئازارە و بۆ پێشکەوتن و گەیشتن بە پیشەسازی و فرۆکە دروست کردن و یوو لە ئاسمان کردن وبەرەو پێشەوە چوونی زانست و تەکنیک و زانیاری لە کوردستان دا وا هەردەم داد و هاوارو فیغانیەتی ، دەسابەسە چیتر ئاوا بێ سود و بێ کەلک مەوەستن ،وا ئەمیۆکە یۆژی بەسەر کەوتن و یۆژگارانی پێشکەوتن و سەربەرزی میللەتانە ، تاکەی ئێوەش ئاوادوا کەوتووو نەزان و هەروا لە داواوە دەبن و بەم شێوەیە وا بێ بەرهەم و سود بۆ میللەتی کورد دەبن ، بەسیەتی چیتر ئاوا خۆتان مەخافلێنن وچیتر بەم شێوەیە نالەبارە بەبێ سودوقازانج بۆ کورد و کوردستان مەبن،ئەمیۆکە یۆژی ئەوەیە کە خۆتان وەدەر بخەن و ئازادی و سەربەخۆیی وەدەست بێنن وکوردستانی خۆتان یزگار بکەن بەسە هەتاکەی وا بەم جۆرە چاو دادەگرن و چەوساوەی دەستی نەیاران و داگیرکەران دەبن،ئەمیۆ یۆژی هەول و خەباتە یۆژی یاپەیین و رزگار بوونی گەلانە لە ژێرچنگی داگیرکەران ونەیاران دا، وا دلی منی پی لە ئازار و خەم لە تاو سینەمای دەنگدارو سیمای پێشکەوتن وزانیاری سەرچاوەی شارستانیەتی و پی لە پێشکەوتنی ئەم یۆژگارە بێ هەست ونستەوە لە ناو خەم و یەنج و نەهامەتی دایە.

ئەی یۆلەکانی گەلی کورد هەتاکەینی هەرئاوا بە دوا کەوتویی و نەزانی دەمێننەوە،تاکەی داسوک و تەورداس و پێمەیرە ئامرازی سەرەتاییەکانی کار و کاسبی ئێوە بێتن،تاکەی ئاوا بێ پارەو پول ونەدار دەبن و ئاوا لەبەر داگیرکەران دەست پان دەکەنەوە ولێیان دەپاڕێنەوە،هەتاکەینێ ئەم نیشتمانە جوانەی خۆتان لە ژێر چنگی داگیرکەرانی بریـــتانی و سویسرایی یزگار ناکەن ،کوردستانمان وا کارەبا و فەنەرگاز و ژیانی پی لە پێشکە وتن سەربەرزی و سەرکەوتنی دەوێتن .وا ئەمیۆکەکارەباو نەوتی یەش لە جیهاندا دەسوتێتە وەو دونیای یوناک کردۆتەوە، وا ئینگلتەرەش هاتووە و هەموو سەروەت و سـامانێکی ئیمەی بردوو و لێی زەوت کردووین و وەلاتی خۆیانیان پێ بەرەو پێشەوە برد ،ئێوەش وا لە هەمووکاتێک دا سەر ومالتان لە گرەوی ئەوان دایە و خاوەنی هیچ سەروەت و سامانێکی میللی خۆتان و شتێک نین ،بۆیەوا دلی من وەک کەباب برژاوە وو هەمیشە دەسوتێت و زۆر پەرێشان و پەژارەدار و پی لە یەنج و ئازارم، ئەی گەلی کورد سەیرێ بکەن و بیوانن وا لۆکەی نیشتمانی ئێوەیە ئەمرۆکە دەکرێتە دینار وبووە بە پارە و پول و دارایی، وا گیانی نیشتمانی ئێوەیە ئەمیۆ بووەتە ئەم فلسەپی لە نرخ و یەواج دارەی کەمایەی ژین و ژیانی ئەمیۆکەیە وپی لە نرخە و کییاری زۆرەو پی لە بییارە، دەشتی کەوا ئەمانە دەبێنێ و وەلاتیشی ئاوا بێکەس و سەر و سامانەو ئاوا

دوا کەوتووە بۆیەکەیە وا هەمیشە خەمبار و دل پی لە ژان و دەرد و یەنج و ئازارو جەفایە.

*


PDF 4 KURD

PDF 4 KURD



## بەو پاکیەی زولفت

بەو پـــاکیەی زولفت دلـەکـــەم پـاکیـــە ئیمـڕۆ
بەم پـاکیە بێ ئـــارەقـــە ئارەق نیـــە ئیمـــڕۆ

وا چاکە لە جـــــادوویی ڕوخت بێیتە نیشـانەم
ئاوور لە هەناسـەم بـووە سەم زامی تـۆ ئیمـــڕۆ

بەم موعجزە حەققی دلە دەعـوایی عیشـــق کـا
بەیـــنی مـــــوژەکانم بووە سۆراوی تـــۆ ئیمـڕۆ

لەم ڕۆژەوە سـۆلی تـۆ لەسەرســـــەر ئەخشێنم
ڕووحم لە ســـەفا کەوتە جـــەفا تـــاوەکوو ئیمڕۆ

سەد دەردو دووسەد میحنەتە هەردەم لـە فـــیراقت
موحـــتاجی تـــەداویمـە بە لـــوقمـــانی تـــۆ ئیمێۆ

بـــێ مـــــــایەمە لەو وەقتەوە تالیب بـە دەری تۆم
ســەرمـایـەمە ســـووڕ مـاوە لـەمن داغی تـۆ ئیمڕۆ

خـۆ جـــەژنەیی قوربانی قـەدی بەرزی تـۆ ڕابـــرد
زالـم وەرە دەشـتی بـــووە قوربانی تـۆ ئیمـــــڕۆ

---

مانای وشەکان

**بەو:** بەم ، بەئەو،بەوجۆرە **پاکی:** خاوێنی .**زولف:** پرچ، بسک،کەزی . **دلەکەم :** دلی من .**پاکیە :** خاوێنە ، بێ گەردە ، دوورە لە گوناه . **ئیمـRۆ :** ئەمیۆکە ،( پاک جەژنێکیشە کە یەهودیەکان لە هەموو سالێکدا لە سەرەتای بەهاران بە یادی دەرچونی بەنی ئیسرائیلیەکان لە میسر.دەیگرن،واتە جەژنی پاک ، جەژنی فەسح کاتی خۆی کە دەشتی فەقێ دەبێت لە بێتواتەی خوێندوە و دلی بە کچێکی جوولەکەوە بووە و حەزی لێ کردوە، جا دەبێت کە لێرە دا مەبەستی ئەو جەژنـەی پاکی جووەکان

بێت ئەم شعرەی بۆ ئەو کچە دلدارەی خۆیەوە نوسی بێت کە لە ڕۆژی هاتنی ئەو جەژنەیـە دابووبێت ) . **بەم :** بەو، بەوشێوە ، بەو جۆرە. **پاکیە:** بەم جەژنەیە، بەم بێ گەردیە ، بەم جوانیە .**بێ ئارەقە:**بێ ماندو بوون ، بەو ئاوە دەلێن کە لە

PDF 4 KURD



جەستەی مرۆڤ دێتە دەرێ .**ئارەق:**ئارەقە کردن .**نیە:**بێ هەبوونە . **ئیمێ:** ئەویۆکە .ئیرۆکە .
**واچاکە:** واباشە،چێترە. لە **جادووی:** لە سیحری. **یوخت:** یووت، یوخسارت **بێتە:**بێتە ، ببێ . **نیشانم :**بەلگەم، دیاربێ.ئامانجم.
**ئاوور:** ئاگر. **هەناسەم:** پشووم . **بووە:** بویتە . **سەم:** ژەهر . **زام:** برین. **تۆ:** هون،ئەتۆ. **ئیمرۆ:** ئەویۆکە.
**بەم:**بەو،بەوجۆرە،بەوشێوەیە. **موعجزە:**کارێک کە هەموو کەسێ نەتوانێ بیکات سەر سوی هێنەر. **حەققی:** مافی . **دلە:** دل ،قەلبە. **دەعوایی:** داوایی . **عیشق کا:** دلداری بکات ، ئەویندار بێت .
**بەینی:**نێوانی.**مژەکانم:**مژەگانم ،برژانگەکانم ،**بووە:**بویتە . **سۆراو:**سووربووە، لە تاوان پی لە خوێن بووە سوور هەلگەیاوە **تۆ:**ئەتۆ،لە تاوی تۆ . **ئیمێ:** ئیرۆ،ئەمێۆ.
**لەم رۆژەوە:**لەو کاتەوە، لەو رۆژەوە.**سـۆل:**نەعلە،پێلاو،کەوش.
**لەسەرسەر:**لەبان سەر،لەترۆپکی سەر.**ئەخشێنم:** دادەنێم پیادەهێنم .
**رووحم:** گیانم. **لە سەفا:** لە خۆشی .لە شادی .**کەوتە:**بووبە، گۆیابە.
**جەفا:**ناخۆشی،رەنج و ئازاروخەم .**تاوەکو:** هەتاکو.تا،**ئیمێ:**ئەویۆکە.
**سەددەرد:**سەدئازار،دەردو ژانی زۆر.**دوسەدمیحنەت:**دوسەد رەنج،زۆر رەنج و خەم و ژانی جۆراوجۆر.**هەردەم:** هەمیشە. **فیراق:** دوور بوونەوە،لێک جیابوونەوە
**موحتاج:** پێویست . **تەداوی:**چارەسەری کردن ،هەتوان کردن. **لوقمانی تۆ:**پزیشکی تۆ ، دکتۆری تۆ.**ئیمێ:** ئیرۆ،ئەویۆ.
**بێمایەمە:**بێ سوود و مایەم،بێ دەرامەتم ،پەشێوم . **لەو وەقتە:**لەو کاتە ،لەودەمەوە **تالیب:** داواکار،داخوازی. **بەدەری تۆم:**بە دەروازەی تۆم ،پێویست بە تۆم .
**سەرمایەمە:** تەنیا سەرم ماوە لە بێتا دابنێم،هەیەتم ، ئەوەی کە هەمە .
**سـویماوە:** تەعەجوب ماوە .**سوورهەلگەیاوە:**پـیخوێن بووە. **لەداخی تۆ:**لە هەژمەتی تۆ، لە تاوی تۆ. **ئیمێ:** ئیرۆ، ئەویۆ.
**خۆ:**ئەوا،دەنا.**جەژنەیی:**ئاهەنگ و سەیران.**قەدی تۆ:**بالای تۆ.**یابرد:** بەسەرچوو،نەما.**زالم :** زۆردار.**وەرە:**بێ بۆئێرە. **دەشتی:**نازناوی شاعیرە. **بووە:**بوویتە. **قوربانی تۆ:**گیانبازی تۆ. **ئیمـێ:** ئەویۆ،ئیرۆ.

---

**مانا بە پشتی**

ئەی خۆشەویستەکەی من لە جوانی زولفی لە بارو پاک و بێگەردی تـۆدا دیارە کە ئەمـیو جەژنی پاکە، ئەمرۆکە، لەم یۆژەدا کەوا جەژنەیە،زۆر باش دیارە کە ئەم هەموو سیمای یازاوە وخاوینی لە باری تۆ ئاوا بە فیێو نایواتن،. جاباشتر وایە کە ئەم هەموو سیحر و جادویەی کە لە یووی تۆدا دیاری دەدات ببێ بە نیشانەی ئەوئاگرەی کەوا لە ناو هەناوو دەروونی من دا هەلدەقولێت و هەناسەی

PDF 4 KURD



پر لە ژارو ژانم لە تاو برینانی تۆینازدارم هەلدەمژم.، بەم هەموو جوانی وکارەسەر سویهێنەرانەی تۆیە کەوا هەقی دلە داوای دلداری بکاتن، وا لە تاوو حەژمەتی تۆدا نێوانی هەردوو مژەکانم پی لە خوێنی سوور بووە وهەرچەند دەکەم ئارام ناگرم .

هەر لەو یۆژەیا کەوا کەوشی تۆ لە سەر سەرم دا دەخشێنم و هەمیشە بە یادی تۆوە ژیانی شادی وخۆشیم لێ بووەتە ئازارو رەنج و نەهامەتی ، هەتا ئیمیۆکەش واگیانم پییەتی لە جەفاو سەدان جۆرە ئازار و گەلێ میحنەتی تەژی خەم و نەهامەتی ئەوەش هەمووی لە تاو دووری و جیابوونەوەی تۆیە کەوا پی لە ئازاروجەفاو مینەت و
دەرد و یەنجم ، هەر بۆیەشە کەوا پیویستیم بە تۆی لوقمانی خۆم هەیە کەوا بێیت و برینانم هەتوان بکەیت و چارەسەریەکم لێ بکەیت .

خۆ من لە وکاتەوە کە دلم بە تۆوەیە و داوای تۆی ئازیزم دەکەم ،هەتا ئەمــیۆکەش هەموو سەرمایەو ژیانێکم بێ سود ماوەتەوە و وا بە داخی تۆو لە تاوی تۆیە کەوا تەزیوم و ئۆقرەم نەماوە.
خۆ ئێستاکەجەژنی بە قوربان بوونی بەژن و بالای تۆ بە سەر چووە و نەماوە ، چونکە ئیمرۆکە وا منی دەشتی بومەتە قوربانی تۆ،دەسا ئەی زالم تۆش وەرەشـادم بکەو دلم لەم هەموو رەنج و ئازارو میحنەتانەدا رزگار و دلخۆش وبەختەو بەختەوەرم بکە و بە ئاواتی دلی خۆم بگەیەنە.

PDF 4 KURD



## بەریزەی ئەشکی خوینینم

بەڕێزەی ئـەشـکی خوێنینم کەواهەم تاق و هــەم جــووتن
لە نـێو بـــــــازاری ڕۆحـانی مەلائیک مــات و مەبهووتن

فــەلەک ســـەد دەورە ڕۆژی زیو لــە مێـزان دادەنیٚ بۆیــیٚ
گولستان وگول و شەوبـۆ لە بەختی من هەمــوو ســــووتن

تـەمـاشاکـەن لــەبــانی خونــچەیارم گـەر تەبەسسوم کا
لە نەزمی پــڕ سەدەفـیا چونکە زەمڕووتن لــە زەم ڕووتــن

چـراغی هــەم گـولـی بۆیــیٚ دەلــێن پـەروانەو و بـولبول
لە داوایی شەبی زولـف و بــەیــانی سینە پــەڕپــووتـن

دلی مەهجـــــوروغەوواسی دوو سەد جەیحون جەدەلبـازن
لە بــاسـی لێوی ئــالـی تۆ کە یــاقــوتن وەیا قووتـن

کەتــۆم نــاسی ئومێدم چوون بە جانی خۆم هەبـیٚ جـانا
کەزام و زەهـری بــیٚ ڕەحمی لـە دەرهـەق عاشقا خووتن

دەبیٚ ئەشتەر وەکو دەشــتی هیـلاکی فــیرقـەتـی تـۆبیٚ
ئــەگـەرنـا چـۆنە زولفی کـافوورت هەردەم لەسەر ڕووتن

*

---

مانای وشەکان

**بەییزەی:** بەیێچکەی ، بە یەک لە دوای یەکی ،بە زەنجیرەی. **ئەشک:**ئەسرین، فرمێسک. **خوینین:**خوێناوی ،پی لە خوێن . **هەمتاق:**یەک یەک ،تاک تاک.دانە. **هەم جووتن:**دوو دوون،جووتەن .

**لە ناو:**لە داخیل .**بازای:**شوینی کیین و فرۆشتن ،شوینی کۆبوونەوەی کییار و فرۆشیاران .**یۆحانی:**پارسا ، دانیشمەند و پێشەوای مەزهەبی . **مەلائیک:**فریشتە **مات:**بیٚ دەنگ ،سەرگەردان ،حەیران ،بیٚ شەوق ، تاریک،شێلو. **مەبهووتن:**سەرگەردانن ،سەرسویماون ،ماتن ، حەیرانن .

PDF 4 KURD



**فەلەک:** گەردوون ،دەورو زەمان .**سەد:**ژمارەی سەد. **دەورە:**گەیان و سویان بە دەورو بەردا. سویانەوە،خی. **رۆژ:**خۆر،**زیو:**تەشبیە بەفلزی زیوە ،**لەمــیزان:** لە تەرازوو. **دادەنیَ:**دای دەنیَ ،بونیاددەنی ،دروست دەکاتن.**بۆییَ:** لەبەرهەندیَ لەبەر ئەوە.

**گولستان:**گولزار،زەنویَر.**گول:**شکۆفەی کراوە .**شەوبۆ:**جۆریَکە لە گول ،ناوی گولە **لەبەختی من:** لە شانسی من .**هەموو :** خی ،گشت . **سووتن:** سوتاون .

**تەماشاکەن** :بنواین ، سەیرکەن . لەبان :هەردوو لیَو ،لیَوەکان .**خونچە:**گولی تازە پشکوتو. **یار:**دۆست .**گەر:**وشەی مەرجە ،ئەگەر.تەبەسسوم :پیَکەنین بزەی لیَوان .

**لە نەزمی:**لە پیَک و پیَکی ،لە ریکخستنی ، مەبەست ددانەکانیەتی . **پی:**تەژی **سەددەف** : مـرواری سپی گیان لەبەریَکی بچوکە کە لە ناو ئاودا دەژی **چونکە:**لەبەرهەندیَ .**زەمیووت** : جۆرە بەردیَکی نرخدارە کە بۆ جوانی و یازاندنەوەی زیَی بەکار دیَت و زۆر نایابە. **زەم:**بەخراپ پیَ هەلگوتن و باس کردن **رووتن:**بیَ زەمن، دوورن لە بە خراپ پیَ هەلگوتن .

**چراغ:**چرا،لالە،رۆناکی .**هەم:**هەروەها.**گولی:**خونـچەی کراوە. **بۆییَ:**لەبەرهەندیَ .**دەلیَن:** دەبیَژن،باس دەکەن .**پەروانە:** ئەوبالندە جوانەیە کەپەرو بالیَکی ،یەنگینی هەیە و لەسەرگول و گیایان دەنیشیَ و شیرەی گول و گیایان دەمژیَ هەروها جۆە بالندەیەکی بچوکیشە کە ئاشقی یۆناکی و شەم و لالەیە و شەوانە بەدوای روناکی دا دەچیَ و خۆی دەکاتە قوربانی ئەشـق و دلداری خۆی و پەی و بالی بە گیی ئەوینی خۆیەوە دەسوتیَنیَ . **بولبول** :هەمان بالندەی جوان و ئاشقی گولە، هەزارەشی پیَدەلیَن .

**لەداوایی:** لە داخوازی ، لە ویستی .شەبی:شەوی .**زولف:** پەرچەم و ئەگریجە،پرچ بسک .مووی سەر،**بەیان:**یۆناکی پیش خۆرهەلات ،شەفەق ، فەجر،سپیدە **سینە:**سینگ ،سەدر **پەیپووتن:** لەناوچوون ،تیَک و پیک چوون .

**دلی مەهجور:**دلی جیابۆوە،دوور کەوتووەوە،دلی غەریب.دلی نامۆ.**غەوواس:**ئەوانەی دەچنە ژیَر دەریاوە،ژیَر دەریاوان، مەلەوانان **دوسەد:** ژمارەی دوسەد.**جەیحون:**ناوی یوباریَکەلە خوارووی عیراق و ئیَران. **جەدەلبازن:** کەشمەکەشبازن،بەربەرەکانی کردن.

**لە باسی:**لە باس وخواس کردنی.**لیَوی:**لەبی.**ئال:**کال،سور. **تۆ:**.مەبەست یارە.کە **یاقوتن:**کەوا سورن وەک یاقوت وانە. **وەیاقوتن:**قوت بە مانی خۆراک هاتوە،هۆی ژیانن.

**کەتۆم:**کەوا تۆم ،بەست یارەکەیەتی.**ناسی:**ناسیم،ئاشناییم لەگەل پەیداکردی.

**ئومیَد:**هیوائارەزوو. **چوون:**یۆیی.**بە جانی:**بە گیانی . **خۆم:**خودی خۆم. **هەبیَ:**ببیَ،پەیدا بیَت.**جانا:**گیانەکەم .

PDF 4 KURD



**کەزام**:کە برین وزام.ژەهەر:ژهر،سەم.بێ یەحمی:بێ بەزەیی. **لە دەرهەق**:لە بەرامبەر. **عاشقان**: ئەویندااران.خوتن:عادەتتن.
**دەبێ ئەشتەر**:ئەشتەر ناوی یەکێ لە یارەکانی پەیامبەرە.**وەکو**:بە وێنەی.
**دەشتی**:نازناوی شاعیرە.**هیلاکی**:وێلی،ماندووی.فیرقەتی تۆ بێ:جیابوونەوەی تۆ بێ،ماندووی دووری تۆبێ.
**ئەگەرنا**:ئەگینا،کەواتە.**چۆنە**:کووە.**زولفی کافورت**:پرچی بۆن خۆشت،زولفی وەک کافورت. **هەردەم**:هەمیشە.لەسەر:لە بالایێ، وەسەر.یووتن.یوخسارتن.

---

**مانابە پشتی**

سوێندم بەفرمێسکی یەک لە دوای یەکی خوێناویما کەوا هەم تاک و جووتن و لە دیدەکانم دێنە خوارەوە،کەوا لە ناو بازایی دانیشمەندان و زانایان و فریشتەکان دا کش و مات وئارام و بێ دەنگی خۆی دەنوێنێ ، خۆ گەردوون وا بە سەد دەورو یۆژگارانی لە گەیان و سویان دا یۆژی زیوینی ژیان بەخشی وەدی دینێ و بە یێک و پێکی دەی هێنێتە کایەوە،کەچی وا هەموو گولستان و گول و شەوبۆ لە سایەی بەختی یەشی من دا بە تێکیایی سوتاون و پەیپوتن،دەبنواینە یارەکەی من کە لە کاتی بزەو پێکەنین دا چۆن لێوکانی وەک خونچەی تازە کراوەی گول وایەو،لەوکاتەشداکە بە بزەی لێوانیەوە ددانەکانی وەک زەمیوتی دەردەکەون ئای چەندە یێک و پێک و جوانن و لەبارن و هەرلە بەر هەندێشە کە لە هەموو زەمێکەوە دوورن و بێ وێنەیە لە یێک و پێکی دا،ئەو هەروەک چرا یوناکە و وەک گولیش جوانە و نازدار و بۆن خۆشە، بیۆیەشە کەوا دەلێن پەروانەو و بولبول لە تاو پرچی یەشی وک شەوی تاریک وسینەی وەک بەیانی یوناک وا پەرێشان و پەیپوتن و خۆیان لە پێناویان دا دەنێن و دەبن بە قوربانی و دەسوتێن و لە تاوان لە ناو دەچن، سەیریکە دلی منی دوورو غەوواسی چاوەکانی فرمێسکاویم کەوا وەک دووسەد یوباری جەیحون وانە ، وا مشت ومییانە و باسی جوانی و لە باری لێوەکانی سوری وەک یاقوتی تۆ دەکەن،گیانەکەم سوێندم بە گیانی خۆمەوە لەو کاتەوە کە تۆم ناسیوە ئیتر هەموو هیواو ئارەزوێکم چوو ویۆیشت و بوو بە قوربانی تۆوە،چونکە برینانی پی لە ژەهری بێ یەحمی و بەزەیی تۆ کە لە بەرامبەر ئەوینداری و دلداریدا وا بووەتە یەوشت وخووی تۆ، دەبێ ئەشتەری یاری موحەممەد پەیامبەری مەزنی خوداش وەکو منی دەشتی بووبێتن کە ئاوا دل پی خەم و پەرێشانی هیجرەت ودووری وجیابوونەوە و بێ تۆیی بێتن؟ ئەگەر وانیە ئەی بۆچی وا پرچی وەک کافووری تۆ هەمیشە یووی جوانی تۆی پۆشـــیوە و ئاوا لە سەر یوخساری تۆدایە؟.

*

ئەم شیعرەی دەشتی یەکێکە لەو شیعرانەی کە لە سەردەم و یۆژگارانی دەشتی دا زۆربەی فەقێیە دەنگخۆشەکان لەبەریان بوو و بە ئاوازێکی زۆر دلگیر

وشاد لە کۆیو مەجلیسان دا دەیان چیاند وخەلک گوێیان لێ دەگرت،من گەلێ جاران ئەم شیعرەم لە دەنگ و ئاوازی مامۆستا مەلا عوسمان گەزنەیی و گەلێ لە فەقێیەکانی تری یاوکم گوێ لێ بووە کە بە سرود خوێندویانەوە، ئاواز و دەنگی پی لە شادی خوێندنەوەی ئەم شیعرەی سەرەوە لە تەواوی ناوچەی بەیانەتی و دەشتی هەولێر و حوجرەکانی فە قێیان دا هەمیشە دەنگی دەدایەوە و زۆر بلاو بووبوەو گەلێ لە فەقێ و مەلاکان لەو سەردەمانە ئەم شیعرەیان لە بەر بووە.
هەر زۆر لە زوو هێشتان مندال بوو م تازە دەستم بە قورئانی پیرۆز کردبوو کە باەکم ئەم شیعرەی لە بەر پێ گوتم و منیش بەئاسانی و زۆر بە زوویی یەوان و لە بەرم کردو گەلێ جاران لە ناو فەقێیان کە دەبووە گەیە لاوژە منیش ئەم شیعرەی باوکمم بە ئاوازە تایبەتیەکەی خۆی دەچیی و دەمخوێندەوە کە تا ئێستاش ئەم شیعرەم لە یاد نەکردووە و هەر لە بەرمە.

*

PDF 4 KURD



## بیچارە ماوە دل

بێچـــــارە مـاوە دل لـە دووری یارەوە
کەوتۆتە زەنــجـیری فیـــــراقی یـــارەوە

یـاڕەببـی من کێـوی غـەمـم وا بـە رزەبم
هەردەم بـە ئـە فسـونی ڕوحـی عـەییارەوە

کـوانی ئـەڕەســــتۆی ویسـالی یـارەکـەم
بـێ بـۆ تـەداوی هـــــیجری زەهری مـارەوە

هەرکەس چ بەختێـکی نەبـێ وەک مـن دەبـێ
دائیـم خـەریـکی فیکـری کـــووفی لارەوە

بێکـەس دەنـالم بـۆ ڕوحـی گـول خونـچـەدەم
مـەجنـــــــونی لـەیلم وا لـە نێـو بازارەوە

کەیـخوســــرەوم،تاجمـە ماچی لە بـەکـەی
گەر بـێ نەســــیبی دلـی پـی ئەکدارەوە

ئەســـــــکەندرم گـەر بـێ بنۆشـم بادە یێ
بەم دەس و پـەنجـەی یـاری قەد شـمشـارەوە

ئەی دلبـــــەرانی دین بەران دەشتی ئەگـەر
سوتا بـگـێرن شـــــــیوەنـی لەو خـوارەوە

*

**مانای وشەکان**:

**بێچارە**:بێ هەتوان،بێ چارەســەری کردن، بەدبەخت. **ماوە**: ماوەتەوە. **دل**:قەلب دەروون. **یار**:خۆشەویست،دۆست . **کەوتۆتە**: گێرودەیە،لە ناودایە. **زەنجیر**:ئەو ئاسنە یان فلزیکی تری حەلقە حەلقەیە
کەبۆبەستنەوەو پەرژین و جوانی و زۆر شتی تر بەکاردەهێندرێت . **فیراق**:لێک جیا بوونەوە،دووری .**یار**:دۆست،خۆشەویست .
**یایەببی**: ئەی خودایە. **من**:ئەز.**کێو**:چیا.**غەم**:پەژارە. **وا**: بەو جۆرە، ئەوها،وشەیەکە بۆ دیاری کردنی باسکراو بە کار دێت.**بەرزەبم**:بلند دەبم دەچمە

حەواوە.**هەردەم**: هەمیشە. **بەئەفسوونی**: بە جادووی، بەسیحری ، **روخی**: رووی، چەهرەی،گۆنای.**عەییار**: تەیدەست،زرەنگ ، چالاک و توندیۆ. دلتەی، چاپووک.
**کوانی**: لە کوێیە، لە چ شوێنێکە .**ئەیەستۆی**:مەبەست هەمان پزیشک و شارەزاو فەیلەسوفی یۆنانیەکە یاری خۆی بەو تەشبیە کردووە. **ویسال** :پێک گەیشتن .**یار**: خۆشەویست، دلدار، هەڤـال .
**بێ**: بێتن.**بۆ**:لای. **تەداوی**:چارەسەری، هەتوان کردن. **هیجر**: دووری . **زەهر**: ژەهر، تـال .**مار**:مار،.
**هەرکەس**:هەرکێ:**بەخت**:شانس.**نەبـێ**:بێبەش بێ،نەی بـێتن. وەک من **دەبێت**:وەکوو منی لێ دێت .
**دائیم**: هەمیشە.**خەریک**:مەشغول. **فیکر**:یاد ، بیر. **کووف**: دەمامک،لێچک ، پـۆشی .**لار**: خوار، پێچەوانەی یاست .
**بێکەس**:بێ کەس و کار.**دەنالم**: هاوار دەکەم لە تاو ئازاراندا: **بۆیوخی**:بۆ رووی،بـۆگۆنـای. **گول**:خونچەی کراوە. **خونچە**:گولی نەپشکووتوو. **دەم**:زار دەو،.
**مەجنون**: شێت،دێوانە.**لەیل**:دلدار،خۆشەویست. لەناو: لەناو تیادا.**بازارەوە**: شوینی کیین و فرۆشتنەوە.
**کەیخوسرەو**:واتە وەک کەیخوسرەو وام ئەگەر بە ئاوات بگەم . **تاج**:کلاوی پاشایانە کە لە سەری دەنێن .**ماچ**: مەبەست ماچ کردنی یارە. **لەب**:لێو.
**گەر**: ئامرازی مەرجە .**بێ**: بێتن، وەدی بێت. **نەسیب**: بەش ،پێ بیان . **دل**: دل **پی**: تەژی . **ئەکدار**: وشەیەکی کۆی عەرەبیە،ناخۆشی ،لێل،شێلو،پی .
**ئەسکەندەر**: مەبەست ئەسکەندەری پادشای گەورەیە . **گەر**:ئامرازی مەرجە،ئەگەر **بێ**:وەدی بێت .**بنۆشم**: بخۆمەوە **بادەیێ**:جامێ،لیوانێ، پێکی.
**بەم**:ئامرازی هێمایە.**دەس**:دەست .**پەنجە**:پەنجەی دەست .**یار**:دۆست دلدار.
**قەد**: بالا. **شومشار**: ئالەتیکی مۆزیکی کوردیە باریک و جوانە،قەد و بالای یاری خۆی پی تەشبیە کردوە .
**ئەی**:ئامرازی هاوار و بانگ کردنە. **دلبەران**:نازدار و جوان و زیبایان و ئەوانەی کە دلان دەبەن .**دین بەر**: ئایین بەر.ن**دەشتی** :نازناوی شاعیرە.ئەگەر: ئامرازی مەرجە.
**سوتا**:ئاگری گرت و سوتا.**بگێین**:سازکەن.**شیوەن**: گریان ، زاری، پرسە.**لەوخوارەوە**:لە لای خوارەوە،لای باشوورەوە.

---

**مانا بە گشتی**:

دیارە کە دەشتی ئەشقی ئەو لەیلە جوان و شۆخ و شەنگە نازەنینە و کچە جولەکەیە بووە لەو دەمانەی کە لە گوندی بێتواتە فەقێ بووە و دەشتی پڕ بە دڵ

PDF 4 KURD



ئەو کچە جولەکەیەی خۆش ویستوە و لە کاتێ کە دوپشکێکی پێوە دەدات و هاوار بۆ یارەکەی خۆی دەبات و دەڵێت یاری من بۆ نایەت و چاوم پێی بکەوێت تاکو ببێ بە هەتوانی ئەم ژەهرەی پڕ لە ئازارم . بۆیەشە دەڵێت وا دلی من بێچارەو پڕلە ئازارو ڕەنجی دووری لەیاری خۆشەویستەوەیە و وا کەوتۆتە ناو ئازارو پەژارەی لە یەک جیابونەوەم،ئەی پەروەردگاری من وا من لە تاو رووی دلبەری نازداری پڕ لەجادووییدا هەمیشە دل پڕ پەژارەو ئازارم و ئەوەندە خەمبارم کە وەک کێوێکی پڕ لە ژارم لێ هاتوە و هەر بەرز دەبمەوەو خەمم لێ دەئالێن ،هەمیشە چاوم لە ڕێگەی یاری خۆمەوەیە و دەلێم کوانی یارەکەی من کە بێت وب ە یەک بگەین و ئەم هەموو ڕەنج و ئازارانەم هەتوان بکات دڵم شاد بکات ئەم و بە یەک گەیشتنەمان ببێ بە ئەرستۆ و تەبیبی دلیمن و دەردەکانی دووری و فیرقەتم کەوەک زەهری مار وایە و بۆم هەتوان بکاتن و چارەیەکم لێ بکات هەرکەسێ کە بێ بەخت و شانس بێتن ئەوا وەکومن دەکات و هەمیشە خۆی خەریکی پۆشی بەسەران و تیلاک خواران دەکات، وا منی بێکەس هەمیشە هاوارمە و لە تاو گۆنای ئەونازدارانەی کە تازە پێ دەگەن و وەک خونچەگول جوانن دەنالێنم ، من دێوانەو وێلی دوای ئەویارەم کە هەمیشە لە ناو بازاڕی خۆشەویستی و جوانی دا بێ وێنەیەو پڕ لە ناز و عیشوەیە، ئەوە بزانن کە ماچی لیوی ئەو یارەی من ئەگەر ببێت و ببێ بە نەسیبم ئەوا من وەک کەیخوسرەوی پادشا وام و لێوی ئەو لە بۆمن تاجی پاشایەتی و سەروەریە ئەم دلەی منی کە هەمیشە پڕ لە ناخۆشی و ئازار و رەنج و نەهامەتیە، ئەگەر بێت و تەنیا بادەیێ بە دەست و پەنجەکانی یاری بەژن و بالا وەک نەی وشومشالەوە بنوشم ئەوا من خۆم وەکوئەسکەندەر وام و پادشای جیهانم .

ئەی ئەوانەی کە دلبەر و جوان و لە بارو نازدار و دین بەرن ،داوای من لە ئێوە ئەوەیە کە ئەگەر منی دەشتی لە تاوان گڕم گرت و بە ئاگری عیشق و ئەوینەوە ســـــوتام

و نەمام و مردم ئەوسا ئێوەش شیوەنی من لەو خوارەوە کە یارە خۆشەویست و دلبەرەکەی منی لێ یە بگێڕن ،تاوەکو یارەکەم بە چاوی خۆیەوە ئەوە ببینێ کەوا بۆ منی سوتاو بە گڕی ئەوین و خۆشەویستی ئەوەوە وا دلبەرانی جوان و نازداران و شۆخ و شەنگەکان شیوەنم بۆ دەگـێڕن و پرسەی مەرگی منی ناکام و یە ئاوات نەگەیشتوویانە.دیارە مەبەستی لەو خوارەوە لای ماڵی کچە خۆشوهویستەکەی جولەکە بوە.

*

PDF 4 KURD



## بولبولی دل

بو لبلی دل هەســـــــتەوە بـەهارە گول شین دەکا
وەقتی نــەسـیم هاتەوە لەشـکری چـین مەشـقە ئەکا

هەســتە بەمەستی بـڕۆ بۆ گول و نەســرینی ڕوو
ســـونبولەی شەب تاسەحەر هەمدەمە شەبنم دەکـا

لەنجەیی خۆشـنامەکەت خۆشــە لەگـەل نەغمەکەت
شەققەیی تـۆق و کەمەر بەربــەت ونەی شەق دەکـا

مەجلسی بــادە نـوشان ڕوویــی نــەزەر فرۆشـان
لەززەتی دەســتی ساقی شانە لــە دل دەر دەکـــا

بەرگی سـەوز ئەپـۆشێ دلبــەری نـازک بـەدەن
چی نەیە حەسیەت دەبا دەس کە لە حـەننا دەکـا

جـەمعی مەلەک دێنە دەر فەســلی نەزاکەت کەدێ
گـررەیی شەوق و بەزم تەعـزییەیی خـەم دەکـا

مـوژدە لە تۆ دەشــتیا فیکــری قیــامـەتــی کـرد
قیبلەیی خاس وعــەوام مـەیلـی ویســـالت دەکـا

*

**مانای وشەکان**:

**بولبول:** هەزارە، ئەو بالندە جوانەیە کە ئاشقی گولە. **دل**:قەلب ، بەیاریش دەلێن .**هەستە:** هەستەوەسەرپێ .**بەهارە:** وەرزی نەزاکەتە ، کەژی بەهارە.**گول:**خونچەی کراوەی .**شین :** گریان و یۆیۆ،زاری .**دەکا:** ئەنجام دەدا. **وەقت:** کات . **نەسیم:**بای سروە،بای شنە.**هاتەوە:**گەیایەوە. **لەشکری:**سوپای.**چین:** گیاو گۆلی بەهاران.**مەشق:**تەمرین،یاەێنان . **سونبولە:** گولێکە.**شەب:**شەو . **تا:** هەتا.**سیحەر:**بەیان **هەمدەمی:**هاوییەتی. **شەبنم:**خوناوە.**دەکا:**پێهەلدەستێ،دروست دەکاتن.

PDF 4 KURD



**لەنجە:**جۆرە یەفتارێکی نازداران و ئاشقانەیە لە کاتی یۆیشتندا. **خوشنام:**ناوی خۆش . **خۆشە:** شادە. **لەگەل:**پیکەوە. **نەغمە:** ئاواز،سەدا.دەنگ .
**شەققەیی:**تەق و تۆقی،هەراوهۆریای. **تۆق:** جۆرە ئامرازێکی ژنانەیە کە بەجل و بەرگیان وەدەکەن .**کەمەر:**کەمەریش جۆرە ئامرازێکە بۆ ژنانە کە هاوینە لە گەل کەمەرە. **بەربەت:**ئالەتێکی مۆزیکە.**نەی:**ئەوەش هەر ئالەتێکی مۆزیکە.**شەق دەکا:** دەبیێ،نایەیلێ.
**مەجلس:** کۆی.**بادە:**جامی شەیاب . **نۆشان:**ئەوانەی دەخۆنەوە ی**وویی:**لای،دم وچاو گۆنا.**ن هزەرفرۆشان:** مەبەست نازداران شۆخ و شەنگە لەبارەکانن کە ئەوەندە جوانن و نازدارن ،سەیرکردنیان کییاری زۆرە، ئەوانەی کەیوانین دەفرۆشن. تەماشافرۆشان .
**لەززەت:**خۆشی ،بەتام وبۆ. **دەستی:** دەست. **ساقی:** مەیگێی. **شانە:** خەلیە،لێرە مەبەست ئەو ئازار و دەرد و پەژارانە یە کە لە ناو دل دایەو مرۆ گرفتاریەتی . **دل:**قەلب،دل .**دەردەکا:**وەدەریان دەنێ ،دەریان دەپەیێنێ ، نایان هێلێ، وەلایان دەبات .
**بەرگ:** گەلا. **سەوز:**کەسک .**ئەپۆشێ:** لەبەر دەکا.**دلبەر:**نازدار ،جوان دلفیێن . **نازک:** ناسک،تەنک.**بەدەن:**لەش،جەستە،تەن .
**چی:**هەرچی .**نەیە:**قەدوبالاوەک نەیە،شۆخە ،لەبارە. **دەست:** دەست. **کەلەحەننادەکات:**کە خەنە لە دەستی دەنێ .**دەکا:**ئەنجام دەدا.
**جەمعی:** کۆمەلی. **مەلەک:** فریشتەکان. **دێنەدەر:**وەدەر دەکەون، دێنە دەشت و دەر. **فەسل:**کەژ، وەرز. **نەزاکەت:**پاکی وخاوێنی، مەبەست وەرزی بەهارە ، **کەدێ:**کە وەدی دێت،دێتەکایەوە .
**گیەیی:** هەراوهۆریای.**شەوق:**تیشک ،یۆناکی. **بەزم:**سەیران ،گالتەوگەپ **تەعزیە:** پرسە. **خەم:** پەژارە.**دەکا:**پێ هەلدەستێ.
**موژدە:**مزگێنی.**لە تۆ:**مەبەست دوەم شەخسی موفرەدە کە شاعیرخۆیەتی .**دەشتیا:** نازناوی شاعیرە،ئەی دەشتی .**فیکر:** بیر،یاد.**قیامەت:**رۆژی واپەسین،رەستاخیز.
**قیبلە:**رووگە.**خاس:**تایبەتی.**عام:**گشت.**مەیل:**تەما،حەز.**ویسال:** گەیشتن. **دەکا:**دەیەوێ ، ئەنجــام دەدا.

**مانا بە گشتی** :

ئەی بولبەلی دلی من دەهەستە وا بەهارە و گول شین و زاریەتی بۆ دیدار و چاو پێکەوتن،وا کاتی سروە و شنەبای فێنک و خۆشی هاتەوە و سـوپــای گــیاو گــۆلی بەهارانــی یەنگین وا خۆیان یازاندۆتەوە و مەشقی شادی و سەیرانیانەو سونبولەی شەوانەش وا تاکو بەیانی هاوییەو وخوناوە دەکـاتن، هەلپەیین و لەنجەی تۆو ناوی خۆش و ئاوازی دلگیری تۆ وا پی لە شادی و بەزم و سەیرانن،

PDF 4 KURD



وا تەقە و شەق و شەۆقی تــۆق وکەمەرەدێتن ،کەواوئەو ئاوازە گەلێک خۆشترە لە ئاوازی مۆزیک،ئەو ئاوازەی کەوا دەنگی بەربەت وشومشالیـشان بییوەو شەقیان کردوە.وا کۆیی بادەنۆشان و سیمای جوانان و شۆخ و شەنگەکانینازدارو دلبەرانی نەزەرفرۆشان و لەززەتی دەستی ساقی مەیگێی و بەزم و شادی ئەم بەهارەلەو ناوە دا دل نوێ دەکاتەوە و شادی و خۆشی دەنوێنێ ،بە تایبەتی لەوکاتەدا کەوا دلبەری جوان و نازدارو لە بار (کەمەبەست واری نەخشین و یەنگینە) بەرگی تازەی سەوزی خۆی لە بەردەکاتن و هەرچی قەدو بالا باریک و شۆخ و شەنگە لەو کاتەدا دەستیان لە خەنە دەنێتن و ئەوسائاخ و حەسرەتان بۆ یاری شیربن و نازداریان هەلدەکێشن ، لەو دەمەدا کە وەرزی جوانی و نەزاکەت کە بەهاری یەنگینی نیشتمانە یوو لە جیهان دەکاتن و سروشتی زیبا و جوانیش خۆی دەیازێنێتەوەو کۆی فریشتەکانیش دێنە دەرەوە و بەزمی شادی و سەیران و خۆشی لە دووری خەم و ئازاران دا پرسەی نەبوونی خەم و جەفا دەکەن و ئازاران توی دەدەن،موژدە لە تۆ ئەی دەشتی وایاری تۆ یادی یۆژی لێ پرسینەوە و ژیانەوەی دەکاتن و بۆیەکە وا رووگەی تایبەتی و گشتی مەیلی گەیشتن بە تۆ و دیدار و چاو پێکەوتنت دەکاتن.

*

PDF 4 KURD



## بۆ ئەوکەسە

بۆئەوکـە سـە عـزز و شەڕەفی تاکە لە عـالـەم
این نـامـەبـەنـامەش بکونەد عەرزی مەقـالەم
مەدقیَ کوبـەئاخێـتە دوو چەهقیَ خۆ سیاە کەین
زئان دەر کەدەروبەهـرەوەری فەیـز و کـەمـالەم
اذ لم یک من غـیرە ویجـــــدان شـعـوری
پـەس پـیش کیَ بـایەدبنەهەم سوفرەیی حـالەم
قوربانی دەری تـەکیەیی پــڕ غـیرەتەکەت بـم
هــــاوارە ئەگەر چارە نەکەی بـیَ پەڕو بالەم
مە ژ دەستیَ فەراعین و مەلاعین هـــیلاکیـن
بەڕۆژدەرس وبەشــەوحارسی بەردەرگەیی مـالەم
ئان ماری کە دین گـەسـتەئی دندان ولەبی ئوست
چەنـد بـادەیی ژەهـریشـی بە من دا کـە بـنالم
کـــــلاّ ولئن لـم یک ما قـلـت حقـیقا
چیتـــر نیەئەسلەن سەبەبی مەحوی مەحالەم
بیر یـۆلدە موسـافیر قـویە گەربیلمیـەئولسون
فـەرزەت کە زئـانجا دەهـەمەش ئـابیَ زولالەم
ئوت ئورەکە ئـات دوشسە ئاتی سـادەی نارکـن
قوڕ پێوە لە بۆ ئەسـپـی کـەحێـل ڕوستەمی زالەم
هەرتەرزە مەقامێکی تەلەبیکەم منی دەشــتی
گەر ئـــێوە نەبن پێم وایـە تالب بـەمەحالەم
*

**مانای وشەکان**:
ئەم شعرەی دەشتی بریتیە لە نامەیەک بوبە پیز شێخ محێددینی بەرزنجی کەیەکێکە لە پیاو ماقولان و خانەدانان و جێگەی پێزی دانیشتوانی شاری هەولێری دیرین و شوێنی مەردو قارەمانان ،هەروەها دۆستێکی خۆشەویستی دەشتی بووە و ئەم نامە هۆنراوەییەە لە هەولێر نوسراوەتەوە کە بە کوردی و عارەبی و فارسی و تورکیە .
**بۆ ئەوکەسە**:مەبەست لە و کەس شێخ محیەددینی بەرزنجیە، دەشتی هەمیشە لە تەکیەکەی گەیەکی عارەبان سەری لە و زاتە بەپێزە دەدا و منیش کە مندال بووم گەلیَ جاران لە گەل دەشتی بۆ تەکیەکەی شیخ دەچووم و مەجلسی شێخ محێدینی بەرزنجی تا بلێی کوردانە و پی لە خۆشەویستی وقسەی خۆش و ئاوەدان و جێگەی پێزی پێزداران و گەورە پیاوان و سەروەران بوو،خانوێکی بەلاوە لە حوجرەیەکی بچکۆلە دەچوو کە گی بوو لە کتێبە دەست خەتەکان ،لە کاتەدا من

PDF 4 KURD



زۆر جاران دەچوومە ئەو حوجرەیەو سەیری کتێبە دەست خەتەکانم دەکرد کە بە داخەوە زۆر بێ خزمەت بوون و هەر لەو گۆیە فیێ درا بوون ئێستا گەلێ جاران ئەویم دێتە یاد و دەلێم دەبێت ئەو کتابە بە نرخ و کەلتووری کوردەواریە دەبێ چیان بە سەر هاتبێنکە لەو سەردەمانە دا کەمتر نرخیان دەزاندرا بەلام ئەوانە هەمووی بۆ خۆیان مێژوویەکی پڕ لە شانازی بوون گەر بە خزمەت هەلبگیرابانایەو مابانایە.

**بۆئەو کەسە:**واتە بۆ کەسێکی کەوا مەزن و هێژاو سەروەرەرو بەیێزە. **عز:**گەورەیی ، هێژایی .**شەرەف:**بلندی ، بەرزی ، سەروەری.**تاک:**یەک، بێ هاوتا، بێ وێنە .**لەعالەم:** لە جیهان، لە دونیا، لە ناو خەلکان . ئەم دێرە شیعرە هەمووی فارسیە **ئین:** ئامرازی هێمایەلە زمانی فارسیدا واتە ئەمە،ئەوە . **نامە:** نامە،کاغەز **.بەنامش:**واتە بە ناوی خوا،ئەم شینە عەتفە و بۆ خوا دەگەیێتەوە.**بکند:** ئەنجام بدات ، بکات .عەرز:پێکێش مەقال:نوسین،وتار ،ئەو مەبەستە نوسینەیە کە نوسەران دەیان نوسن و باسی بابەتێک دەکەن . ئەم دیرە شعرە بە شێوەی کرمانجی سەروە.**مە:** یاناوی یەکەم شەخسی کۆیە،واتە ئێمە **دقێ:** دەمانەوێ . **کو:**کە . **بە ئاخ :** خۆل، خاک،گل **تە:**یاناوی دوەم شەخسی موفیەدە بە شێوەی کرمانجی سەروو. **سیاکەین:**یەش بکەین .

ئەم دێرە شعرەش هەرفارسیە . **ز:**لە . **ئان:**ئامرازی هێمایە: لەو.**دەر:** دەروازە،دەرگایە. **کە دەری:** کە دەروازەی ، کەدەرگای. بەهرەوەر: سودبەخش بەسود،بە قازانج.کەمال: تەواو ، جوان .

ئەم دێرەش عارەبیە: **لم یک :** نـــابێ .**من:**لە .**غیرە:**جگە لەو،بێجگە لەو . **ویجدان:**ویژدان.پیاوەتی،کەیامەت .شعور: هەست .

ئەم دیرەش فارسیە . **پەس:**ئەدی ،کەواتە. **پیش:**لای ،پێش ، کن . **کی:**ئامرازی پرسیارە بۆ کەسێ ،واتە کێ ،چە کەسێ .

**مانا بە گشتی**

بۆکەسێکی کەوا لە گەورەیی و شــەیەف وکەیامەتدا لەم جیهانەدا بێ وێنەیەوا ئەم نامەمی بۆ دەنوسم کە بە ناوی یەزدانی مەزنەوە بۆئەو زاتە پیرۆزو هێژایە مەبەستی خۆم یا دەگەیێنم و پێشکەشی دەکەم ، ئێمە دەمانەوی کە بە خاکی دەرگایی تۆ کە شوێنی سەروەری و ئەوپەیی هێژایی و گەورەییە هەرد و چاوی خۆمان یەش بکەین،کە هیچ جێگەیەکی تر لەو دەرگایە پی لە ویژدان و مەزن و گەورەتر لە ناو هەست و دەروونم دا نابینم ،ئەی ئەگەر لەوێندەر و لای ئەوا رازو نیازی خۆم نەلێم و نەیکەم لەلای کێ باسی خۆم بکەم و هەرچی هەمە دەری ببیم،ئەی بە قوربانی دەرگای تەکیەکەی پیاو پیی غیرەت و گەورەییتان ببم،ئەگەر ئێوە بە هاواری منەوە نێن و دەردی من هەتوان نەکەن ئەوا هیچ چارەیەکی ترم نیە کەوا ئێستا لە دەستی زۆرداران و نامەردان و ناکەسان گرفتار بوویمەو

PDF 4 KURD



هەربۆیەشە کە یۆژانەخەریکی دەرس گوتنەوە و شەوانەش لە ترسی نەیاراندا وا پاسەوانی بەردەرگای مالەکەی خۆمانین ، چونکە ئەوکەسەی کە وەک مار وایە و دژ بە ئاین ژەهراویە، وا چەند بادە ژەرێکیشی داوەتە من بۆ ئەوەی پێ سەرگەردان بم و بۆ هەمیشەلە ژێر یەنوی ئازاران دا بنالێنم ئەگەر ئێوەش نەبن چاک دەزانم کە زۆر زەحمەتە داواکەم جێ بەجێ ببێتن چونکە بەبێ ئێوەوە دیارە کە داواکاری ئەوەم کە ناکرێت و بۆم جێ بەجێ نابێتن ، خۆ بەیاستی ئەوەی کە گوتم، جگەلە یاستی و دروستی بەولاوە شتێکی تری تیا نیە و ئەوەندە یاستیشە کە هەر لە بەر ئەوەیە هۆکاری لە ناو بردن و لە ناوچوونی ئەوەم کە نەکراوەو ئەنجام نەدراوەو هەتا ئێستاکەش چارەسەری.بۆ نەدۆزراوەتەوە.

*

PDF 4 KURD



**بو ئەوکەسە حوکمی**

بۆئەوکەسە حوکمی لە هەموو جێگەیە ساری
عیززو شەڕەفی کوردە کە مەتلووبە لە باری

ئەم زاتە کە مەشهوورە بە ئەحمەد موتەسەییف
بۆ ئیشی حکومەت لە لیوا چاکە قیراری

باعیس بە عەدالەتیە قانونی تەجەللی
ساحێب شەڕەف و عیززەتە بۆ کاری ئیداری

مەعلوومە کە نیشانەیە بۆ ئەسلی تەڕەقی
بۆ مەملەکەتی کورد و عەڕەب دەشت و دیاری

جەمهوری عەشائیر کەئەکەن حەمدو تەشەککور
نیشانەی سەرداریە کەئەم پیشە بناری

بابەکر سەلیم ئاغا کە شاهێکە لە پشدەر
مەشغولتە هەردەم بە سەناووبە دیاری

دەشتی لەغەزەل مەقسەدی هەر هەندە بزانن
کەکوردێکی بەجەوهەر هەیە ئیمڕۆ لە شاری

*

**مانای ووشەکان :**

**بۆئەوکەسە:** بۆ ئەوەی ، بۆکەسێکی . **حوکم:** فەرمان. **لەهەموو:** لە گشت . **شوێنێ:** جێگایێ . **ساری:** بلاو ،یەوان .

**عیززز:** گەورەیی . **شەڕەف:** ئابیوو،بلند،هێژا. . **کورد:** میبللەتێکی 40 ملیۆن مرۆڤن لە نیشتمانی خۆیان کوردستانی ئازیزدا بێ بەشن و تا ئێستا وەلاتێکی سەر بەخۆیان وخاوەنی وەلاتێکی کوردستان نین و نیشتمانی ڕەنگینی کوردەواری بە دەستی دوژمنانی کورد لەت لەت کراوە و بە سەر تورکیاو ئیران و عیراق و سوریا دابەش و ئەم وەلاتانە دانیان بە مافی یەوای ئەم چل ملیۆن کوردە نەناوە و هەندێ لەو وەلاتانە کورد هەر بە میللت نازانن و هەمیشە لە بیری تواندنەوەو وێران کردنی خاکی کوردستاننن و لە هەر چوار لاوە دەچەوسێندرێنەوە.دیارە کە کوردێک بووە

PDF 4 KURD



بە پارێزگاری شاری هەولێر لەو ڕۆژگارانە دا دەشتی نەمر وەک نیشتمانپەروەرێک شانازی پێوە کردووە.

**مەتلوب:**داواکار، داخوازی . **لە باری:** لەیەزدان ، لە خودا . **ئەم زاتە:**ئەم کەسە،ئەم شەخسە .**کەمەشهورە:**کە ناودارە، کە ناسراوە ، کە بە ناو بانگە. **بە ئەحمەد:** کەناوی ئەحمەدە . **موتەسەرریف:** پارێزگار،موحافیز ئوستاندار.

**بۆئیش:**بۆ کار . **حکومەت:**فەرمانیەوایی،فەرمانداری . **لیوا:** پایتەختی چەند قەزاو ناحیەیەکە، پارێزگە . **چاک:** باش .**قراری:** جێگیربوونی ،چەسپاندنی . **باعیس:** هۆکار. **عەدالەت:**دادپەروەری .**قانوون:**یاسا . **تەجەللی:** یۆناک،دیار

**ساحێب:** خاوەن . **شەیەف:** بیومەت، ئابیوو،هێژایی . **عیززەت:** گەورەیی:سەروەری . **کاری ئیداری:**کاری بەیێوەبەرایەتی .

**مەعلوم:**دیار،ئاشکرا.یوون .**نیشانە:**بەلگە. **ئەسل:** بنچینە، سەرچاوە.**تەیەقی:**پێشکەوتن .

**بۆمەملەکەت:** بۆ وەلات، بۆ نیشتمان . **کورد:**خەلکی کورد . **عەرەب:** خەلکی عەرەب .**دەشت:**هامۆن،سەحرا . **دیار:**وار،ئاخ،نیشتمان .

**جەمهور:**خەلک،کۆمەل . **عەشاییر:**هۆز ،عەشیرەت .**کەئەکەن:** کە دەکەن، کە ئەنجام دەدەن **حەمد:**سوپاسگوزاری . **تەشەککور:** سوپاس کردن.

**نیشانە:**بەلگە.**سەرداری:**رابەرایەتی،سەرۆکایەتی. **کەئەم پیشە:** کەئەم حیرفە،کەئەم کارە. **بناری:**بمینێ،پەرەبسێنێ .

**بابەکرسەلیم ئاغا:** ناوی سەردارێکی عەشیرەتی مەنگویانە کە لە ناوچەی پشدەرا خاوەن دەسەلات و ناو دار بووە زۆر شتی سەیری لێ دەگێینەوە .**شاە:** مەلیک ، پادشا.**پشدەر:** ناوچەیەکە دەکەوێتە لای قەلادزە وە لە کوردستانی باشوردایەکە ئێستا یزگارە و سەر بە حکومەتی هەرێمی کوردستانەو لە ژێر چنگی دوژمنان

دانیەو سەر بە شاری سلیمانیەیە لە یووی ئیداریەوە .

**مەشغول:** خەریک بوون . **هەردەم:** هەمیشە، لە هەموو کاتێ . **سەنا:**مەدح، پێدا هەلگوتن .**دیاری:**هەدیە .

**دەشتی:** نازناوی شاعیرمەلاخدری دارەبەنیە .**غەزەل:** شعر، هۆنراوەمەقسەد:نیاز،ئارەزوو،هیوا،ئاوات ، ئەمەل .**هەر هەندە:** تەنیا ئەوەندە.**بزانن:**تێ بگەن ،لێ حالی بن .

**کەکوردێکی:**کەیۆلەیەکی کورد.**بەجەوهەر:**بە غیرەت، مەردانە. **هەیە:** مەوجودە.**ئیمیۆکە:**لەم یۆژەدا،ئەویۆ،ئیرۆ. **لە شاری:** مەبەستی شاری هەولێرە

**مانا بە گشتی:**

دیارە کە دەشتی وەکو هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەرو دلسۆزی خاک و نەتەوەکەی هەمیشە هیواو ئاواتی ئەوەبووە کە یۆلەکانی کوردستان بۆ خۆیان

PDF 4 KURD

خاوەن و فەرمانیەواو بەیۆوەبەری هەموو کارو بارێکی خاک و نەتەوەکەیان بن و کوردستان سەربەخۆ و ئازاد و یزگار ببێت و کورد بە خۆی خاوەنی مالی خۆی بێتن و خاوەن دەسەلات بێت،ن بۆیەکە دەبینین لەم شیعرەدا چەند شانازی بە بوونی کوردێکی خاوەن دەسەلات لە شارە خۆشەویستەکەی هەولێری دیرین دەکاتن و چۆن بەو کویە کوردە و خاوەن فەرمانە دا هەل دەلێت،کە ئەمەش بۆخۆی هەستێکی پاکی نەتەوایەتیەوخاک پەروەریە و بەس کە دەلێت.

بۆ ئەو کەسەی کەوا ئیمیۆ لە هەموو شوێنێکی پارێزگای هەولێراد خاوەن دەسەلات و فەرمانــە،ئێمە کە هەمیشە سەروەری و هێژایی گەلی کوردمان لە یەزدانی مەزن داوایە کەئاوا یولە کوردەکان هەردەم سەر بلند و سەر بەرزبن و فەرمانـــیەوای خاک و نیشتمانیان بن،ئێستاکەش ئەم زاتەی کەوا ناوبانگی بە ئەحمەد موتەسەییف دەرکردووە،مانەوەو جێگیربوونی بۆ کار و باری بەیۆوەبەرایەتی لە شاری هەولێر لە جێگەی خۆیەتی و گەلێ باشەو جێگەی شانازی وهۆی دادپەروەری یاسای بەرێوەچوون و یۆناکیە کە کوردێک ئاواخاوەنی گەورەیی و ئابیوە بۆ یێبەرایەتی کارو باری ئیداری بێتن دیار بکرێتن. شتێکی یوونە و دیارە کە ئەم کارە نیشانەیە بۆپێشکەوتنی یاستەقینەی نیشتمانی کورد و عارەبان ، هەر لە بەر ئەمەشە کەوا کۆمەلی عەشاییر دلخۆشن و سوپاس گوزارن کەئەمەش نیشانەیە بۆسەروەری و گەورەیی گەلی کورد ودەبێت ئەم کارە زیاتر پەرە بسێنێ و جێگەی خۆی بۆ هەمیشە بگرێتن و زیاتر بەرەو پێشەوە بیواتن کە یۆلەکانی کوردیش بۆ خۆیان خاوەن دەسەلات و سەروەری خۆیان بن ، وابابەکر سەلیم ئاغای پشدەریش کە سەرۆکیکی گەورە و مەزنێکە لەو دەڤەری پشدەرێدا هەردەم خەریکی پیا هەلگوتن و دیاریە بۆ ئەحمەد موتەسەییف کە ئیستا لەپارێزگاری هەولێر پارێزگارە، لێرەدا تەنیا مەبەستی منی دەشتی ئەوەیە کەوا هەموو خەلکێک ئاگادار بن وئەوە ئەوەباش بزانن کەوا ئەمیۆکەلەنیشتمانی ئێمەدا لە شاری هەلێری دیرین وخۆشەویست و دلگیرمان دا رۆلەکوردێکی خاوەن ئابیوو و بە جەوهەرو سەربلند هەیەو وافەرمانیەوایی دەکاتن و خاوەن دەسەلاتە لە شارەکەمان دا.

*

PDF 4 KURD



## بەجۆشی دل

بەجۆشی دل ئەگــەرئاویلەدونـیابەر نــەدەم چــبكـەم
بەنووری تـۆبەگـەرRووی یەشم یوناك نەكـەم چــبكەم

دەبا هەستم هەتا ماوم مەدامــی چـۆل و سەحـرابم
لەدەروازەی موحەممەدگەردەنی خۆم دانەخەم چبكــەم

لەڕێگەی مەكەوو تاییــف وەكو سەگ گەرنــەلــورێنم
لەمەحشــەرچونكەبێ نەقدم ئەگەرزاری نەكەم چبكەم

مەدینەی تۆیە جێـگـایی دەخـالەت یــا ڕەســولەللاە
لەكەم دەستی وەلێ من یروولــەنــەینەوانـەكـەم چبكەم

مـونافیق هەر منم ڕەحمێ بــفــەرمـوو یــا ئەبەلقاسـم
لە سەر پردێ سیراتا تــۆ نەجـاتم گـەرنەدەی چـبكـەم

لەمووودەی عومـرماجارێ نەبــوو فیكـری قیــامـەت كەم
شــەپۆلی بەحری عیسیانم بەتۆبە پـاك نەكـــەم چـبكـەم

ڕەفیقانم مەلـێن ناساغە دەشـــــــتی سا چ تەدبیرێ
كەتــەدبیرێش دەكـەن تەدبیری عەفوم بۆنەكـەن چبكـەم

*

---

**مانای وشەكان**:

**بەجوشی دل** : بەكولی دل،بە سوتانی دل ، بەگیی دل .**ئەگەر**:ئامرازی مەرجە ، گەر،مەگەر. **ئاوربەرنەدەم**:ئاگری تێ بەرنەدەم ، یان **ئاوییەرنەدەم**: واتە پشت لە دونیانەكەم ،وازی لێ نەهێنم. **چی بكەم** :چیتر هەیە لەوە زیاتر كەبیكەم .

**بە نووری**: بە یۆناكی.**تۆبە**: تۆبەكردن،پەشــیمانی و گەیانەوە لە گوناەوچونەسەر ییێگەی راست .**گەر**:ئامرازی مەرجە **یووی یەشم** : رووی گوناهبارم ، دیاردەی یەشم ،گوناهانم. **هەتا ماوم**:تاهەم ، تا ئەوكاتەی لەژیانم **مەدام**:هەمیشە،هەردەم **چۆل**:دەشت،بیابان . **سەحیا**:هامۆن،دەشت.

**لەدەروازەی**:لەدەرگای **موحەممەد**: دوا پەیامبەری خوا.**گەردەن** : مل كەچ نەبم ،كینووش نەبەم. **چیبكەم**:چیتر هەیە لەوە زیاتر ئەنجامی بدەم .

PDF 4 KURD



**لە ڕێگەی:** لە ڕێی ،لەڕێبازی. **مەککە:**ڕوگەی موسلمانان کە بۆ زیارەت بۆ مالی خوو دەچن و دەبن بە حاجی.**تایف:**ناوی شارێکە لە سعودی،کەسێ کە زیارەت بکاتن . **وەکو:** وێنەی ، هەروەک . **سەگ:**کسۆک .**نەلوورێنم:** هاوار نەکەم، لوورە دەنگیکی تایبەتی سەگە،ئەمەش بۆ خۆ بە کەم زانین دەگترێ .

**مەحشەر:**ئەو ڕۆژەیە کە یەزدان لە بەندەی خۆی دەپێچێتەوە هەموو کەسێ بە پێی یاسای خودایی دادگایی دەکرێت، ڕۆژی قیامەت.**چونکە:**لەبەر ئەوەی.**بێ نەقدم:**مەبەست لێرە گوناە باریە، هیچ چاکەیەکم پێ نیە.قەرزدارم .

بێ سەرمایەم ،گوناهبارم .**ئەگەر:**ئامرازی مەرجە.**زاری:**گریان. **نەکەم چی بکەم:** چیترنیە کەبیکەم لەگریان زیاتر شتێکی ترم نیە ئەنجامی بدەم .

**مەدینە:**هەمان شارە کە پەیامبەری خودا کۆچی بۆکردو لەوێش وەفاتی کردووەو مەزارەکەشی هەر لەوشارەپیرۆزەیە.**تۆ:**مەبەست موحەممەدی پەیامبەری خوایە(د).**جێگا:**شوێن. **دەخالەت:** پەنا بۆ بردن. **یا:**ووشەی هاوارە لە زمانی عارەبیدا .**رسولەللا:** پەیامبەری خودا.

**لەکەم دەستی:**لە نەبوونی ، لە بێ دەسەلاتی. **ڕوو:**بەرەو بۆلای. **نەینەوا:** مەبەست شاری موسلە،کەمەزاری یونس پەیامبەری لێیە.**نەکەم :**ئەنجام نەدەم **چییکەم:**چیتر نیە کەبیکەم .

**مونافیق:**دوو ڕوو. **هەر:**تەنیا. **منم:** یاناوی یەکەم شەخسە،ئەمن . **ڕەحمێ بفەرموو:** دلۆڤانی بکە ،.میهرەبانی ئەنجام بدە . **یا:**وشەی هاوارە. **ئەبەلقاسم:**باوکی قاسم ، مەبەست موحەممەد پەیامبەرە(د)

**لەسەر:** لە بالای، لە سەرووی .**پرد:**جسر.**سییات:** ڕێگا،ڕێ.**تۆ:**یاناوی دوەم شەخسە لیرەش مەبەست پەیامبەری خوایە.**نەجاتم گەرنەدەی:**ئەگەر رزگارم نەکەی. **چی بکەم:**جا چی بکەم .

**لەموددەی:** لەماوەی. **عومرما:** تەمەنما. **جاری:** یەکجار. **نەبوو:** وانەبوو. **فیکر:** بیر،یاد . **قیامەت:**ڕۆژی زیندوبوونەوە، یەستاخیز،واپەسی.**شەپۆل:**مەوج،پێل.**بەحر:**دەریا **عیسیان:**گوناە. **بە تۆبە:**بەپەشیمان بوون . **پاک:**بێگەرد. **نەکەم:** ئەنجام نەدەم. **چی بکەم:** چیتربکەم ،چکارێکیتربکەم.

**یەفیقانم:**هەڤالانم،یارانم،دۆستانم.**مەلێن:**مەبێژن،وامەلێن.**ناساغە:** ساغ نیە، نەخۆشە.**دەشتی:** نازناوی شاعیرە. **سا:**جا. **چ تەدبیرێ:** چ چارەیێ چارچ یە.

**کەتەدبیرێش:** کەچارەش. **دەکەن:**دەدۆزنەوە. **عەفو:**لێبوردن . **بۆنەکەن:** بۆ ئەنجام نەدەن. **چیبکەم:**چارەم چیە.

**مانا بە گشتی** :

لەوە زیاتر چیتر هەیەئەگەر بە کولی دل وهەست و دەروونی خۆم پشت لە دونیا نەکەم و بە هۆی تۆبە کردن و پەشیمانی لە گوناهانم ڕووی یەشی خۆم

PDF 4 KURD



سپی و دلی خۆم روناک نەکەمەوە ئەی چ چارەیەکی تر هەیەکەوائەنجامی بدەم، دەبا هەنا ماوم لە ژیانم دا بۆ هەمیشە یوو لە دەشت و چۆل و بیابان بکەم و دەرگای موحەممەدی پەیامبەری خودادا کینوش بەرم چونکە لەوە زیاتر شتێکی تر سودی نیە ، با لە ریگەی مەککە و تاییف وەکو کسۆک بلورێنم وهاوار بکەم و بنالێنم چونکە لە یۆژی قیامەتدا لە بەر گوناهان هیچ نرخێکم نیەو زۆر گوناهبارم بۆیە دەبێت هەر شین وزاری بۆ خۆم بکەم ،ئەی پەیامبەری خودا خۆ شاری مەدینەی تۆ شوینێکی پیرۆزە و جێگای خۆ دەخیل کردن و پایانەوەیە، خۆ من لە هەژاری و نەداریدا ناتوانم بێم بۆزیارەت و خزمەت کردنی مەزارری تۆ لە شاری مەدینەدا جا لە بەر هەندێ ئەگر یوو لە شاری نەینەوا نەکەم ئەدی چی بکەم و بۆ کوێ بچم (شاری نەینەوا مەزاری نەبی یونسی لێ یە و کەوا ئەوێش ئارمگاهی پەیامبەرێکی خودایە و شوینێکی پیرۆزە موحەممەد فەرمویەتی کەسێ کە نەتوانێ بێتە زیارەتی من بچێتە زیارەتی نەبی یونسی برام).خۆ هەر منم مونافیق ،دەسا ئەی باوکی قاسم سا یەحمێکمان پێ بکە ، ئەگەر تۆ لە سەر پردی سیراتێ دا رزگارمان نەکەی و دەربازمان نەکەیت ئەی چی بکەم، خۆ من لە ماوەی تەمەنم دا نەبووە کە تەنیا جارێکیش بە یادی یۆژی واپەسین بم و بیرێکی لێ بکەمەوە،جا ئەگەر گوناهانم و دەریای پی لە شەپۆلی تاوانباریم لە یاست یەزدانەوە بە هۆی تۆ پاک نەکەمەوە چی بکەم و چۆن رزگاریم دەبێت،ئەی هەڤالانم ئێوە مەلێن کە دەشتی نەخۆشـــە وەرن بۆچونێک و چارەیەکم لێ بکەن خۆ ئەگەر هەر چارەو بتەکبیرێکم بۆ دەدۆزنەوە چارەسەری و تەکبیری لێ بوردنم بۆ نەکەن ئەی من چی بکەم ..

*

PDF 4 KURD

## پر زەهرە جگەری من

پڕ زەهـرە هەمـوو دەم لە فـــڕاقـت جـگەری من
پەروانـەیـە بـۆ ڕوویی چــــــراغت جـگەری من
عـالەم هەمـــوو مەفتـوونـــە بـــە بـۆیی جگەری مـن
ئەی دلبەری قەد نـەی وەرە سەیری جـــگەری من
قـوللابـــی ســـەری زولفتە بەنـــدی جـگـەری من

ئەی ئەهلی ئـیرەم خونچەیی دەم شەربەتی زەمزەم
جـاریٚ وەرە فـــەرموو چیە حـــالی دلـــی پـــڕ خـەم
مەحزوونە لە هیجـرانی تۆ وە ک ئاتـــەشـە هـەردەم
بۆ خـــال و خەتی کەعبـەیـی ڕوو ســـەختە هەناسـەم
بـــەم نەوعـــە هـــەواداریە فـــەوتـا جگەری مـن

تەرکی وەتەنم کـــردووە بـــۆ ـــــقەددی ســـنەوبەر
دێوانەیی دلە شــــەو دەگـری بێکـــەس و بێـــدەر
بـــۆ خـــاتـری ئـــەم گـەردەنـەیی دلبـــەری دینبەر
ئیمـڕۆ وەرە بۆ زەخمــی دلم دەست مەدە خەنجـــەر
لەم غوربەتە تـــاکـــەی بە هـــەواچـــیٚ جـگـەری من

ئـــەم چـاوە غـــەزالـــەت ســـەبـــەبی میحنەتە بـۆ من
ئەم لەنجە لـەسەر پـەنـــجە هەمووی زیللـەتـــە بـۆ من
ئەم سیـــحـــرە لەسەر دوگـمـەیـی سینەت خەمە بۆ من
نـــارنجـی بـــەری قـەددی ســـــەروت فیتنەیە بۆ من
بـــەم حـــالەتـــە تاکـــەی لـــە جـەفـایێ جگەری من

دل بولبولـە قەسدی گـــولە لـەم جـەننەتی سـاغـــت
عومرو پـەڕ و نەغمـەی بـــووە فیدیەی دەری بـــاغـت
مەیلێ بکـە یەحمـی بکـــە زالـــم بە نەســــــاغـــت
دەردم وەکو ئەییوبە لە دەســـت پـەنجـــەیی داغـت

PDF 4 KURD



وەک تـالیبـی کەنعانـە دەسووتی جـگەری مـن

چەنـد وەقتە دەسـوتێم و دەگـریێم و دەنالم
بـۆ شەربەتـی وەسلت لـە جودا یـی نیە حالم
فەوتـاوە لـە ڕێگـەت مـژم و دیـدی بەتالم
هـەرچەنـدە کـە بـڕشـێنم و دەروازە بـمـالم
هێشتا هەیـە مـەیـلت کـەبسـوتێ جگـەری مـن

تـۆ پـا دشـەهی خاوەرو یوو گـەنـجەلەبـۆ تۆ
تۆ سەییـد وهەم سەروەرو من عـەبـدی دەری تـۆ
تۆ بازی لەسەر ئاسک و من سـەیدی دەسـی تـۆ
پـێت وایە کە نەی چێشتوە دەشـتی میحـەنی تـۆ
ئیسپاتی غەدەنـگبازی ئەکـەی بـۆ جـگەری من
*

**مانای وشەکان**:

**پی**: تەژی . **زەهر**: ژەهر . **هەموو**: خی،گشت. **لە فیياقت**: لە جیابوونەوەت ، لە غوربەتت،لە دووریت ، **جگەری من**:هەناوی من ،دەروونی من.

**پەروانە**:باڵندەی ئاشقی شەم .**بۆ**: لۆ. **یوو**:دم و چاو،وەجە. **چراغ** : چرا.**جگەر**:هەناو.**من**:یاناوی یەکەم شەخسی تاکە.

**عالەم** : جیهان . **هەمە**:هەموو.**مەفتوون** :شێواو .**بۆ**:لە بۆ .

**ئەی** : وشەی هاوار،وشەی بانگ کردن.**قەد**:بەژن وباڵا. **نەی** : قامیش،جۆرە ئامرازێکی مۆزیکە ،شومشال .

**قولاب**:بە هەموو شتێکی خوارەوە بوو دەڵین وەک ئامرازی یاوە ماسیی یان بۆ شت پێوە هەڵواسین،سەری بسک بە قولاب تەشبیە کراوە و بەندی جگەری پیوەبوە. **بەند**:گیراو.

**ئەهلی**:خەڵکی،یام.**ئیرەم**:ناوی باغێکە لەبەهەشـت.**خونچە**:گولی نەپشکوتوو.**دەم**:زار،دەو . **شەربەت**: خواردنەوە.**زەمزەم**:ناوی ئەوبیرەیەکە لە مەکەیە حاجیەکانیش بە متفەیکی ئاوەکەی دەکین و بۆ دیاری دێەێننەوە و دەڵێن بیری زەمانی ئیبیاهیم پەیامبەرە .

**جاری**: یەکجار. وەرە:**بێ**،فەرموو،کەیەمکە. **فەرموو**: وەرە،لوتف بکە . **چیە**:چۆنە،لە چیدایە. **حال** : ئیستا، چۆنیەتی. **دل**:قەلب.**من** :یاناوی یەکەم شەخسی تاکە،از.**پی** :تەژی.**خەم**:پەژارە ،دەردو کول.

**مەحزون** :خەمبار،دل پی پەژارە. **هیجران** :کۆچ .**تۆ** :یاناوی دوەم شەخسی ناکە.**وەک**:وەکو.**ئاتەش** :ئاگر.**هەردەم**:هەمیشە .

PDF 4 KURD



**بۆ:** لۆ. **خال :** نیشانەییەکی یەشە لە سەر دم و چاوی یاردا. **کەعبە:** مالی خوایە قیبلەیە کە یووی یاری پێ تەشبیە کراوە. **روو :** دم و چاو، وەجە **سەخت :** زەحمەتە، یان **سوختە:** سوتاوە . **هەناسە :** پشوو،نەفەس.

**بەم نەوعە :** بەم شێوەیە ،بەم جۆرە. **هەوادار:** روح گەورەیی،خۆ بە زۆرزانین،فیزلێدان ،یان لایەنگری بە مانای فارسی. **فەوتاوە :** لە ناو چووە،نەماوە. **تەرک:** وازهێنان. **وەتەن:** وار،نیشتمان. **کردوە:** ئەنجامداوە. **بۆ:** لۆ.

**قەدد :** بەژن و بالا. **سنەوبەر :** داریکی بەرزو یاست و جوانە کە بالای یاری پێ تەشبیە کراوە. **دێوانە :** شێت،مەجنوون . **دل :** قەلب . **شەودەگری :** بە شەو زاری دەکات. **بێکەس :** بێ دۆست و یار،بە تەنیا . **بێدەر :** بێ شوین و جێگا.

**بۆخاتری :** لەبەرخاتری . **گەردەن :** مل ،ئەستۆ. **دلبەر :** لە نازداری و جوانی دل دەبات ،دل ئاشوفتە دەکات ، **دینبەر :** ئایین بەر ئەوەندە جوانە دین بەرە.

**ئیمیۆکە :** ئەویۆکە. **وەرە :** بێ ، بفەرموو . **بـۆ زەخمی :** بۆزامی. **دلم :** قەلبم. **دەست مەدە :** دەست مەبە بۆ. **خەنجەر :** ئامرازێکە کە بۆ شەیکردنی ساردە و دەوەکەی کەمێ خوار ە و لەبەر پشتێندا یا دەکرێ و هەلدەگیرێ.

**لەم غوربەتە :** لەم دووریە، لەم غەوارەییە **تـاکەی :** هەتا کەنگی **بە هەواچێ :** بێ سودبێ ، بەلاش بیوا . **جگەری من :** جەرگی من ، هەناوی من .

**ئەم :** ئامرازی هێمای نەزیکە . **چاو :** دیدە . **غەزال :** ئاسک **سەبەب :** هۆ. **میحنەت :** رەنج و ئازا . **بۆ من :** لۆمن ،لۆ ئەزێ .لە بۆ من.

**ئەم لەنجە:** ئەم نازە ،لەنجە جۆرە یۆیشتنێکی ژنانەیە کە پی لە نازو نوزە. **لەسەر:** لە یووی لە بالای . **پەنجـە :** ئەنگوست ،قامک . **هەمووی :** گشتی . **زیللەتە:** میحنەتە .

**ئەم سیحرە :** ئەم جادووە، ئەم ئەفسوونە . **لە سەر :** لە رووی لە بالای. **دوگمە:** جۆرە خشلێکی ژنانەیە بە سوخمەی وەدەکەن بۆ جوانی. **سینە :** سینگ . **خەمە بۆمن :** بۆ من پەژارەیە .

**نارنج :** مەبەست مەمکۆلانی یارە کە تەشـبیە بە نارنج کراوە. **بەر :** بەرووبووم. **قەدد :** بەژن و بالا . **سەرو :** داریکی جوان و بلند و یێکە کە قەدی یاری بەودارە تەشبیە کردوە . **فیتنە :** بەلا ، ئاشوب ،شەی،گومراهی ،بیسوایی ،سەختی .

**بەم حالەتە:** بەم شێوەیە. **تاکەی :** هەتا کەنگی . **لە جەفادابێ :** لە رەنج و ئازار و ناخۆشیا بێت .

**دل :** قەلب . **بولبول :** هەزارە ،بالندەی جوان ئەوینی گول . **قەسد :** نیاز،مەبەست،هیوا ،ئارەزوو،ئاوات . **گول :** خونچەی کراوە ، یاری بولبول

**لەم جەننەتی:** لەم بەهەشتی . **ساغت :** جوانت ،پوختت .

**عومر :** تەمەن . **روح :** گیان . **نەغمە :** ئاواز . **فیدیە :** پێشکەش ، قوربان . **دەری :** دەرگای . **باغت :** بۆستانت .

PDF 4 KURD



**مەیلی بکە :** ئارەزویێ بکە. **یەحمێ بکە :** دلۆڤانییێ بکە . **زالم :** زۆردا .
**بەنەساغت :** بە نەخۆشت ، بە ئەویندارت .
**دەردم :** ئازارم ، یەنجم . **وەکو :** وێنەی . **ئەییوبە :** مەبەست پەیامبەر ئەییوبە کە توشی بە دەرد و ژانی برینان بوە و دەمێکی زۆر لە تاو ئەو ئازار و نەخۆشیەی کە گرتوویەتی و یەنجی پێوە کێشاوە و تەواوی گیانی پی لە زام و برینان بووە خۆشی لە بەر یا گرتوەو کە سەبر و ئارامی ئەییوب ناو بانگی هەیە . **لە دەست :** بە هۆی ، لە چنگ . **پەنجەیی :** ئەنگوستی . **داغت :** بە ئاگر سوور بووەوەت ، گەرمت .
**وەک :** وێنەی . **تالیبی کەنعان :** لیرە مەبەست یاقوب پەیامبەرە کە یوسفی کوری بە هۆی خیانەت لێ کردنی براکانی کە هاویشتیانە ناوبیر بە مەستی لە ناو بردنی . پاشان یێبوارانی میسری دەریان هێنا و بردیان بۆ میسر و لەوی بوو بە پەیامبەر و داستانی یوسف و زولەیخا وەدی هاـت ، حەزرەتی یاقوبییش باوکی یوسف لە تاو ون بوونی یۆلە کەی کوێر بوە و سالهای سال بۆی سوتاوە .
**دەسوتێ :** گی دەگرێ . **جگەری من :** هەناوی من .
**چەند وەختە :** لە مێژە ، ماوەیەکە . **دەسوتێم :** گی م گرتووە، ئاورم گرتوە **دەگرییێم :** زاری دەکەم.**دەنالم :**هاوار دەکە م ، نالین لە تاو یەنج و ئازارنە .**بۆ شەربەتی :** بۆ خواردنەوەی ، بۆ هیوای .**وەسلت :** گەیشتن بە تۆ . **لە جودایی :** واتە لە فیراقت ، لە جیا بوونەووەت . **نیە حالم :** بێ سەر و سامانم ، پەرێشانم .
**فەوتاوە :** نەماوە،لە ناو چوە . **لە یێگەت :** لە رێبازت ، لە سەر تۆ . **مژە :**تەمە خەمە ، پەژارەیە .ئەم وشەیە یان **دید :** یان ، **مودیدی :** لێرەدا بە هەردو جۆریەوە بە بۆچوونی من مانای دیت یەکەمیان واتە بینین ، بۆچون.یان مەودید **:** واتە ئەشق و ئەوین ) **بە تال :**خالی ، بۆش .بێ سود .
**هەرچەندە :** ئەگەر زۆر زۆریش . **کە بیشێنم :** کە ئاوی بۆ فێنک کردنەوە و پاکی پێ داکەم . **دەروازە :** دەرگا . **بمالم :** گەسک بدەم ، خاوێنی بکەمەوە .
**هێشتا :** هەر ،دیسان .**هەیە :** دەتەوەێ ،مەوجودە .**مەیلت :** ئارەزوو،تاسە **کەبسووتێ :** کە گیی تێبەربێت ، کە بە ئاگربسوتێت .**جگەری من :** هەناوی من
**تۆ :** یاناوی دوەم شەخسی موفرەدە . **پادشەهی :** مەلیکی ، شاهی.**خاوەر:** رۆژهەلات . **روو:**گۆنا، روخسار ،.**لە بۆ تۆ :** لۆ تۆ ، بۆ تۆ .
**تۆ سەییدی :** تۆ گەورەی . **هەم سەروەری :** خۆشەویستی ، پیشەوای .**من :** یاناوی یەکەم شەخسی موفرەدە ، ئەز . **عەبد :** کۆیلە، بەندە. **دەری تۆم :** دەرگای تۆم **تۆ بازی :** تۆ هەلۆی ، تۆ شاهێنی.**لە سەر :** لە بان ،لەسەرو .
**ئاسک :** مامز ،ئاهوو . **من :** راناوی یەکەم شەخسی موفرەدە، **سەیدی :** یاوی ، نێچیری ، **دەسی تۆم:** دەستی تۆم .

PDF 4 KURD



**پێت وایە :** لات وایە ، وادەزانی .کە نەی چێشتووە **:** تامی نەکردوە ، نەی خواردوە وەدی نەکردوە . **دەشتی :** نازناوی شاعیرە . میحەنی تۆ **:** ئازارو رەنجی تۆ،جەفای تۆ .

**ئیسپاتی :** وەدی هێنان،چەسپاندنی ،داسەپاندنی . غەدەنگبازی **:** تیرهاوێژی،تیربازی.**دەکەی :** ئەنجام دەدەی . **بۆ جگەری من :** بۆ هەناوی من .

**مانا بە گشتی** :

وادەروونی من تەژی ئازارو ژانە لە تاو دووری تۆیاو هەمیشە جگەری من گی لە ژەهرەو جەفایە،والەحەژمەتی تۆدا ژیانی من هەمووی یەنج و ئازارو خەمە، من هەروەکو پەروانە وامە و هەردەم بۆ دیداری یووی یوناک وجوانی تۆی وەک چرا بوومەتە قوربانی و هەردەسوتێم ،کەوا تەواوی عالەمیش بە تێکیایی وا گیرودە و شێواون لە تاو سوتان و بۆن کیوزی هەناوی من ، سا دەی ئەی دلبەری لە بار و نازدارم دەوەرە سەیرێکم بکە و بزانە کە من چیم وەسەر هاتووە ، وەرەبیوانە منێکی کە تەواوی ژین و ژیانم بووەتە حەلقەی سەری زولفی تۆی ئازیزم.ئەی دەم بچکۆلانەی وەک خونچەگول جوان و شیرینی دانیشتوانی باغی ئیرەم،ئەی پاک و بێگەرد وەک ئاوی بیری زەمزەم،دەهەستەجارێک وەرە بپرسە لە ژیان و گوزەرانی من و ئازارەکانی ناو دل و دەروونی منی خەمبار، وا من لە تاوانی تۆدا هەردەم خەمگین و پیلە دەردو یەنجم،وا دەرونم پی لە ئاگرو گیە، لەم دووریە و غوربەتەدا وابۆت دەسوتێم و دەنالێنم، ئەم دەرد و خەمانەم هەمووی لە پێناو خەت و خالی یووگەیی خۆمە کەوا پشووی ژیانم تابلێی بەئاستەم وسەختەهەر بەو شێوە هەواداریەو فیزی تۆیە کەوا من فەوتاوم و بەرەو نەمان دەچم و لەرێگەی بەژن و بالای بەرز و گەردەنی جوانی تۆیە کەوا تەرکی نیشتمانی خۆشم کردووە و بومەتە شێت و شەیدای تۆی دلبەرو دین بەر، شەوانەش هەر لەبەر خاتری تۆیە کەوا بەبێ کەسی و بێ پەناو بێدەر هەروا دەگریێم و دەنالێنم ، سا وەرە بۆساییژی برینیانی کولی سەر دلی من چیتردەست مەدە خەنجەر و هەتوانی زامەکانم بکە و با لەم غوربەت و دووریەدا بائەم هەموو ژین و ژیانەم بە خۆیایی نەیواتن و بۆ هەمیشە شادم بکەو با یزگاربیم ، ئەم چاوەی بە وێنەی ئاسکی تۆ لە بۆ من رەنج وئازارو میحنەتە، ئەم جۆرە نازو نوزەی یۆیشتنی پی لەلار ونجەی سەر پەنجەکانی تۆ هەمووی بۆمن زیللەت و پەژارەو ئازارە،ئەم ئەفسوونەی سەر سینەی تۆ خەمە بۆمن،ئەم نارنجانەی بەری بەژن وبالای وەک داری سەروی نۆ فیتنەیە بۆمن، هەتا کەنگی جگەری من بەم شێوەیە لە سوتان وجەفاو رەنج و ئازارو پەژارە دابێتن،دلی من وەک بولبول وایەو هەربە هیوای گولی ناو بەهەشتی یەنگینی تۆم،بۆیەکەشە کەوا هەمووتەمەنم وژین و ژیلنم بووەتە ئاوازی قوربانی و هەمیشەیی دەروازەی زەنویری جوان و پاکی تۆ،سا ئەی زالم دەوەرەمەیلێک بکەو دلۆڤانیەک بکەبە نەخۆشی خۆت،وا لە تاوانی تۆ و دووری تۆدا وەک یاقوب

پەیامبەرە جگەری من و هەردەم دەسوتێیم وپی لە ئازارو یەنج و دەردم.زۆر لە مێژە وا دەسوتیمو هەمیشەزاری و گریانمەبۆگەیشتن بە تۆی ئازیزو خۆشەویستم،وا لەم دووریەدا هیچ ژیانێکم نەماوە، هەرچەندە لە یێبازی تۆدا دەیوانم هەروا پی لەخەمم هیچ شتێ وەدی ناکەم و دیدە بەتالم، هەرچەندە کە یۆژو شەوانەش دەروازەی تۆ بیشێنم و پاکی بکەمەوەو بیمالم،بەلام هێشتان تۆ دەتەوی و مەیلت لە سەر ئەوەیە کە من دل بەخەم بم وجگەری من بسوتێێن، تۆ کە پادشاهی رۆژهەلاتی و یووی منیش لە بۆ تۆ گەنجەو تۆ کە گەورەو سەروەری و منیش چاوم لە تۆیەو بومەتە کۆیلەی درگای تۆ، تۆ کە ئێستاکە هەلۆی لە سەر ئاسک و منیش یاوی دەستی تۆم هێشتان پێت وایە کە دەشتی ئازار و یەنج و کوێرەوەری نەچێشتووە و هیشتان هەر دەتەوێ بە تیری جەرگ بیی خۆت هەناوی من لەت بکەیت و بۆیەکە هەروا تیربازی دەکەیت بۆ لەت کردنی جەرگ و هەناوی من و دەتەوێت بەم شێوۆەیە زیاتر جەرگ و هەناوی من کەرت کەرت تر بکەیت و زیاتر یەنج و ئازارم بدەیت.

*

PDF 4 KURD



## تالیب بە ڕوخی گوڵ

تــا لیب بەڕوخی گوڵ بەدەم یـــــارە دڵی من
مائیل بە قـــەدەح شـــەربەتی فینجانە دلی من

ڕاوێکـە لە ڕا دایـــــــــە و داوێکــە لــە ڕوودا
بەم مەحجەیە داوانە زەنـجــــــیرە دلی مـن

باکم چـیە گـەر وەســــــلی تۆ بێـتن بە سلێمان
چـوون پـادشـەهی زەمزەم و عـەدنــانـە دڵی من

عـالەم بەخـــەیــال لـەبی تۆ بوونـەتـە غەوواس
بۆیێ لە هیــلاکــا لە دەریـــــــــــاوە دڵی من

لـــەم ڕۆژەوە ڕوژت لـــە ئـــوفـق داوە بــەڕووما
پـڕ ئـاوور و جـۆش و حـــــــەڕاراتە دڵـی مـن

تەشریحی تــۆ بـەم منـەوە گەر بێتــە تەبەییون
عالەم بە هەموو کەوکەبی ســــــەییارە دڵی من

دەشـــتی وەرە لەم میحنـەتە بـــاوەڕ مەکەدەرچی
تا ڕۆژی قـیامـــەت لە جـــەفا دایـــە دڵی مـن

---

**ماناى وشەكان**:

**تالیب** :داواکار،داخوازی. **بەڕوخی** : بەڕوویی . **گول بەدەم** : ناوە بە شیرن زمان وکەسانی خاوەن وتەی باش و پڕ لە خۆشەویستی و شاد دەگوترێ ئەویش مەبەستی یارە خۆشەویستەکەی خۆیەتی ،واتە زار پـــڕ لە گول و قسەی خۆش و شاد، **یار** : خۆشەوبست . **دلی من** : قەلبی من .

**مایيل** : حەز،ویست ، هیوا ، بەرەو. **قەدەح** : کاسە لیوان . **شەربەت** : خواردنەوە . **فنجان** : گلاسی چوک کە بۆ قاوە پێخواردنەوە بە کاردێت .**دلی من** : قەلبی من .

**ڕاوێکە** : یەک ڕاوە ، سەیدێکە . **لە ڕادایە** : لە ڕێگەدایە . **داوێکە** : یەک داوە یەک تەلەیە **لە ڕوودا** : لە ڕوخساردا، یا لە بەرامبەردا،لە پێس دا.

PDF 4 KURD



**بەم :** ئامرازی هێمایە بۆ نەزیکە .**مەحجەرە :** دەورا دەوردراو،گرداوگرد ،لە هەرچوارلاوە .**داوانە :** کۆی داو زۆرداو . **زەنجیر :**ئاسنی بەهێزی حەلقەحەلقەو لێک قایم کراو **دلی من :** قەلبی من **باکم چیە :** ترسم لە چیە . **گەر :** ئامرازی مەرجە ئەگەر .**وەسل :** گەیشتن . تۆ :ڕاناوی دوەم شەخسە . **بێتن :** وەدی بێتن.

**سلێمان:**ناوی سلیمان پەیامبەرە، بە مانای ژەهریش هاتووە،ناوە.**چوون :** چونکە . **پادشەهی :** مەلیکی ، **شاهی زەمزەم :**پادشای کانیاوی زەمزەم کە لە مەککەیە،ئاوی زۆر،**عەدنان:** هەمیشەمانەوە لە بەهەشت،ناوێکە.

**عالەم :** خەلک . **خەیال :** بیر کرنەوە .**بوونەتە :** بووینە. **لەبی تۆ :** لێوی تۆ . **غەوواس :** مەلەوان ،بەو کەسانە یان ئەو کەشتیانە دەلێن کە لە ژێر دەریاکانەوە دان و مەلەوانن.

**بۆیێکە :** لە بەر هەندی . **لە هیلاکایە :**لە گرفتاریدایە .**لە دەریاوە:** لەناو دەریادا **لەم ڕۆژەوە :** لەم کاتەدا، لەم ڕۆژەدا . **ڕووت :** ڕوخسارت . **لە ئوفوق :** لە ئاسۆ . **داوە :** وێنداوە ،یان تەلەیە .**بەڕووما :** بە روخساری من ،بە روخسارما.

**پڕ :** تەژی . **جۆش :** کولاو زۆر گەرمەوەبوو **حەڕاڕات :** کۆی حەراەتە ، زۆرگەرمایی.

**تەشریح :**پارچەپارچە کردن ،لێک جیاکردنەوە ،.بەو زانیاریەش دەلێن کە باسی جیاجیا کردنەوەی ئەندامەکانی جسم و پەیوەندیەکانیانەوە دەکات .**تۆ :** دوەم شەخسی تاک . **بەم منەوە :** بەمن . **گەر :** ئەگەر . **بێتە :** بە وجود بێت . **تەبەییون :** دیار ،ئاشکرا ، شیَ کردنەوە ،بەیان کردن .

**عالەم :** جیهان ، خەلکان **هەموو:**گشت. **کەوکەب :** ئەستێرە . **سەییار :** گەڕیدە .

دەشتی نازناوی شاعیر **وەرە :** بێ **لەم میحنەتە :** لەم ڕەنج و ئازارو دەردە **باوەڕ :** عەقیدە . **مەکە :** نەکەیت . **دەرچی :** دەرباز ببی .

**تا :** هەتا .**ڕۆژی قیامەت :** ڕۆژی واپەسین .ڕۆژی ڕەستاخیز .**لە جەفا :** لە ڕەنج و ئازار . **دایە :** تێدایە . **دلی من :** قەلبی من .

---

**مانا بە گشتی** :

دلی من داواکاری ڕوخساری یاری وەکو گول جوان و دلبەرەو حەزم لە خواردنەوەی شەربەتی ناو فنجانایە بە دەستی ئەوا ،ئەمەش ڕاوێکەو لە ڕێبازو ڕێگەم دایەو داوێکیشە لە پێش دایە کەوابەو هەموو تـەلە و داوانەیە وا دلی من زەنجییرەو بە ستراوەتەوە،سامن چ باکێکم هەیە کە بگەم بە یاری خۆم و بە ئاواتی خۆم بگەم و بە یاری ئازیزی دڵی خۆم شادو خەندان ببم،ئەوکاتەش دلی من وەکو پادشای زەمزەم وایە و پێم وایە کە خاوەن هەموو شتێکم کە وەک ئەوە وام هەمیشەمانەوەم لەناو بەهەشتا دایە،ئەی یارەخۆشەویستەکەم وا بە ئاوات و

یادی لێوانی تۆیە کەواتەواوی عالەم بوونەتـە مەلەوان لە ناو دەریاکانەوە، هەر بۆیەشە کەوا دلی من لە ناو گێژاوی دەریادا نوقم بووە و تووشی بە گیر و گرفت و نەمان هاتووە،لەو کاتەوە کە تۆ لە ئاسۆیا تیشکی ڕووی خۆت لە ڕووی من داوەو خۆت نیشانی من داوە دلی من تەژی گڕی ئاوور بووە و هەروا دەسوتێتن و گڕی تێ بەربووە،ئەگەر بێت و باس کردنی تۆو شێوەی تۆ بەمن ڕوون بکرێتەوەو بەتەواوی شێ بکرێتەوە ئەوا تەواوی ئەم جیهانە لە دوای ناسین و باس لێ کردنی ئازارەکانی دلی من دەگەڕێن و باسی لێوە دەکەن ،ئەی دەشتی خۆ گەلێ سەحتە کەواتۆ لەوهەموو میحنەت و ڕەنج و ئازارانەدا دەربچیت و ڕزگاریت ببێت ، دەبێ هەتا ڕۆژی واپەسبینیش هەر ئاوا لەناو کویرەوەری وجەفاو حەسرەتان لە تاو یارە شیرینەکەی خۆت دابیت و قەت بە ئارەزووی خۆت ناگەیت.

*

## تەجدیدی سەباحم بۆوە

تەجـدیدی سەباحم بـۆوە نەرگس بـەنەسیمت
مەشقی هەوەسم کەوتە سەر ئەوڕاقی بەســیمت

مەشــغولــە هەمووەدەم دلی بێچـارە و و میسکین
بـەم خــەتتـە عەلەمـدارە ئەلــەم کــارە وەسیمت

ئـابی کـەڕەمت زوهــرە وەلــێ زەهــریە بــادەی
تاقـی مەلەکـولمـە وتە ئیرەم باغــە قـەسـیـمـت

میـزانی حیســــــابم بەجـەفا قــانیـعە ئـەمما
میزابەکە خوین ڕێــزە لەدەست شـیری جـەسیمت

سوتــالە فیراقی قەدی سەروت تــەلــەفـی بوو
ئـومـێدی ویسـالم بووە فیدیەی زەڕ و ســـــیمت

بـەم تەرزە ئەلـەرزێنـی ســەمەری خانــەی عومـرم
رووح و ســـــەرو مالم لە سەر ئەفـکاری ڕەسیمت

سـوتانی دلی دەشــــــتیی و هەم تیغی دوو ئەبـرۆت
تەحریر دەکەن ئەم جـەورەلەســــەرعەبدی ئەسیمت

---

مانای وشەکان:

**تەجدید**:نویَ کردنەوە . **سەباحم** : بەیانیم **بۆوە**: کرایەوە **نەسیمت** : سروەت .
**مەشقی** :تەمرین ،نوسین **هەوەس** : زەوق، یاد **کەوتە**:هاتە،چووەسەر **ئەویاقی** : بەرگەکانی نامەکانی .**بەسیمت** : خەندانت ،لەزیزت ،خەندەوەرت.
**مەشغول**: لە فکردایە:لە یاددایە ، خەریکە .**هەمووەدەم**: هەمووکاتێ .. **دلی**: قەلبی **بێچارە** : بێ هەتوان ،بێ چابوون . **میسکین**: هەژار، فەقیر .
**بەم** :ئامرازی هێمایە بۆ نەزیک .**خەتتە**:هێلە،مەرزە،سنورە.**عەلەمدارە**: پەرچەمدارە،خاوەن نیشانەیە **ئەلەم**: ژان ،ئازار ،یەنج،دەرد **کارە**: کردەوەیە عەمەلە **وەسیمت** :زیبات ،خۆش یووت .

PDF 4 KURD



**ئابی:** ئاوی . **کەیەمت** :سەخاوەتییت ،مەردایەتیت .**زوهرە** : گولاویە.**وەلیٚ:** بەلام **زەهریە:** ژارە، ژەهرە. **بادەی** : جامی ،لیوان بەرداخ.یان بە پێچەوانە یەکەم زەهر،دووەم زوهر .

**تاقی:**بەرزایی ،دیـواری بلنـد .**مەلەکولمەوت:**مەبەست عیزیائیلە،ئەو فریشتەیەیە کە گیانی خەلک دەبات و دەمرێنیٚ . **ئیرەم:** ناوی ئەو باغە خۆشەیە کە لە بەهەشت دایەو بیٚ وێنەیە.**قەسیمت:**خۆش یووییت: بەشت ،سودت.

**میزان:** تەرازوو **حیسابم:**ژماردنم **بەجەفا:** بە ئازارو یەنج ،دەرد و ژان . **قانیعە** : خۆشحالە بەبەشی خۆ ،رازیە . **ئەمما:** بەلام .

**میزابەکە:**سولاوکەیە،ئەو شوێنەی کە ئاوی پیا دەیوات .**خوێنێژ:**کەسیٚ کە خوینی خەلک بیێژیٚ .زۆردار.**لەدەست:** لە چنگ .**شیر:**ئامرازێکی شەی پیٚ کردنە لە زەمانی کۆندا زۆر بە کار دەهات .**جەسیم:** تیژ،بویەندە . سوتا: ئاگری گرت. لە فییاقی: لە دووری، لە جیابوونەوە ، لە نامۆیی، لە غەوارەیی لە غەریبی.قەدی سەروت : بەژن و بالای بەرزو وەک داری سەروو بلندت تەلەفی بوو: لە ناو چوو ، نەما . **ئومیدم:** هیوام،ئاواتم، ئارەزووم .**ویسالم** : گەیشتنم ، شاد بوونم. **بووە:** بووەتە ، بووە بە . **فیدای** : پیشمەرگەی ، قوربانی .**زەیوسیمت:** زێی و خشل و بەرگت .

**بەم تەرزە:** بەم شێوەیە . **ئەلەرزێنی:** تەکان دەدەی ، هەلدەکەنێنی ،بەرەو نەمان دەبەی. **سەمەری:** بەری . **خانەیی** : مالی ،لانەیی . عومرم : تەمەنم .

**رووح:** گیان . **سەرو مالم** : ژیان ودارایيم.**لەسەر:** لە رێی ، لە رێبازی.**ئەفکاری:** هەست وبیری ،بۆچوونی .**یەسیمت:** نەخشە بۆ کێشراوت .

**سوتانی** : ئاگر گرتنی ،گی گرتنی. **دلی:**قەلبی . **دەشتی** : ناز ناوی شاعیر **هەم:** هەروەها۔ .**تیغی دوو ئەبرۆت:**ئەبرۆی وەک تیغت ،برۆکانی بورەندەت.**تەحریری** : رزگاری،سەربەستی. **دەکەن:** ئەنجام دەدەن .**لە سەر:** لەبێی

**عەبدی:** کۆیلەی ، بەندەی . **ئەسیمت:** گوناهبارت .

---

**مانا بە گشتی** :

ئەی نەرکسی جوان و بۆن خۆش من بە یانیم بە سروەی فێنک و خۆشی تۆوە کراوەتەوە بۆیەکە وا دلم هاتە سەریاد و بیرەوەری جوانی و لە باری تۆوە ،هەمیشە دلی منی زامدارو بێچارە مەشغوولی تۆیە ، وا بەم خەت و جوانی و یووی خۆشتەوە بووی بە نیشانەی دەردو ئازارەکانم ، تـاوی ژیان بەخش و سەخاوەتی تۆوەک گولە بە لام نۆشینی بادەییٚ لەو ئاوە ژەهراویە(یان بە پێچەوانەوە) ، باخی بەشی تۆ وەک باخی ئیرەم وایە و هەیوانی بەرزی تۆ فریشتەی روح کێشانـــی لە ژێردایە ، من بەوە یازیم بەوە کە تەرازووی چاکەو خراپەی من بەلای رەنج و ئازارو حەسیەتانەوەیە، بۆیەشەجەستەی من وا بەشیری تیژی تۆ برندارە و حوێنی بە سولاوکە لیٚ دێتە خوارەوە،من سوتاوم ولە تاو دووری قەد و بالای بەرزی تۆ وا

PDF 4 KURD



لە ناو چووم و هەموو ئارەزووی گەیشتنم بە شادی و خۆشی وا بوومەتە قوربانی تۆ، ئا بەم شێوەیەیە کەتۆ بەری تەمەنی ژیانی من دەلەرزێنی وا گیان و هەموو داراییشم لە سەر بیرو بۆچونەکانی دیاری کراوی تۆدا داناوە، تەنیا یەکگرتن و یەکبوونی سوتانی دلی دەشتی و هەردوو ئەبرۆکانی وەک تیغی تۆنە کە بە یەکەوە لەم هەموو جەفایەدا رزگارم دەکەن و ئەم هەموو زولم و زۆرداریەش لەسەر بەندەی گوناهبارت بە تەواوی وەلادەبەن و دوور لە هەموو رەنج وجەفاو میحنەت و ئازاران دا دەبم وئارام وئاسودە دەژیم.

*

PDF 4 KURD



## جاناوەره

جانا وەره سەر تـەختی هـومایـۆنی ویســـــالا
اذ فات لک الـرّوح مــن الهجـــــــــــر قتالا

بێ سوچ وقەباحەت لەسەرئەم جەورەش ئەفەرمووی
انّی لمــن الهـــــــــــادم بالطـرف جبـــــالا

چەنـد موددەتە لـەم غوربـەتـە پڕ نیـگـبەتە چـاوم
کـم مـن لهـب الفـــــــــرقه قـد لاح طوالا

نـاتـەرزیە ئـەم دەرزیــە لـەم بـەرزیە بـــرزی
والامر لـدی الحــاکم بالفتــحـــــــــة حالا

ئـە م قـەلبـە کە بـەر قـەلبە لە بەر قەلبی دوو بازار
فـالـویـل لمـن حـــــــــــول بالجـرّ قفالا

روو بێمـە کـە بـێ بێمە لەبی بـێ قـەســمم بـێ
باللّـە ومـاکـان لی الـــــــــــذنب جدالا

دەشـتی کە بـرِشتی لەچـکەی چـاوی غـەریبـی
فـالنّـار مــــــــع الـرّمح علی الصـدق امـالا

*

---

**مانای وشەکان**:

**جاناوەره**: گیانا وەره سەر **:**بالای .**تەختی** **:** کورسی .**هومایۆن**: پیرۆز،خۆشبەختی.**ویسال**: پێک گەیشتن، پێک شاد بوون .

**اژ**:کە .**فات**:یابرد ، بەسەرچوو.**لک**: بۆ تۆ.**الرّوح**:گیان . **من**:لە. **الهجر**: دووربوونەوە،دوری ، **قتال**: کوشتن .

**بێ**:بەبێ . **سوچ** **:** گوناە،تاوان .**قەباحەت**:کاری نایەواو ناپەسەند،زەرەروزیان .

**لەسەر**: لە بالایی، لە گەل .**ئەم**: یاناوی هێمایە بۆ نەزیک .**جەور**: ستەم**:**زولم،زۆرداری . **دەفەرمووی**: دەلێی .

**انّی** **:** ئەمن ، ئەز.**لمن الهادم**:بەیاستی لە وێراکاران . **بالپرف**:بە چاو قوچانێک،بە چرکەیەک .**جبال**:کێو،چیا.

PDF 4 KURD



**چەندموددەتە :**لەمێژە،دەمێکە **.لەم غوربەتە:**لەم دووریە، لەم نامۆییە.**پی:** تەژی مشت .**نیگبەت:**بەدبەختی،ناخۆشی ویەنج،دەردوئازار. **چاوم:**دیدەم .

**کم :** چەند . **من:** لە **لهب:**گیی ئاگر،بلێسەی ئاگر الفرقە **:** جیابوونەوە.دوور بوونەوە ..**قدلاح :** بەیاستی دەرکەوت. **پوالا:**درێژ

**ناتەرزیە:** نایەوایە، ناجۆرە . **ئەم دەرزیە:**ئەم قولابەیە ،ئەم سنجاقە کە یەقەی پێ بەستراوەتەوە. **لەوبەرزیە:**لەو بالایە کەمبەست سینەی یارە .**بیزی:** لە بەین بچێ،ژەنگاوی ببێ و لە ناو بیوات .**والأمر:** فەرمان .**لدی :** لە لایەن،لەکن **الحاکم:**فەرمان یەوا .بالفتحە **:** بەکردنەوەی . **حالا :** هەرئێستا .

**ئەم قەلبە:**ئەم بەستنە،ئەم گرێیە .**کەبەر قەلبە:** کەلەخوار دلەوەیە.**لەبەر:**لەژێر لەخوار.**قەلبی :**دلی .**دوبازار:** مەبەست جووتەمەمکۆلەی یارە لە سەر سینەدا.

**فالویل:**ناوی بیریکی ئاگرینە لە دۆزەخدا **لمن:**بۆکەسێکی . **حوڵ:**بگۆیی،هەول بدا **بالجرّ:**بە یاکیشان،یابکێشی . **قفالا:** بەستراو،گرێدراو .

**یووبێمە:**بەرەو بێیە ،مەبەست لە بێ مەمکۆلەی یارە**:.کەبێ بیمە:**کەبێ ترسم (یان بە پێچەوانەوە ،**یووبیمە:** بەرەوترسم .**کەبێ بێمە:**کە بێ بێمە ،یەکەم بە مانای ترس و دووەم بە مانای بێ وەیان یەکەم بە مانای بێ و دووەمیش هەر بە مانای بێ ،یان یەکەم بە مانای بێ و دووەم بە مانای ترس کە بە هەموو جۆرێک مانای دێت **لەبی بێ :** واتە سوێندم بە پیتی بێ بێت کە دەبێتەبالله،وەیان مەبەستی سوێندخواردنە بە پیتی بێی کەبێ تەشبیە کراو بە مەمکۆلانی سینەی یار **قەسەمم بێ :**سوێندم بێ .

**بالله :** بەخوا . **وماکان:**وەبەیاستی نیە. **لی الژنب :**من گوناهم نیە،بێ تاوانم.

**جدالا:** بەبێ موناقەشە،بەبێ گفت و گۆو چەندو چوون .

**دەشتی:**نازناوی شاعیری هێژا مەلاخدرئەحمەد نانەکەلیە . **کەبیشتی :**کە سوتاوی ، کە برژاوی .**لەچکەی :** لە هاتنە خوارەوەی ئەسرینی.**چاوی :**دیدەی **غەریبی :** نامۆیێ دووری ، غەوارەیی .

**فالنّار:**کەواتە ئاگر . **مع :** لەگەل .**الرّمح :**نێزە .**علی:**لەسەر **الیّدق:**یاستی **آمالا:**هیوا، ئاوات

---

**مانا بەگشتی**:

ئەی گیانە وەرە با بەیەک بگەین و لەسەر تەختی خوشبەختی دا بە یەکەوە شادو خەندان ببین و بەختەوەر و ئاسودەو دوور لە خەم بژین ، دەوەرە کەوا من کوژراوی دووری تۆم و بۆتۆ وا گیانم لەدەست داوە ولە ناو دەچم ، من کەوا بەبێ گوناه و دوورم لە هەموو کارێکی نایەوادا ، لە گەل ئەو هەموو زولم و زۆریەش کەوا تۆ دەیکەیت و بووەتە هۆی لە ناو بردنم و،هەمیشەش هەیەشەو گویەشە دەکەیت و دەلێت **:** من لەو کەسانەم کە تا بۆم بکرێت مال ویرانی وبەدبەختی وەدی دێنم وبە چاو قوچانێک کێوان دەیوخێنم،خۆ زۆر لە مێژە من لە تاو ژیانی

PDF 4 KURD



دووری و غەریبیدا هەروا پی لە دەرد و یەنج و ئازارانم ، کە تائیسا کەش هەروا گیی ئاگری نامۆیی و دووریم لە نـاو دەروندا لە تاو تۆدا گلپە دەسێنیَ وهەروا نەکوژاوەتەوە،خۆ گەلیَ نایاستە و نالەبارەکەوا ئەو دەرزیەی کەوا لەو بەرزاییە یەقەی خۆت پیَ بەستاوەتەوە و هەر ئەاوا بمینیَتەوەو لە شوێن خۆی دا بیزیت، بۆیەشە کە بییاری فەرمانیەوا ئەوەیە کە هەر ئێستاکە ئەم سنجاقەی کە لەو بەرزاییەوەیە بکریَتەوەو سینەی تۆوالابیَتەوە ، وای بۆ ئەو کەسەش کە دەستی دریَژ بکات بۆکردنەوەی ئەم گرێیەی کەوا لە خوارەوە لە ژێر ئەو جووتە مەمکولانەیەت دا بەستراوە تەوە ،خۆمن هیچ ترسێکم نیە کەوا یوو بەرەوبیَمە، و سوێندیشم بە پیَتی بیَ بیَت (واتەباللە) کە من هیچ گوناهێکم نیە و بە بیَ چەندو چوون بیَ تاوانم یان(من بۆیەکە روو بەرەو بیَمە چونکە دورم لە بیَ)وا منی دەشتی لە گەل ئەوەش دا کە برژاوم بۆ تۆ و دەروونم پرلە ئاگروگیە و بە گریان وسوتانی دلی پی لە ژان و ئازارم ،وا بە ئاوری دووری وییَشتنی ئەسرینی غوربەت و نامۆیی لە چاوانم و بریناني پی لە ئازارایشنم دا هەرگیز هیوام لیَ نابییَت وهەرگەش بینم .

*

PDF 4 KURD



## جەژنەیی

جەژنەیی روح و جەســەدم مـاهـی دین
قـــــــیل ادخل النار مــع الداّخلــين

چونکە ئیتاعەش وەیە تەقوایـە خــۆ
ازلفــت الجنّـــــــــــــة للمتّقین

ئاه و هەناســــــەی منـە لەم رۆژە دا
تـأتی الســـــــــــاء بدخـان مبــین

سا چیە ئـەی بت کە بلێـــی دەفعەیێ
انّه من عـــــــــــبادنا الصــالحیـن

حەقیەتی مەلعــونی ڕەقــیـب کە بـلـێ
انّی لکـم منـە نــذیـــــــر. مبــین

قاسیــدی ســادیق چ بلــێ انّمــــا
علی رســـــــــولنا البـلاغ الـمـبین

یاری تۆ بێ میســلە دەســا دەشـتیــا
فلا تکونـنّ مــن المشـــــــــرکین
*

---

**مانای وشەکان** :

**جەژنەیی:** عیدی ، شادیی وخۆشی .**یۆحی:** گیانی .**جەسەدم :**تەنم جەستەم . **ماهی دین:**مانگی ئایین .**قیل:**گۆتیان،ئەوانەی ، هەندێ کەس گوتیان .**ادخلی:** داخل بن بچنە ناو . **النّار :** ئاگر **مع :** لە گەل . **الداّخلین :** ئەوانەی کە چونەتەژوورەوە چونکە لە بەر ئەوەی .**ئیتاعەش وایە:**گوێ یایەلیش وایە، خواپەرستیش وایە **خۆ:** دەنا،ئاخر.**ازلفت:** رازاوەتەوە **الجنّە :** بەهەشت .**للمتّقین :**بۆ پارسایان ، بۆخواناسان ، بۆ ئەوانەی کە تەقوا دەکەن و کاری باش ئەنجام دەدەن .

PDF 4 KURD



**ئاه :** حەسیەت .ئاخ .**هەناسەی منە :**پشووی ئەزە .**لەم یۆژەدا :** لەم کاتەدا ، لەم وەختەدا .

**تأتى:** دێتن . **السّماء :** ئاسمان . **بدخان:**بە دوکەلیکی .**مبین :** دیار.

**ساچیە:** کەواتە چیە. **ئەی بت:**ئەی سەنەم، **کەبلێی:**کە بێژی .

**انّە:** بەیاستی . **من:** لە. **عبادنا:**پەرستگارانى منە. **الیّالحین :** کارچاکان ، باشەکان ، شایستەکان.

**حەقیەتی:**مافی خۆیەتی **مەلعون :** نەفرین لێکراو لەعنەت لێ کراو،شەیتان.

**یەقیب:** نەیار،دوژمن. **کەبلێ:**بەیاستی بێژێ . **دەفعەیێ:**تەنیا جارێک

**انّی :** بەیاستی من .**لکم:** بۆ ئێوە . **نژیر :**تــرسـێنەر. **مبین:** دیار .

**قاسێد:** پەیامبەر. **یّادیق:**یاستگۆ،دروستکار. **چ بلێ:**بلێ چی . چی بێژێ .

**انّما :**بەیاستی **:علی:**لەسەر **رسولنا:**پەیامنـــیرمان ،**البلاغ:**ئاگادارى **المبین:**دیـار

**یار:** خۆشەویست،هەڤال . **تۆ:**یاناوی دوەم شەخسی تاکە .**بێ میسلە:** بێ وێنەیە

**دەسا:**کەواتە .**دەشتیا:**ئەی دەشــتی .

**فلاتکوننّ من:**لەوانە مەبە کە، وەک ئەوانە مەبە کە.**المشرکین :** کافران ، ئەوانەی باوەییان بە خوا نیە و هاوتا بۆ خوا دروست دەکەن .بێ باوەیان

---

**مانا بە گشتی**

ئەی یاری من ئەی مانگی جوان و هەست و بیری من وا پی بە دل و بەگیان وجەستەوە جەژنەدەگرم ،چونکە گوتیان تۆش ییۆبۆ ناوئەو ئاگرەی کەخەلکی تریش تیایەو لە گەل ئەوانەبم کە لە ژوورەوەن ،خۆ بە هەشت بۆ ئەوانە یازاوەتەوە کە گۆییایەلان و پارسایان و خواپەرســتانن ،.وا هەناسەی ئاه و حەسیەت و جەفای منە لەم یۆژەدا ئاسمان پیلە دوکەل دەکاتن و لەوبەرزاییەوە ئەو دوکەلە زۆر بە یوونی دیار دەبێتن ، دەسا چی دەبێت ئەی دلدارەکەی من کە تۆ بێت و بەیاستی بلێت کە ئەوە لە پارسایانی باش و دلسۆزو بە وەفای منە،کەواتە شەیتانی نەفرین لێ کراوو دوژمن هەقیەتی کە بێت وابلێت کەمن بۆ ئێوە دلسۆزو چاکم ،ئەدی پەیامنیری پاک و یاستیش لەوە زیاتر چی بلێت کە تەنیا لەسەرمن ئاگاداری کردنێکی یوون و دیارە و لەوە بەولاوەچیترم لە سەرنیە، خۆئەی دەشتی یاری تۆ بێ وێنەیە، کەواتە سوپاس گوزاربە لەم بارەو لەم یووەوە کەواتە مەچۆرە یێزی خوا نەناسان و دوورکەوە لەوانەی کە هاوتابۆ خوادروست دەکەن و بێ باوەین .

*

PDF 4 KURD

### چ غەوغـایە

چ غەوغـایە ئیمــڕۆلە بـاغێ گـولان
کە سولتانە بولبول لە باغێ گــولان

دەلێن هەوری وەسلی هەموو عاشقان
دەبارێنی شـادی لە باغـێ گـــولان

نەمامی حـــەیاتم ئەوا هـــاتە بــەر
بە شەوقی ویسـالم لە بـاغێ گـولان

بەڕەنگی حـــەبیبم چ فەخرێ ئەکـا
دەمی خونچەیی گل لـــەباغێ گـولان

شنەی سەرچنارێ ئـەدا ڕەحمــەتێ
بە ئەڕبابی عەشیە لە بـاغێ گـــولان

بە ساقی ئەنـــازم کەبێ لەنجەکـەی
بدا کەوســـەری دل لە باغـــێ گولان

لە ئامینە هەردەم نەتیجەی دوعـــا
کە دەشتی بمینێ لـە باغێ گـولان

*

---

**مانای وشەکان**

**چ غەوغایە:** چ هەراو هۆریایە،چ داد و فریادە..**چ هاوارێکە:**چ دنگ و باسێکە،چ فریاد و هاوارێکە.**ئیمرۆکە:** ئێرۆکە،ئەمیۆکە.**لە باغێ گولان:**لە زەنوێران، لە باخچەی گولان ،لە میرغوزاران.

**کەسولتانە:** وەک پادشایە،وەک شایە **:بولبول:** هەزارە،بالندەی جوان و ئاشقی گول **لە باغێ گولان.** لە زەنوێران لە باخچەی گولان .

**دەلێن:** دەفەرموون ،دەبێژن. **هەوری:**هەمان تەم و تومانی چیکەلە ئاسمانەوە بارانی لێ دەبارێت ، دایکی باران .**هەموو:**گشتی.**عاشقان:** ئەویندران،دلداران .

**دەبارێنی:** باران دێنێ .**شادی:**خۆشی .**لە باغێ گولان :** لە زەنوێران، لە باخچەی گولان .

PDF 4 KURD



**نەمام:** تازە پیَ گەیی و،شەتل .**حەیاتم:** ژیانم.**ئەواهاتەبەر:** واپیَ گەیی.واگەیشت .

**بەشەوقی:** بەرۆناکایی،بەشادی وخۆشی لە زەوقی.**ویسالم:** گەیشتنم **لەباغیَ گولان:** لە زەنویَران، لە باخچەی گولان .

**بەیەنگی:** بە ویَنەی،بەسیمای بە چۆنیەتی شیَوەی .**حەبیبم:** خۆشەویستم **چ فەخریَ ئەکا:** چ شانازییَ ئەکا.،چۆن بە خۆی دەنازیَ

**دەمی:** زاری ،دە وی.**خونچەیی گول:** گولی تازەپشکوتوو. **لە باغیَ گولان:** لە زەنویَران، لە باخچەی گولان .

**شنەی:** سروەی ،نەسیمی.**سەرچناریَ:** سەرداری چناریَ ،چنارداریکی بەهیَزوپتەوەو بەرزو پەلک پانەو لە کوردستاندا زۆرە..**ئەدا:** دیَنی ،لیَی دیَ **یەحمەتیَ:** خۆشی وشادی..

**بە ئەیبابی.عەشرە:** بەو دەکەسانەی کە لە جیهاندا موژدەی چونە بەهەشتیان پیَ دراوە کە لە خانەوادەی پەیامبەر(د)و یارانی ئەون .**لەباغیَ گولان:** لە زەنویَران، لە باخچەی گولان .

**ساقی:** مەیگیَی.**ئەنازم:** شانازی دەکەم .**کەبیَ:** کەوا بیَت .**لەنجەکەی:** لەنجەکردن جۆرە پۆیشتنیَکی بەنازە،مەبەست هاتنی ساقی بەنازەوەیە ..

**بدا:** بداتن ،پیَشکەش بکات.**کەوسەری دل :** کەوسەر ناوی کانیاویَکە لە بەهەشت دەلیَن دەبیَتە یوباری شەرابەن تەهورا.**لە باغیَ گولان:** لە زەنویَران، لە باخچەی گولان .

**لە ئامینە هەردەم نەتیَجەی دوعا:** واتە لە دوای هەموو دوعا کردنیَک وشەی ئامین دەگوتریَت.یانی خوایە دوعاکەم قەبوول بفەرمووی و نیازەکەم وەدی بیَنی .

**کەدەشتی:** واتە دەشتی کە خودی شاعیرە .**بمیَنیَ :** بمینیَت،هەمیشەیی بیَت . **لە باغی گولان:** لە زەنویَران، لە باخچەی گولان ،لە بەهەشتا

**مانا بە گشتی:**

لەم بەهارە یەنگینەدا ئای چ هاوارو دادیَکە وا لە ناو باغیَ گولانەوە دیَتن ،وا ئیمیۆکە بولیَ ئاشقی گول لە ناو باغچەی گولان دا وەک پادشا وایە و دەنگ و ئاوازی شادی هەموو ئەوناوەی پی لە خۆشی کردووە،وا هەوری هەموو ئاشقانیش لە سایەی گەیشتن بە ئاواتیان لە ناو باخچەی گولاندا شادی و خۆشی دەباریَنیَ ، منیش والە سایەی شەوق و زەوقی گەیشتنم بە باغیَ گولان نەمامی ژیانم هاتەبەرو پیَ گەیشت ، بنواین کە خونچەی گول لە ناو باغ و گولزاراندا چ شانازیەک بە جوانی و لە باری و سیمای خوشەویسەکەی من دەکاتن ،وا شنەی فیَنک و خۆشی سروەی سەرچناران خیَر و بەرەکەت دینیَ و بە یادی ئەودەکەسانەی کە موژدەی شادبوونیان بەباغی گولان کە بەهەشتی بەرینە پیَ دراوە، من کە بە لەنجەولاری ساقی مەی گیَییش دەنازم کە بیَتە ناو باغیَ گولان

PDF 4 KURD



و بائاواتم بگەێنێ و ئاوی کەوسەری ژیانم پێ بداتن و دلم شادو خەندان بکاتن، بۆیەکە هەمیشەبۆ وەدی هاتنی ئارەزووودا کەمانەوەی منی دەشتی یە  لە ناو باغێ گولان ، خۆ دەست بۆ ئاسمان بەرز کردنەوەو گوتنی وشەی ئامینیش لە دوای هەر دوعا کردنێک دا بۆئەوەیە کە مرۆ بە ئاوات بگات و چی نیازە وەدی بێتن و دوعاکە قەبوول ببێتن.

*

PDF 4 KURD

## چ هاواره

چ هــاواره ئەم ئێـواره غـــەم كەوتۆتەبـەردڵ يــارەب
بە موژگـانى حەبيبــەم پـيلە ئێـش و ژانــە دڵ يـارەب

فەلەک سوڕاوە بورجى تاليعم بۆيێ بەڕەش دەرچــوو
لەچەرخى فيتنە كوژراوە مەزليمەت ماوەدڵ يـــارەب

بە يادى قيبلەيى ڕووحم بــە دائيـم مل بە زەنجيـرم
مەگەر عەنقــا نەجـاتم دا لـە داوى فيتـنە دڵ يـارەب

لە ڕۆژى مـەحشــەرا ديدەم خوناوەی ىووى دەپرژێنێ
دەنوسێ شەرحى هيجرانى حەبيب بەروەڕودڵ يـــارەب

گەلێ مەسرووروموشتاقم بە كـوشتـنما ئيشــارەت كا
ئەگەربێ و بەزولفى خۆی بدوورێ كفنەكەم دڵ يـارەب

موسـەلمانان ئەگەرمردم لە سەر ڕێگەی پياســەی بێ
سەرينى قەبـــرەكەم بەلكو دەكا ڕەحمێ بە دڵ يـــايەب

لە دونيادا كە نەينۆشى شەڕابى مەرحەمـەت دەشـــتى
لەڕۆژى ئاخيرەت شاد بكەی ســابەم ڕووەم دڵ يارەب

*

### ماناى وشەكان

**چ هاوارێكە:**چ سەر و سەدايێكە، چ دادو فيغانێكە،چ دەنگ وباسێكە.**ئەم ئێوارەيە:**ئەم شەوە،ئەم دواى نيوەڕۆيە.**غەم:** پەژارە،خەم **كەوتۆتەبەر:**هاتۆتەپێش،بەربويتەسەر.پێش هاتوە.**يايەب:** ئەی خودايە.
**بەموژگانى:**بە مژۆلكانى **حەبيبم:**خۆشەويستم، **پى:**تەژى.**ئيش وژان:** ژان وئازار.دەردو يەنج.**يايەب:**ئەی خودايە،ئەی پەروەردیگارا
**فەلەک:**گەردوون،ڕۆژگار،جيهان .**سوڕاوە:** **:**چەرخاوە،گەياوە. **بورجى:** دوازدە بەشى فەلەک.وەک **:**حەمل،سور،جوزا،سەيەتان،ئەسەد .. ..هەتادوايى
**تاليع:**شانس ،بەخت .**بۆيێ:**لەبەرهەندێ ،لەبەر ئەوەی. **بەيەش دەرچوو:**بوو بە يەش، يەش بوو.

PDF 4 KURD



**لەچەرخی:** لە گەردوونی،لە یۆژگاری.**فیتنەدا:**ئاشوبدا ،شەی و شۆیدا،بەلا،گویَچەلدا،پیسواییدا،ناخۆشیدا.**کوژرا:**مرد ، لە ناو چوو ،گیانی دەرهیَندرا. **مەزلیمەت:** گوناە ،زۆرداری .زۆرداری کە لە کەسیَ کرابیَ . **یان موزلیمەت:** زۆرتاریک ،شەوی قەقنەس .**دل:**قەلب .**یایەب:** ئەی خودایە .

**بەیادی:** بە فیکری ،لە بیری .**قیبلە:**ڕوگە،ئەوشویَنەی کە بۆ خۆشەویستی ڕووی تیَ دەکەن،مەبەستی دەشتی ئەو خۆشەویستەکەیەتی کە کچیَکی جولەکە بووە لە گوندی بیَتواتە کە دەشتی لەوی فەقیَ بووە ئاشقی ئەو کچە موسەویە بووە بە ڕوگەی خۆی دادەنیَت .**روحم:**گیانم. **بەدائیم:** بە هەمیشە،بە هەردەم، هەموو کاتیَ.**مل:**ئەستۆ.**بەزنجیرم:**زنجیرکراوم بەستراومەتەوە.

**مەگەر:** ئەگەر:تەنیائەگەر.**عەنقا:**واتە ژنی گەردەن بەرزو لە بار،بە مانای سیمورغیش هاتوە.**نەجاتمدا:**یزگارم بکات. **لە داوی:**لە تەلەی.**فیتنەدا:**ئاشوب و شەر و ناخۆشیدا.**یایەب:**ئەی خودایە.

**لەیۆژی:**لە کاتی.**مەحشەر:**قیامەت،یەستاخیز،واپەسین . **دیدەم:**چاوم . **خوناو:**نم،فرمیَسک ،شەونم . **یوو:**یوخسار.**دەپرژیَنیَ:**لیَی دیَت،دەیژیَنیَ.

**دەنوسیَ:**یاداشت دەکا،بە نوسین باسی دەکا.**شەرح:**شیَ کردنەوە.

**هیجران:**جیابوونەوە، دووری،نامۆیی،غەوارەیی. **حەبیب:** خۆشەویست ،یار. **بەروە یوو:**لەبەرچاوان،یووبەیوو. **دل:**قەلب.**یایەب:**ئەی خودایە.

**گەلیَ:**زۆر،فرە،پی.**مەسروور:**شادمان،دلخۆش.**موشتاق:**ئارەزومەند .

**بەکوشتنما:**بە لە ناو بردنما،بە مردنما.**ئیشایەتکا:**هیَمابکات.

**ئەگەربیَت:**گەروابکات،کاتیَ وابیَت.ئەگەربیَ.**بەزولفی :** بە کەزیەکانی،بە پرچی،بە بسکی. **خۆی:**هی خودی خۆی .**بدووریَ:**لیَکی بدووریَ، لیَکی بدات.**کفن:** ئەوپارچەقوماشە سپییە کە لە مردووی وەردەپیَچن وپیَ لە ناولاگۆیی دەنیَن . **یایەب:**ئەی خودایە.

**موسەلمانان:**گەلی موسەلمان .**ئەگەرمردم:**کاتیَ کە مردم .**لەسەرییَگەی:** لەسەر یێبازی،لە سەر ییَی. **پیاسەی بیَ:** لە شویَنی هات و چۆ کردنی بیَ،لە جیَی قەدەم لیَدانی بیَ، لەسەرئەوشویَنەبیَت کە لیَی دیَت و دەچیَت.

**سەرینی:**شویَنی سەری،جیَگەی سەری .**قەبرەکەم:**گۆیەکەم، مەزارکەم . **بەلکودەکا:**بەلکەم دەکات.**یەحمیَ:**مهرەبانییَ ،بەزەییَ .دلۆڤانی.**دل:** خۆشەویست،یار، دلبەر .**یایەب:**ئەی خودایە .

**لە دونیادا:**لە ژیاندا،لە جیهاندا.**کەنەینوشی:**کە نەیخوارد:کە تامی نەکرد **شەیابی:**خواردنەوەی .**مەیحەمەت:**بەزەیی ،میهرەبانی .**دەشتی:** نازناوی شاعیر.**لە یۆژی:**لە کاتی.**ئاخیرەت:**واپەسین،قیامەت، دوایۆژ.

**شادبکەی:**خۆشحالم بکەی وییَی بگەم . **سابەم یووەم:** بە یووی خۆم ،واتە بە منی شاد بکەی و بگەین بە یەک . **یایەب:** ئەی خودایە.

PDF 4 KURD



**مانابە گشتی** :

ئەی وای چ هاوارێک و چ داد و فیغانێکە وا بەم ئێوارەیە ئەم هەمووخەم و دەرد و ئازارانەی هێناوەتە ناو دل و دەروونی منەوە،ئەی خودایی من ئەمە هەمووی جوانی و لە باری و یێک و پێکی و مژۆلکەکانی ئەو شۆخ و نازدارەیە کەوا لە ناو دلم دایە و بووەتەهۆی ژان و دەردو خەم و ئازارەکانم،هەر بۆیەشە کەوا یۆژگارانی بەختی من ئاوا بەیەش دەرچووە و لەم گەردونەپی ئاشوبەدا نەماوە و لە ناو چووە بۆیەشە کەوا دلی من ئاوا تاریک داهاتووە و پی لە پەژارەم، هەروا بە یادو بیرەوەری یۆگەی گیانەکەمە کە هەمیشە مل بە زەنجیرم و وا بە ستراومەتەوەو تەژی لە ئازارانم ،ئەی خودای من ئەوەندە گێرووودەم و دل بە خەمم کەتەنیا بالابەرزەکەی جوان ولە بار و نازدار بێتن ویەحمێک بکاتن و لە داوی فیتنەوبەلای ناخۆشی و ئازاراندا یزگارم بکاتن ، خۆ لە کاتی یۆژی واپەسینیشدا چاوی من ئەسرین و خوناوەی یووی جوانی ئەو دەپیژێنێ، هەر ئەوساش باسی جیابوونەوەو دووری لە خۆشەویستەکەم بەرەو یوو شێێ دەکرێتەوە دەنوسرێتەوە، ئەی خودایە من گەلێ ئارەزوو مەندم کەوا یاری خۆشەویستی من بێت وهێمایەک بۆ کوشتنم بکاتن و شادمانم بکاتن بەوەی کە بە زولفی خۆی بێت و کفنەکەم بۆ بدورێتن و هەر ئەویش لە بەرم بکاتن ، ئەی موسەلمانان وەسیەت دەکەم کەکاتێ مردیشم با سەرینی گۆیەکەی من لەسەر رێی هات و چۆی ئەوا

بێتن بەلکو یارەکەی من بەزەییەکی بە دلا دێتەوە و یەحمێکمان پێ دەکاتن ئەی خودایە دەشتی کەلەم جیهانەدا بە ئاوات نەگەیشت و شەیابێ شادی پێ نەبەخشرا ،بەهیوام کە لە یۆژی قیامەت دا بە دیدارو گەیشتنم بەیووی یارە خۆشەویستەکەم شادو خەندانم بکەیت.

*

PDF 4 KURD



## چلەی زستان

چلەی زستانە چاوی من دەبارێنی غەمی دووری
دەڕێژی هەوری غەم ماتەم نشینم بەروە ڕێ سوری

دلم خەڕاتی دۆخی غەم ملم قەیتانە بۆ دەوری
لە دەوری وەردەسوڕانی لە نێو گێژایە دەستووری

قەدت بەیداغ و داغێکە لەداغستانی جەرگم دا
لە جەرگی بێ ڕەگم مەرگە موسافیرخانەتەندووری

لە باغی سینەدا جارێ ئەگەر سینەم خوناوی بێ
هەتا خوێنی دووچاوم دێ دەکەم تەحمیدی فەخفوری

خوداکاری بکا دلبەر بەسەر رووما پیاسەت بێ
فیداکاری هەیاسەت بێ سەرم بۆنامی مەعزوری

بە موژدەی کوشتنم میننەت لە من ناغافیلی ئەمما
بەئەفسانەی ڕەقیب باقی نەما بۆڕۆژی مەجبووری

لەهەرلا دەنگی گریان و فیغانم حیس ئەکەن عالەم
دەسا جارێ بلێ دەشتی لەبەرچی مات ومەخموری

*

---

**مانای وشەکان** :

**چلە**:چل یۆژ .**زستان**:یەکێکە لە چوارکەژی سال و وەرزی باران و بەفرو ساردو سیی سالە. **چاو**: دیدە.**دەبارێنێ**:ئاوی لێ دێ،فرمێسکی لێ دێتە خوارەوە.
**خەم**:پەژارە،یەنج،ئازار.
**دووری**:نامۆیی،غوربەت،جیابونەوە،بێگانەیی.
**دەیێژێ**:بەگۆیێ وەردەکاتن،یووی دەکاتن.**هەوری**:تەم ومژی ،.
**غەم**:خەم،پەژارە.**ماتەم**:بێ دەنگی ،پرسەداری ،تازیە. **بەرەو**:بۆلای .**یێ**:یێباز،یێگە.**سۆری**:سووری .

PDF 4 KURD



**خەیات**:بە دارتراشراو .**دۆخ**:گیایەکی وەک قامیش وایە کە لە شاخەکانی حەسیر و و پەردە دروست دەکەن ،بە مانای یاست دروستیش هاتووە. **غەم**:پەژارە **ملم**:ئەستۆم .**قەیتانە**:داویکی باریکە .**بۆ دەوری**:بۆ هەرچوارلای ،بۆ گرداوگردی.
**لەدەوری**:لەهەمبوولایەکی.وەردە **سویان**:دەسویانەوە،ئاویدانەوە . یان **وەرد**:ئەو زەویەیە کە لە دوای شۆکردن وەرد دەکرێت . **سویان**:گەیان. **گێژاو**:گەیی ئاو،گیرو گرفت .**دەستووری**: عادەتی،یاسایی .
**قەدت**:بالات ، بەژنت . **بەیداغێکە**:پەرچەمێکە.**لە داغستانی**: لە هەواری داغاندا،لە واری داخاندا.**جەرگم دا** :هەناوم دا.
**لە جەرگی**:لە هەناوی:**بێ یەگم**:مردوم ،بێ ژیانم .**مەرگ**:مردن .
**موسافیرخانە**:شوێنی موسافیران،کاروانسەرا.**تەندووری**:کورەی ، گەرم و گویی و شوێنی ئاگر کرنەوە شت تیا سوور کرنەوە.
**لەباغی**:لە گولزاری،لە باخچەی.**سینە**:سینگ .**جارێ**:یەکجار. **ئەگەرسینەم**: گەر سینگم .**خوناوی بێ**:تەی بێت،فێنک بێت .
**هەتا**:تا،تاوەکو.**خوێنی**:.خوونی .ئاوی سوور و شلی ناو یەگ و دلە کە مایەی ژیانی گیان لەبەرانە.**دووچاوم**:هەردو دیدەم. . **دێتن**:لێ یەوەدێت . **دەکەم**:ئەنجام دەدەم.**تەحمید**:ستایش کردن ، پیا هەلگوتن .**فەخفوری**: جوانی و لەباری ، زیبایی،جوانی.
**خودا**:یەزدان. **کارێ بکا**:وابکاتن .**دلبەر**:یار، دلفیێن.**بەسەر**:لە بالای **یووما**:دم و چاوما. **پیاسەی بێ**:هات و چۆی بێ،قەدەم لێدانی بێ .
**فیداکاری**:بەقوربانی.هەیاسە:خشلێکی ژنانەیە.**بۆ ناوی**:بۆ ناوبانگی.**مەعزووری** : کەسێکی کە عوزر و بە هانەی لێ وەربگیرێت، پۆزش، عوزرخاهی.،داوای لێ بوردن.
**بە موژدەی**:بەهەوالی دلخۆش گوتنی **میننەت**:چاکەلە یاد بوون ،باشی کردن .
**لە من**:لە لای من ، لە بۆمن.**ناغافلی**:بێ ئاگایی، فەرامۆشکار. **ئەمما**:بەلام.
**بەئەفسانەی**:سەربردە،داستان،سەرگوزەشتە،حکایەت. **یەقیب**: دوژمن نەیار .
**باقی** :پایەدار، نەمردوو، بەجێماو، زیندوو. **نەما**: مردووە،ناژی ،لە ناوچووە.**بۆیۆژی**:بۆکاتی . **مەجبووری**:ناچاری،پێویستی .
لە هەرلا،لە هەر چوارلا.**دەنگی**:سەدای.**گریان** :زاری ، هاوار. **فیغان**:زاری و هاوارکردن .**حیس ئەکەن**:هەست ئەکەن. **عالەم**:جیهانیان خەلکان .
**دەسا جارێ**:دەی جارێک . **بلێ دەشتی**: ناوی دەشتی بلێ،بێژە دەشتی.
**لەبەرچی**:بۆچی .**مات و مەخموری**:وا بێ سەر و سەداو کش و مات و مەستی .

**مانا بە گشتی** :

بەم چلەی زستانەوبەم سارد و سیبەوا چاوی من خەمی دووری وغەریبی دەبارینێ وتەمێ ئازارو ماتەمینی لە دل و دەروونم دا بەرەو ییی سورم هەلدەیێژم،

PDF 4 KURD



دلی من بە یاستی وا خەم دا دەتراشێ و زۆر بێ هێز و توانام لەداخی دووری وغەوارەیی وغەریبی دا، وا لە دەوری ئارەزووی خۆمابە دلی پی لە ژان و دەردم خول دەخۆمەوە،کە ئەمەش یاسای گیرو گرفت و ئازارانە،بەژن وبالای ئەویارەی من ئالایــەکی بەرز و بلندە و داخێکە لە ناو جەرگی پی لە داخ و پی لەپەژارەی من دا،من لە تاو دووری لە یارەخۆشەویستەکەی خۆمەوەیەکە هەناوی بێ یەگ و ژیانی پی لە جەفام وەک کورەیەکی ئاگر و گی وایە و هەردەم دەسوتێتن کە ئەمەش واوردە وردە بەرەو مەرگ و نەمانم دەباتن ، خۆ ئەگەر بێت و سینەی من تەنیا جارێکیش لە ناو باغی ئەو یارە خۆشەویستەم دا شاد و فێنک ببێتەوە و بە ئاوات و نیازی خۆم بگەم و سینەی پیحەسیەت و ئازارو ژانەکانی من خوناوەی شادی وخۆشی لێ بێتن ئەوا هەتا ماوم لە ژیانی خۆم دا سوپاس گوزاری یووی جوانی ئەو خۆشەویستەمەو هەمیشە شانازی پێوە دەکەم، خودا کارێکی ئاوا بکاتن کە ئەو نازدارەو دلبەرەی من بێت و پێ بنێتە بان هەردو چاوانی من و لەسەر یووی من دا بێت و بچێ و هات و چۆ بکاتن

ئەوا سەرم لە ییی هەیاسەکەی یاری ئازیزم دادەنێم، خۆ بە موژدەی کوشتنیشم گەلێک دلخۆش و شاددەبم، بەلام تەنیا ئەفسانەی دلی دوژمنانە کە وای لێ کردووم هیچ شتێکم لە ناو دلدا بۆ یۆژی مەحبووری نەمینێتن، وا لە هەموو لایەکەوە گشت کەسێک ئاوازی گریەو فیغانم دەبیستێتن و گوێیان لێیە،دەسا وەرە تەنیائەگەر بۆ یەکجاریش بێتن ئەوا پێم بلێ و بفەرموو ئەی دەشتی لەبەرچی تۆ ئاوا کش و مات و بێ دەنگ و هەمیشەخەمبارو پی لە حەییەت و مەلولی.

*

PDF 4 KURD



## حوزنم لەسەر

حوزنم لە سەرئەم سییەتە ڕووی داوە بەدوو بـارە
بـاران لە چاوو غە م لە هە ناو ڕووح لە فـــیرارە

چەنـد وەقتە دەنـــالم وەکـو بولبول لە فیراقـت
سەد حەیفە دەکەی مەنعی ویسالی دلە خـارە

پـەروانەمـــە ئەمـمـا نـــیە بـــەرگـی تەیـەرانم
تا بێمـــەوە ڕێم و بســـوتێـم من لە کــەنــارە

ئەم خەسـلەتـــە هی خۆتە وەیا وەعزی یەقیبە
ئەنـگوشـتی بەخوێنت کەبەدائیم لە قـــەتارە

دوو قەوسی فەڕەنـگت بەمیسلی شیری بوڕەندە
تەئسـیریێ دەکاتـن لەدلی مــن کە هـــــەژارە

دەرمـانی برینـم لـە چ ئەقلـــــــیم نیە دلبـەر
غـەیرەز قەدە مــت بــۆ دلی میسکین نیە چـارە

دەشـــــتی کە بریندارى دوو چاوی تــووە جـانـا
نیشــانەی شـــەهیدیمە لــە مەحشـەر بەعیزارە

**مانای وشەکان** :

**حوزنم**: خەمم، پەژارەم **.لە سەر**: بە هۆی .ئەم سییەتە:ئەم ڕێگەیە،یەوش،ئاین. **یووی داوە**:هاتۆتە کایەوە،وەدی هاتووە.**بە دوو بارە**:دووبەرابەر،چەندجار.**باران** : مەبەست فرمێسکە کە بە باران تەشبیە کراوە.**لەچاو**:لەدیدە. **غەم**:خەم پەژارە.**لە هەناو**: لە دەروون،لە جەرگ .**یووح**: گیان.**لەفیرارە**:لە هەلاتنە، لە دەرچوونە.

**چەند وەقتە**:لەمێژە .**دەنالم**:هاواردەکەم بە هۆی یەنج و ئازاران. **وەکوبولبول**:وەک بالندەی ئەشقی گول،وەک هەزارە .**لە فییاقت**: لە دووریت،لە جیابونەوەت .

PDF 4 KURD



**سەدحەیفە**:سەدمخابنە.**دەکەی**:ئەنجام دەدەی.**مەنعی**:قەدەغە کردنی.**ویسالت**: گەیشتن بەتۆ.**دل**:قەلب.**خارە**: جۆرە بەردێکە، دیک.

**پەروانەمە**:ئاشقی شەمم.**ئەمما**:بەلام .نیەبەرگی **تەیەرانم**:بالم نیە،بێ بالم وناتوانم بفیم .**تابێمەوەیێم** :تا بچمە سەر پێگەی خۆم. **بسوتێم**:گی بگرم و بسوتێم .: **تا بێم و بیۆم** : واتە بێم و بچم . **لەکەنارە**:لەلای تۆ،لە پێی تۆ.

**ئەم خەسلەتە**:ئەم عادەتە،ئەم یەوشە .**هی خۆتە**:هی خودی خۆتە، هی تۆیە، خۆت فێری بووی . **یان وەعزی یەقیبە**:یان دوژمن فێری کردووی .

**ئەنگوشتی**:ئەنگوستی،پەنجەی . **بە خوێنت**: خویناویت.**کە بە دائیم**: کە هەمیشە.**لە قەتارە**:لە کار دایە، لە پیزە.

**دووقەوسی فەیەنگیت**:مەبەست هەردوئەبرۆکانــی یارە.**میسلی**: وەکو.**شیری بویەندە**:شیری زۆر تیژ.**تەئسیرێ دەکاتن**:کاریگەرە . **لەدلیمن**: لە قەلبی من. **کە هەژارە**: کە نەدارە،کە فەقیرە.

**دەرمانی برینم**: هەتوانی برینم،چارەسەری برینم.**لە چ ئەقلیم نیە**: لە چ وەلاتێک نیە لە چە شوێنێ نیە.**دلبەر**:مەبەست یاری نازدارو جوانی خۆیەتی کە دلی بردووە.

**غەیرەز**: بێجگەلە،جگە لە.**قەدەمت**:هاتنت،هەنگاوت .**بۆ دلی مسکین**: بۆ دلی هەژار.**نیە چارە**:هیچ چارەیەکی تر نیە.

**دەشتی**:نازناوی شاعیرە. **کە بریندای** :کە زامداری .**دوچاوی تووە**:هەردو دیدەکانی تۆیە.**جانا**:ئەی گیانە .**نیشانە شەهیدیمە**: بەلگەی شەهید بونمە.**لەمەحشەر**:لە ڕۆژی واپەسین ،لە ئاخرەت. **عیزارە**:گۆنا،ڕوخسار.

**مانا بە گشتی** :

من بە هۆی ئەم جۆرە یەوش و شێوەو یەفتارانەی تۆیە کەوا خەم و ئازار و یەنجەکانم دوو بەرابەرە، هەر بۆیەشە کەوا ئەسرین لە چاوانم هەلدەیێژنم و هەناوم پیاو پیی پەژارەیەو گیان لە جەستە دا وا بەرەو دەرچوونە،زۆر لە مێژە کەوا من هاوارمە و وەکو بولبول لە تاو ئەشق و ئەوین و دووری گول دەنالێنم و پی لەحەسیەت و جەفاو میحنەت،سەد حەیف و مخابنم دەمینێ کەوا تۆ ئـاوا بە یەک گەیشتن قەدەغە دەکەیت و لێم دەبی بە دیک و ئازاری دووویی و لە یەک جیابوونەوە، وامن وەک پەروانە وامەو،بەلام داخەکەم کە ناتوانم بال بگرم و ئەوساکەبێم و بیۆم و لە کەناری تۆدابسوییێمەوەو بە ئاوری ئەوینی تۆیاگی بگرمو بسوتیم، نازانم ئەم عادەت و خەسلەتەی کە تۆ هەتە هی خۆتە وەیان نەیار فێری کردویت کەوا هەمیشە پەنجەکانت لە کار دایەو بە خوێن سوور بووینە، هەردوو ئەبرۆکانیشت وەکو شیری تیژ کار لە دلی منی هەژار و بێکەس دەکاتن و هەمیشە زامدارم دەکاتن، خۆ منیش لە هیچ شوێنێک دا هەتوانی برینانی خۆم وەدی ناکەم جگە لە هەنگاو و دلۆڤانی تۆ بەولاوە کە هیچ چارەیەکی تر بۆ من نیە،ئەی گیان

PDF 4 KURD



شیرینی من دەشتی کەوا پەرێشان وبرینداری چاوەکانی تۆیە ئەمە بۆمن دەبێتە بەلگەی ئەوەی کەوا لە یۆژی واپەسین و لێ پرسینەوە دابە یەکێ لە شەهیدانی یوخساری تۆحسابم لەگەل دا بکرێت و لێم بپێچرێتەوە .

*

PDF 4 KURD



## حەبیبی دلی من

حەبیبی دلێ مــن بەها رێکــی بـــوو
کــە کۆچی دلێ مــن هەواریکی بوو

لە بـاغـی ئیـرەمـدا ســەدا هاتە دە ر
کە نـەرگـس ژیاوە خـونــاوێکی بـوو

لە ڕە نـگـی کلــوک و گـیــایــی سەوز
گـیــابەنــد و بێنی گـولاوێکــی بوو

لە ڕەنـگــی چـریکــە و هـەراو و بــەزم
لە بەیــنی من و ئـەم چ دا وێکــی بوو

لە ڕوو بـەندی زولفــی حـەیاتــی دلـم
دل خەسـتە حــالم چ هەوارێکــی بوو

لە ڕێگـەی ســەراوێ گولی شـەنگەبی
هەناسـەی شــەمــال و هەتـاوێکی بوو

دلا هەســـــــتە ئیمڕۆ بە یـادی گـولت
بلێ جەننـەتی مــن چ خــاوێکی بـــوو

کە بولبول دەخوێـــنێ دەلــێ دەشــتیا
دوو چـاوی بە گریــان قــویاوێکــی بوو

---

**مانای وشەکان** :

**حەبیبی دلێمن**: خۆشەویستی دلی من ، یاری من .**بەهارێکی بوو**: بەهاریکی هاتە کایەوە،بوو بەخاوەنی بەهارێک .

**کە کۆچی دلێمن**:کەدلیمن دوور کە وتەوە، کەدلیمن باری کرد. **هە وارێکی بوو**:شوێنێکی تازەی بوو،هەوارێکی نوێی بوو.

**لە باغی ئیرەمدا**: لە ناو باغی ئیرەم دا کە باغێکە لە بە هەشت. **سەدا هاتەدەر**: دەنگ هاتە دەرەوە.**کەنەرگس ژیاوە**: کاتی کە گولی نەرگس زیندو بۆوە، واتە بە هار ها ت .**خوناوێکی بوو**: شەونمێکی بوو.

PDF 4 KURD



**گیابەندوبێن**:ناوی گیایەکی بۆن خۆشی کوێستانانە.**گولاوێکی بوو**: بۆنیان ها ت و دەرکەوتن، گولاوی بوون ،بۆنداربوون.
**لە یەنگی**: لە شێوەی. **چریکە وهەراوو بەزم**:هاوارو بەزم و شایی و هەراو هۆریاو شادی و خۆشی .
لە بەینی من و ئەم: لە نێوان من و ئەم دا. **چ داوێکی بوو**:داوێکی چۆنی بوو. **لە یوو**: لە یوخساری .**بەندی زولفی**:زولفی پێچراوی، زولفی چین چینی.**حەیاتی دلم**: ژیانی دلم .خۆشوویستی دلم .
**دل خەستەحالم**:دل نەخۆشم ، پەرێشانم .**چ هەوارێکی بوو**:چ وارێکی بوو،چ نیشتمانێکی بوو،چ شوێنێکی بوو.
**لە یێگەی**: لە رێبازی. سەراوێ: سەر ئاوێ .**گولی شەنگەبی**: گولی وەک داری شەنگە بی بالا بەرز .
**هەناسەی شەمال**:بای شەمال،سروە،شنەی شەمال.**هەتاووێکی بوو**:رۆژێکی خۆشی بوو. خۆرەتاوێکی بوو.چ جۆشێکێ بوو، چ تاو و تینێکی بوو.
**دلا**:ئەی دل .**هەستە**:بیۆ،هەستەوە.**ئیمیۆ**:ئەمیۆکە،ئیرۆ . **بەیادی گولت**:بە بیرەوەری حۆشەویستی وەک گولت.
**بلێ**:بێژە .**جەننەتی من**: بەهەشتی من .**چ خاوێکی بوو**: چ گولێکی خاوخاوی بوو.**کەبولبول**:کە هەزارە،کە بالندەی ئاشقی گول. **دەخوێنێ**:دەچریکێنێ،بەئاوازی خۆشی خۆی.دەخوێنێ. **دەلێ**: دەبێژێ. **دەشتیا**:ئەی دەشتی.
**دوچاوی**:هەردو دیدەی . **بە گریان**:پی لە گریان،بەزاری.**قیاوێکی بوو**: واتە ئەسـرین و فرمێسک نەماو بینای چاون بۆوە.یان قویاوێکی بوو:فرمێسکی زۆر لێ هاتە خوارەوە و شێلو.

---

**مانا بە گشتی**

وا خوشەویستەکەی دلی من تەنیا بە هارێکی بۆ وەدی هات لەو کاتەوە کەوا دلی من کۆچی کردو چوو بۆ هەوارێکی تازەو نوێێ،وا لە ناو باغی بەهەشتی بەهاردا دەنگ و ئاوازی شادی هاتەدەر، لەو دەمەی کەوا بەهاری پی لە خۆشی و ئاوازی شادی هات و گولی نەرگس ژیاوە و گەشاویەوەو خوناوەی کردو لە گەل خوی دا بەزم و سەیران و شادی وەدی هێناو وەدەرکەوت ، بەهاتنی گول و کلوک و گیای سەوزی بەهاران و گیا بەندو بێن وا ئەم ناوە یەنگین و پی لە سەیران و بەزمی بەهاران بۆوەو تا بلێی ئەم ناوە هەمووی جوان و یەنگین و دلگیرە، لە گەل ئەو هەموو بەزم و هەراو هۆریایەی بەهاری نەخشین و دلگیردا لە نێوان من و ئەودا ژوان و هاوکاریەکی سەرشارلە شادی وخۆشی و بەزم وەدیهات، من لە بۆ بەندی چین چینی ئەو دلە خۆشەویستەی خۆم وا بیمارم و دل پی لە ئازارم کەوا ئەو هاتـەهەوارێکی تازەو نوێ وە ،بیوانن وا لە یێبازی سەراوێ گولی جوانی بالابەرزو شەنگەبی وەک بای شەمال هات ودەرکەوت ، دەسا ئەی دل هەستەوە بە

PDF 4 KURD

یادی خۆشـــەویستـەکەی وەک گوڵ جوان و نـازدارت بفەرموو بڵێ کە هەواری بەهەشتی من واتە نیشتمانی خۆشـەویستی من پی بوو لە گوڵی خاوخاو و وا وەرزی بەهاری شادو یەنگینی هێناو لە هەموو لایەکـــەوە دەنگ و ئـــاوازی بولبولان دێتن و لە ناو باغ و گولزاراندا دەخوێنن و هاوار دەکەن و دەڵێن ئەی دەشـــتی بەسـیەتی ئەم هەموو ئازار وشین و زاریە چونکە وا هەردوو چاوانی پی لە گریان لێل بوون،وابەهاتنی بەهاری پی لە شادی و خۆشی و بەزم و سەیران بیناییان بوونەوەو ناخۆشی و ئازارەکان بیانەوە.

*

PDF 4 KURD



## خۆم کوردم

خۆم کوردم وساقیم کورد مەستی مەیی کوردانم
بۆ مەجلسی یەک ڕەنگی گۆیەندەیی کوردانم

زووهەستن و هەولێدەن ڕۆژکۆشش وشەولێدەن
مۆسیقەیی کوردستان بۆ گەورەیی کوردانم

ڕەشمالی یەشی کوردان شیرو چەکی تێ دایە
بۆ بەستنی شیر و چک نەورەستەیی کوردانم

ئەی ئەهلی جەفا کارم مەڕژێنن بە نائومیدی
خوێناوی ستەم دیدی شەرمەندەیی کوردانم

ئەی قەومی پڕ ئازارم ئەی میللەتی بێزارم
تاکەی لە سەفا دابێ دوژمن پەیی کوردانم

.......... ...............
.........................

............ ... ... ... ...
...............................

ئەم شیعرەی سەرەوە داخەکەم چەند دێری لێ دەست نەکەوتەوە و وەک گەلێ لە شیعرەکانی تری نیشتمانی کە ئەمە یەکێکە لەو شیعرانەی کاتی خۆی لە دیوانەکە دەر هێندراوە وەک باسم کردووە ،ئەوەندەشمان لای مامۆستا مەلاعوسمان گەزنەیی کە یەکێکە لە فەقێیەکانی دەشتی وەدەست کەوتەوە و سوپاسی دەکەین.

---

**مانای وشەکان** :

**خۆم**: ئەز ،من . **کوردم** : کرمانجم . **ساقیم**: مەی گێیم. **کورد**: کرمانج . **مەستی**:سەرخۆشی . **مەی شەیاب**.**کوردانم** :هی کوردان.
**بۆ مەجلسی**: بۆ کۆیی ،بۆ کۆبونەوەی. **یەک یەنگی**: یەک بوون،یەکگرتن یەکێتی نێوان کوردان.**گۆیەندە**:کەسێ کەبە ناوی یەکێکەوە قسە بکات،ئەو کەسەی کە

PDF 4 KURD



شتێک بە خەلک یا بگەیەنێ و بلاوی بکاتەوە ، وتە بێژ. **کوردانم**:هی گەلی کوردانم **زوو هەستن**: هەستن بە زوویی ،دوا مەکەون و پەلە بکەن .**هەولێدەن**: کۆشش بکەن خەبات بکەن . **یۆژکۆشش**: بە یۆژ خەبات و تێکۆشان بکەن. **شەولێدەن**:بەشەوانەش ئاوازی کوردستان بلاو بکەنەوە و دەری ببین .

**موسیقەیی کوردستان**:ئاوازی وەلاتی کورد کە کوردستانە ،ئاوازی سەربەخۆیی کورد.**بۆ گەورەیی کوردانم** : ئاوازی موزیک بۆ سەروەریەتی گەلی کورد لێ بدەن دەنگتان هەلبین و باسی هێژایەتی و مەزنایەتی گەلی کوردبکەن.

**یەشمال** : چادر .**یەش**: سیا .**کوردان**: گەلی کورد. **شیر**:ئەو ئامرازەیە کە بۆ شەی بەکاردێت. **چەک**:ئەسلەحە ئامرازی جۆراو جۆری شەیکردن .**تێدایە**:لە ناویەتی ، هەیەتی .

**بۆبەستنی**:بۆ پێکە وە نانی ،بۆ ئامادەکردنی ،بۆ هەلگیرسانی شۆیش. **نەویەستەیی کوردانم**:نەویەستە وابزانم مەبەستی نەویەستەی خەباتگێیی مەزنی کوردە .(یان ناویاستەیی کوردانم ) واتە لە چەقی مەیدانی پێک هێنانی شۆیش و یاپەیین و کوردایەتیم بۆ گەلی کورد.

**ئەی ئەهلی**:ئەی خەلکی . **جەفاکارم**:رەنجدەرم،پی ئازارم . **مەیژێنن**: مەیێژن .بە **نائومێدی**:بەبێ هیوایی ،ورەتان بەرز بێت و بێ هیوا مەبن.

**خویناوی**: خوێنی سووری . **ستەمدیدی**:چەوساوەیی و زۆر لێکراوی .**شەرمەندەیی کوردانم**:خەجالەتی گەلی کوردم ،گەلی کورد کە ئاوا ژێردەستەیە من شەرم لەخۆم دەکەمەوە .**ئەی قەومی**:ئەی میللەتی پی لە ئازارو یەنجم .**ئەی میللەتی بێزارم**:ئەی گەلی چەوساوە و ژێر دەستە و بێزارم لە ژیان دا.

**تاکەی**:هەتا کەنگی . **لە سەفادابێت**:لە خۆشی و سەیران دابێ . **دوژمن پەیی کوردانم**:نەیارانی گەلی کوردوداگیرکەرانی کوردستان .

---

**مانا بە گشتی** :

من بۆ خۆم کوردمو هەمو هەست و بیرو باوەیو بۆچونێکیشم هەمووی تەنیا کوردیەو ساقی مەیگێییشم هەر کوردە و من سەرخۆشی شەیاب و بادەی گەلی کوردانیشم و بۆ کوردایەتی کردن و یەک بوون و گیانی پاکی یەکێتی نێوان یۆلەکانی گەلی کورد دا وا من هەمیشە گۆیەندەو یاگەیێنەری گیانی پاکی یەکگرتــن و یەکبوونی گەلی کوردم،دەسا ئەی یۆلەکانی گەلی کورد پەلە بکەن و بەزوویی هەســتن و یاپەین و یۆژانە لە خەبات و تێکۆشانی یزگاری و سەربەخۆیی دابن و شەوانەش ئاوازی موزیکی سەروەری یەتی و هێژایی و مەزنایەتی بۆ گەلی کورد لە پێناوی یزگاری و ئازادی دا لێ بدەن و سەربەرزانە بلاوی بکەنەوە و دەری ببین و یای بگەیەنن، چادرو یەشمالی یەشی گەلی کورد وا پییەتی لە شیر و چەکی تێکۆشان و بەرگری لە خۆ کردن و بەرخودان و یاپەیین لە پێناوی ئازادی و یزگاری و سەربەخۆیی دا،منیش وەکو کوردێکی دلسۆز بۆ

PDF 4 KURD



بەستنی شـیرو چەک و خەبات کردن و شۆڕش وەدیهان هەر وەک نەویەستەی گەلی کوردم،دەسا فەرموون با لە هەول وخەبات و تێکۆشان نەوەستین و ڕاپەڕین و خۆمان ڕزگارو سەربەخۆ بکەین، ئەمڕۆ ڕۆژی ڕاپەڕین وخەبات و تێکۆشانە،ڕۆژی هە ول و بزافە، ئەی میللەتی کوردی پی لە یەنج و ئازار و نەهامەتی ، وەرن چیتر بێ هیواو ئارەزوو مەبن و هەرگیز ئاوا دامەمینێن و ورەتان هەر بەرز بە تین بێتن و هەمیشە هیواداربن و خاوەن بیوا بن،کە دوا ڕۆژێکی کامەران و شادیتان لە پێشە بەسیەتی چیتر خوێنی سووری چەوسـاوەیی و ژێر دەستایەتی داگیرکەران لە چاوانی خۆتان هەلمەیێژن و ، من خەجالەتی ئەم هەموو کوێرەوەریە و بەدبەختیەی میللەتی کوردم کە ئاوا چەوساوەی ژێر دەستانن، ئەی گەلی کوردی پی لەژیانی چەرمەسەری و ژان و ئازاری برینان ،ئەی میللەتی کوردی لە ژیان بێزار و خەمگین ، بەسیەتی هەتا کەینێ داگیرکەران و نەیارانمان ئاوا لە خۆشی و سەیران دابژین ونیشتمانمان داگیر بکەن و گەلی کوردیش ئاوا چەوساوە و ژێر دەستەی دوژمنانی بێتن، وەرن ڕاپەڕین و شۆڕش بکەن وخەبات بکەن بۆ ژیانی ڕزگاری و سەر بەخۆیی گەلی کورد تا ڕۆژانی شادی و بەختەوەری گەلی کوردیش وەدی بێت و کوردیش شاد و خەندان بێتن.

*

داخەکەم کە ئەم شیعرەمان بە تەواوی دەست نەکەوتەوەو چەند دێرێکی لێ پەیێوەو دەستمان نەکەوتەوە داوا لە هەموو خوێنەرێک دەکەم ئەگەر ئەم شیعرەیان بە تەواوی لا دەست بکەوێت بۆمان تەواو بکەن و ئاگادارمان بکەنەوە جێی ڕێز و خۆشەویستیمانە.

من دێتەوە یادم کە ئەم شیعرە بە ئاوازێکی تایبەتی خۆی لە حوجرەی فەقێیان دەخوێندرایەوە کە ئەمە بۆ خۆی ڕاگەیاندنێکی گیانی بەرزی کوردایەتی کردن بووە،لەو ڕۆژگارانەدا گەلی کورد کە لە هەموو مافێکی ژیان دا بێ بەش بووە، دەشتی هێژاش وەک هەمو شاعیران و نوسەرانی نیشتمان پەروەری کورد بەو جۆرەبە گیانی پاکی و دلسۆزی و نیشتمانپەروەرییە شیعرو نوسینیان بۆ میللەتە ستەم دیدەکەی خۆیان نوسیوە و بلاویان کردۆتەوەو داوای خەبات و تێکۆشانییان لە پێناوی ئازادی و ڕزگاری کورد وکوردستان لە ژێر چنگی داگیرکەران دا کردووە،هەر بۆیەشە دەتوانین بلێن کە شاعیران و هونەرمەندان و دلسۆزانی کوردو کوردستان لە گەل ئەو هەموو زەبر و زەنگ وهەولی تواندنەوەی گەلی کورد هۆیەکی هەرە مەزنن بوینە بۆ پاراستنی فەرهەنگ و زمان و گیانی پاکی کوردایەتی و پتەو بوونی ورەی بەرزی خەبات و تێکۆشان لە پێناوی ئازادی و ڕزگاری کورد و کوردستان داو ئەو مرۆڤە مەزن و خەباتگێڕانە هەرگیز میللەتی خۆیان لە یاد نەچووە و هەستیان بە نەبوونی مافی ئازادی و چەوساوەیی میللەتەکەی خۆیان کردوە و دژی داگیرکەران بە شیعرو نوسین هەولی ڕزگار

بونیان لەو هەموو ئازار و میحنەت و کوێرەوەریەی کە بە سەر میللەتی کورد دا سەپاوە داوەو لە هیچ کاتێک دا بە نوسین و شیعرە بەرزەکانیان درێغیان نەکردووە.
هەزاران سلاو لە گیانی پاکی دەشتی و هەموو دلسۆزان و سەروەران و هێژیان و هونەرمەندانی نەمرانی گەلی کورد،ئەوانەی کە تا دوا هەناسەی ژیانیان گەل و وەلاتی شیرینی خۆیان لە یاد نەچویتەوەە و بۆ کورد کوردستانی خۆیان سوتاون.

*

PDF 4 KURD



**دل هانە هانە**

دل هانەهانە وەی تـۆ ئـەی پـادشـــــــاهی دارا
بـۆ دەفــعی زولــمی زولفت ئەمـڕۆ لە سەرچنارا

بێ مەیلــەمـاهی وەسلت گــیراوە بەم فنــونەت
حەیلــولـەتـی فیراقت بەو هــالە بینـــــــەکـارا

ئەلبەتە بەهـارە ئەمڕۆ بۆیی موخـــــالیفی بـــوو
فەرمودەیی ویســــالت نیسـانە عــادەت ئــارا

ڕێبازی بـازی چاوت بـەم داوی حــەلقــە داوت
ڕاوی لە دەستی من دا زەنجــیری بەیـــنی شارا

موشـــکل لەمن مەنینن عەرعەر قەدانی نــازک
هەردەم کەدوڕ ئەبارێ لـەم چاوی پـڕ غـوبارا

گولناری ڕوو کەپشکووت ڕەواجی داوەبەڕووت
بیـنە کەبابە بولبــول بوییکە لــەم هـــــەزارا

مەعلومە بـۆدوعـابوودەست وەسـەمــایی ئامین
یـاڕەب بە داوی زولفــی دەشــتی بخـا وە دارا
*

---

**مانای وشەکان** :

**دل هانەهانە** :دل سوارە،دل تەنگە . **وەی تۆ**:ئەی تۆ ، **ئەی پادشاهی**: ئەی مەلیکی، ئەی فەرمانڕەوایی .**دارا**: بە توانا ، هەبوو، پڕ لەهەبونی و خاوەنی تواناو دارایی .**بۆدەفعی**:بۆ نەمانی ، بۆ دوورخستنەوە
**زولم**:زۆرداری. **ئیمرۆ**:ئیرۆ.ئەمیۆکە **زولفت**: پەرچەمت کەزیت . پرچت **لەسەرچنارا**:لە بالای چنارایە،وەک چنار درێژ و بەرزو جوانە.

**بێ مەیلە**:کەم لوتفە،بێ زەوقە. **ماهی**:مانگی. **وەسلت**:پێ گەیشتنت **گیراوە**:بەستراوە.**بەم فنونەت**: بەم هونەروەریەت .

**حەیلولەتی**:هۆکاری،بەربەست.**فیاقت**:دور بوونەوەت، جیابوونەوەت

**بۆهالە**:بۆتریفەیە (یان بەو هالە بەو تریفەیە) بەونیشانەیە،بەو یۆناکیە .**بێنە** : بهێنەدی.**کارا**:هەول خەبات، شۆل .

**ئەلبەتە**:وشەی تەئکیدە،بەیاستی.وایە.**بەهارە**:وەرزێکی شادی و خۆشی سالە.

**ئەمیۆ**:ئیرۆ.**بۆیێ**: لەبەرهەندێ. **موخالیفی بوو**: بە پێچەوانەبوو.

**فەرمودەیی**:گۆتنی ،وادەی .**ویسالت** گەیشتن بە تۆ. **نیسانە**: مانگێکی وەرزی بەهارە کە تیادا شتی ناراست دەگوترێ.واتە بە درۆ زۆر شت دەگوترێ.**عادەت ئارا**:یەوشت وایە ،ئەمە بووە بە بە مانای دۆستایەتی و نێوان خۆشی ، هەوار،جوانی و یێک و پێکی .شوێنی هەمیشەیش هاتووە.

**یێباز**:یێیەو .**بازی چاوت**: چاوی وەک چاوی باز جوانت ،باز بالندەیەکی چاو جوانە. **بەم داوی**:بەم داوی،کە پرچ بە داو تەشبیە کراوە واتە بەم پرچی .**حەلقە**:چین چین بازنە،بە گروازە. **داوت**: تەلەت داو ئامرازێکە بۆ یاوکردن دادەندرێتەوە .

**یاو**:سەید،شکار .**لە دەستی من دا**:لە چنگی.منی دا،لە قیسی دام. **زەنجیری بەینی شارا**:ئەمەش هەر تەشبیهە،مەبەست بەربەستە، **شارا**:بەوچارۆگەیە دەلێن کە ژنان بەسەری خۆیان دا دەدەن .

**موشکل**: گیروگرفت.**مەنین**:گومان.**عەرعەر**:دارێکی بالابەرزە. **قەدان**:کۆی قەدە واتـە بەژن و بالا.**نازک**:ناسک .

**هەردەم**:هەمیشە **دوی**:لێرە بە مانای فرمێسک دێتن کە ئەسرین بە دوی تەشبیە کراوە، یان دەبێت کە کەدەر بێت واتە ناخۆشی و دەردوئازار.**لەچاوی**:لەدیدەی. **پی**:تەژی.**غوبـار**:تۆز،گەرد.لێرە دەتوانین بە هەردو ماناکە شێی بکەینەوە.

**گولنار**:ناوی گولە.**یوو**:یوخسار.**پشکوت**:کراوە.**پشکۆ**:یۆناکی، گەشاوە،پەنگر،بەو ئاگرەدەلێن کەهەمیشە گەشاوەیە.**یەواج**:نرخ ، بەهەیمێن . **یووت**:یوخسارت .

**بـێنی** : بۆنی هەناسە.(یان بەین واتە یوون ،ئاشکرا، دیار.) **کەباب**:گۆشتی لە شیشدراو و برژاو بەئاگر .**بولبول** :بالندەی ئاشقی گول .**بۆیێکە**:لەبەر هەندێ **لەم هەزارا**: باغی گولان. (یان خەو زیان.هات و چۆکردن )واتە خەو لە چاوی ناکەوێت.

**مەعلومە**:ئاشـکرایە،دیارە،یوونە.**بۆدوعابوو**:بۆپـایانەوە بو. **دەست وەسەما**:دەست بەرەو ئاسمان بەرزکردنەوە. **ئامین**:وشەی دوای دوعا خوێندنە،واتە خوایە دوعاکەم قەبوول بکەیت .

PDF 4 KURD



**یایەب**:ئەی خودایە. **بەداوی زولفی**:بە مووی زولفی بە تاری زولفی.**دەشتی** : نازناوی شاعیرە.**بخاوەدارا**:بەداری هەلواسێ، لەداری بدات.

**مانا بەگشتی** :

ئەی پادشاهی خاوەن تواناو دارا وا دلی سوارم زۆر بەتوندی لێ دەداتن و هانە هانیەتی،ئەمەش بەهۆی ئەوەیە چونکە زولفی جوان و درێژی تۆ ئیمیۆکە بۆ نەهێشتنی زولم و زۆرداری وا لەسەر چناردایەو بۆیەشە کە ناتەوێت ئەمن ئاسودەو ئارام ببم،چونکە یووی وەک مانگی تۆ هەربێ مەیلەو ییگەی گەیشتن و شاد بوونم بە تۆی بەم هەموو هونەری جوانی و لە باریتەوە لێ گیراوە،وا شۆخ و شەنگی و جوانی تۆ بۆ من بووەتە یۆناکی دوور نەکەوتنەوە و جیانەبوونەوەم لە تۆوە،خۆ ئیمیۆکە وا بەیاستی وەرزی بەهارەو جیهان یازاوەتەوە،ئەی بۆ هەر نەهاتیەوە و وادەی گەیشتن و شاد بوون بەتۆهەر یاست دەرنەچوو؟ دیارە کە لە مانگی نیسان دا نایاستی زۆر دەگوترێت و ئەمەش بوویتە شتێکی ئاسایی و عادەت ، خۆ یێبازی چاوی جوانی وەک بازی تۆ و پرچی داوداو و بە گروازەت و ئەو زەنجیرەی کە لە دەوری چارۆگەی تۆیە بە تێکیایی بوونەتە هۆی لە دەست دانی یاو و ژوانی من ، گیرو گرفتەکانی من هەمووی ئەوەن کە بالابــەرزانی وەک داری عەرعەر گومانیان لە من هەیە، بۆیەشە کە هەمیشەچاوم تەژی تۆزوگەردی خەم و فرمێسکم و لە تاوانت پی لە یەنج و ئازارو نەهامەتیم ، یووی وەک گولناری تۆ کە دەکرێتەوە، ئەو هەموو شەوق وگەشاوەیی وەک پشکۆت زێتر و بە نرخ تر دەکاتن و هەر بۆیەشە کە بولبول هەمیشە هەناسەی وەک کەباب وایەو جەرگی لە تاو ئاشقی گولی خۆی سوتاوەو لەناو زەنوێروئەم باغ و گولزارانەدا هەمیشە دەخوێنی و نالەنال و هاواریەتی، خۆ شتێکی دیارو یوونە کەوا دەســت بلند کردن بۆ ئاسمان و پایانەوەش تەنیا بۆ دوعا قەبوول بوونە کەوا دوعاکە بە ئاوات بگاتــن و جێ بەجێی بیێتن ، دوعاو پایانەوەی منیش هەرئەوەیە کەوا یاری نازدارو جوانی من بێت و بە داوی زولفی خۆی لە دارمان بداتن و هەلمان بواسێت و بە ئارەزوو بگەم.

*

PDF 4 KURD



## دیسان فیکرو خەیالی یار

دیسان فیکـر و خەیالی یاری بێ مەیلم بەســەرداهات
هەموو کارم پـەربشـان بــاری کێوانم بەسەرداهـات

لە نازو نیعمەتی وەسلی قەدت مەحجووبە دوو چــاوم
لە نارو زەحمەتی فیـRقەت چـلۆن ئاهم بەسەرداهـات

گـەلێ داخم بەسەرلەوحـی جـگـەرداچوولە هیجـری تــۆ
لەتاوی جۆشی گریان بەحــری عـومــانم بەسەر داهـات

خەزانەی ڕەحمەتت تــاکەی دەوامی بێ لە مەمـنووعــی
لە ئیشغالی ســــەدەفخانەت چ حوزنێکم بەسـەرداهات

بەهـــــــاری بـۆستانی دڵ تۆنەهــاتی بۆ نــەهاتی بۆ؟
بە ئومیدی گولسـتانت زمستـــــانم بە ســەرداهات

نەتیجـەی شیکلی ئەووەل لەم هەمووئەشکـالی توهەیتت
کە ڕوحم فیدیەی قەدە جــەژنی قوربانم بەســــەرداهات

لە ڕۆژی کوشــــــــتنم دلبەر بەحەققــی چاوەکەی کالت
ئەگـەرجارێ نەلێی دەشــتی خەتی عەفوی بەسەرداهات

*

---

**مانای وشەکان**:

**دیسان**: جارێکی تر ،ئەمجارەش. **فیکر**:،بیر.خەیال:وەهەم ، پندار،گومان.یار: خۆشەویست ، هەڤال ، دۆست.**بێ مەیل**: بێ یەغبەت.**بە سەرداهات**:هاتە ناو خانەی خەیال،هاتەناوسەر .

**لە نازو**:لەلوتف،لە عیشوە.**نیعمەت**:چاکە،بەرەی شادی.ل **وەسلی**: بەیەک گەیشتن پێک شادبوونی .**قەدت**: بەژن و بالات **مەحجوب**:شەرمەزار.**دووچاوم**:هەردوو دیدەم .

**لەنار**:لە ئاگر،لە ئاتەش. **زەحمەت**:یەنج،ناخۆش.ئاستەنگ . **چلۆن**: کوو،بەچ شێوەیەک. **ئاهم**:حەسیەتم ،خەمم،هاوارم ڕەنجم. ئاخم،ئەفسووسم،پشووی درێژ

PDF 4 KURD



کە لەتاو ئازاران یان لە خۆشیان دا هەلدەکێشرێ.لێرە بە مانای ئاهی یەنج و ئازارە .

**گەلیَ:** زۆر،پی،فرە،**داخم:**حەسیەتم. **بەسەرلەوحی :** بە سەرتەختی،بە سەر پانایی. **جگەرداچوو :**.بەناوجەرگدارۆیی ، چووە ناو جەرگ. لە هیجری تۆ:لە دووری تۆ،لە فیرقەتی تۆ.

**لەتاوی:**لە هەژمەتی ،لە سووی .**جۆشی گریان:**گریانی گەرم وگوی، زۆرگریان **بەحر:**دەریا.**عومان:**ناوی دەریای عوممان کە.

**خەزانەی :** گەنجینەی.ی**ان خەزانی:**پایزی گەلاییزانی . دووهەمیش ماناکەی لە بارە. **رەحمەتت:**خێرو خۆشیت .تاکەی : هەتا کەینیَ.دەوامی بیَ کەدرێژەی هەبێت لە مەمنوعی:لە قەدەغەکراوی.

**لە ئیشغالی:**لە مەشغول بوونی ، لەفیکرو خەیالی، لە پی کاری. **سەدەفخانەت:** لێرە تەشبیهە بە سینەی یار. **چ حوزنێکم:**چ خەم و پەژارەیەکم.**وەسەر داهات:** هاتەدی.هاتە سەرم **بەهاری:**وەرزی سـەوز و شادی سال کە لە دوای زستان دیَت.**بۆستان:** گولستان **دل:**قەلب.**تۆ:**مەبەست یارە.**نەهاتی بۆ:** نەهاتی بۆ دیدار و بە یەک گەیشتن . **نەهاتی بۆ:**بۆچی نەهاتـی؟ یان(بەهاری بۆستانی دل تۆ نەهاتی بۆنەهاتی بوو).:نەهاتی یەکە بۆ گرسیار نەهاتی دووەم بە مانای نەهاتی و نەهامەتی بە بۆچونی من بە هەردو جۆریەوە مانا دەداتن یان هەردوو وشە نەهاتی بوو نەهاتی بوو.یان هەردوو وشە نەهاتی بۆ؟نەهاتی بۆ؟ **بە ئومێدی:** بە هیوای، بە ئارەزووی.**زمستان:**یەکێکە لە وەرزی سال کە کەژێکی ساردو سی و پی لە بەفر و بورانە ولە دوای وەرزی پایز دێتن .

**نەتیجە:**سەرەنجام:دوایی.**شکل:**سیما،وێنە.ئەوەل:یەکەم هەوەل جار. لەم **هەموو:**لەپشتی. **ئەشکال:کۆی شکلە:**زۆر شێوە.**تۆ هەیتت:**کە تۆ هەتە. **کەیووحم:** کەگیانم. **فیدیەی:** قوربانی: **قەدە:**بەژن و بالایە.**جەژنی قوربان:** ئەو جەژنەیە کە موسەلمانان قوربانی و خێرو خێراتی تیا دەکەن حاجیان زیارەتی مالی خوادا دەکەن دەچنە شاری مەککە.

**لەیۆژی:**لە کاتی . **کوشتنم:**قوربانیم ،مراندنم. **دلبەر:**دل فیێن یار، خۆشەویست.**بە حەققی:**بە مافی ،بە هەقی.**چاو:** دیدە. **کال:**یەنگی کال.**ئەگەر:**ئامرازی مەرجە.**جاریَ:** یەکجار. **نەلێی:** نەبێژی.**دەشتی:**بەدەشتی نەلێی.**خەتی:** هێلی. **عەفوی:**لیَ بوردنی

**مانا بە گشتی :**

دیسان یاد و خەیالی یاری بیَ لوتف و مەیلم بە سەر داهات و بەم یادو بیرەوەریەم هەموکارێکم پەکیَ کەوت و پەرێشان بووم و لە تاوان هەر دەلێی گرانی باری کیوانم بە سەر دا هاتووە،ئەمەش تەنیا لەبەردووری لە تۆ و ئەو هەموو نازو و نیعمە ت وجوانیەی بەژن و بالای تۆیە کەوا هەردوو دیدەکانیشم

PDF 4 KURD



شەرمەزارن و پی لە خەم و ئازارو یەنج وجەفاو حەسیەتە، ئای کە لە دووری تۆیا چ ئاە و خەم و پەژارەیەکم بە ســەر داهاتن و، گەلێک خەم و داخ و دەردم لە حەژمەتی دووری تۆیاکێشاوەو هاتۆتە سەر لەوحی جەرگی لەت لەتم و هەناوم پیی جۆشی گریان و زاری بووە و فرمێسکم لە چاوان ئەوەندە بە گوی هاتۆتە خوارێ و وا دەریای عومانم بە سەرداهات ، هەتا کەنگی گەنجینەی خێر و خۆشی تۆ هەر ئاوا دەبێت و هەمیشە هەر لێم قەدەغە کراو و دووردەبێت ، ئای کەلە فیکرو بیری سەدەفخانەی تۆدا چ پەژارەو حەسیەتێکم بەسەر دا هاتیە و لە تاوان وا هەردەم پی خەم و ئازارو حەسیەتم ،بەهاری شادمانی و پی لە خۆشی گولزاری دلەکەی من هەر پێ نەگەیشت و هەمیشە هەر نەهامەتی بوو، هەر بۆیەشە کەوا من بە هیواو ئارەزووی گولستانی تۆ و شاد بوونم بەو بەهارە یەنگینەی تۆیە کەوا زستانی سارد و سیم بەسەر داهاتوە و لەئەنجامی دیتنی سیماو وێنـەی تۆدایە کە یەکەمجار چـاوم بە تۆ کەوت وتۆم بەو هەموو جۆرە جوانی و لە بارو شۆخ و شەنگی یەو دیت و ئاوا گیانی خۆم کردە قوربانی بەژن و بالای جوانی تۆ هەر بۆیەشەکەوا گیانم لە یێی تۆ دایە و یۆژی جەژنی قوربانیمە، دەسائەی خۆشەویستەکەی من گەرتۆ لە یۆژی کوشتنم و خۆ بە قوربان کردنم دا تەنیا بۆجارێکیش لە منی دەشتی نەپرسیت و یەحمێکم پێ نەکەیت ئەوا هەرداوای لێ بوردنتان لێ دەکەم کە بمان بوری .

*

PDF 4 KURD



## دلبەرا فەوتا لە سەر

دلبەرا فەوتا لە ســەر ئەم رێگە عەین و مــیم و رێ
عەمرەکەم چوویەک هەناسەم ماوە دەرچێ رێ و حێ

رووحە تۆزی گەرد و ژێرپایی ویســالت یەک قــەدەم
گەر هەلینی بــۆ عییادەت بێ بە نــوون و ئەلـف و زێ

نازی چاوت شوبهی داوت چین بەچین ئاشــق کوژن
قەت نەبوو جـارێ بترســـــێ تـۆ لە حێ و شین ورێ

حەشری زولفی تۆ لەگــەل کافر یەقین هەمتا دەبێ
چونکە پۆشیتی لە عالــەم رێ و واو میـــــــم و تێ

روومــەتی گولناری چیــمەن پــەرچەمی پڕ چینی تۆ
بوونە وێنــەی چــوونی کوففاران بە جیم و نوون و تێ

جەنتــەتی سینەت بە ئاهی سەردی من تێی دا نەمـا
غەیـری دوو نارنجی بۆ دل پـــــڕ لە ئەلف و واو و فــێ

ئــۆف لەبەر گــریان و شین لازم لە دەشــتا دانشــین
تـا نەرەنجێ مەهجــەبین ئەی دال و شـــین و رێ و تێ

*

---

**مانای وشە کان**:

**دلبـە ر:** دل یفــین ، یاری جوان و لەبار، دلکیش. **فــەوتا:** نـەما، لەدە ست چوو. **رێگـە :** رێباز. **عە ین و میم و یێ:** عومــر، تەمە ن . **هەناسە:** پـشــوو. **یێ وحی :** روح . **- گـەرد :** توز ، غوبار . **ویسال:** بە یەک گـە یشـتن . **قەدەم :** پـا. **گـەر هەلینی :** گـەرباوێـی ، بێی . **عیادە ت:** چـاو پــێ کە وتن، دیدار، مولاقات . **نون و ئە لف و زێ:** نــاز، عیشوە . **شوبهی:** بە وێنەی وەکو. **داو:** تا تاتال،هەودا ، داوی یاو. **چـین بە چـین:** پرچ.بسک زولفی تویێ لە ســەر تویێ،. **قەت:** هە رگیز، حێی و شین و یێ: حەشــر. **حە شر:** رۆژی لی پـرسینە وە ، قیامە ت ، رە ستاخیز، واپەسین، **زولف:** بســک ، تا، پـرچ، کەزی **کافر:** بی باوەر ، خوا نەناس ، گومیاە،یێگە لێ گۆیاو. **یە قین:** را ست بی گومان .**هەمتا:**

یەکسـان ، وەک یەک ، بەرابەر. **پـوشیتـی:** سەرپیـی ڕەش و خشلی سەری ژنانەشە ، دەبەرکردن ، وە شـاردن . **عالـەم :** جیهان ، خە لک . **یێ و واو و میم و تی:** ڕوومەت . گۆنا . **گولنـار:** گولی ناز ناز، چـاوە هەنـارە کە جورە هەتوانیکە بۆ برین بەکار دیت ، **چیمە ن:** مێرگ . **پـە رچـە م :** زولف ، بسک ، **پـیچـین:** چینی زولف، پـرچـی چین چین . **ڕومە ت :** گـۆنا . **چـیمە ن :** میرگ . **وینەی:** وەک **کوففـار:** خوا نەناسان ، بێ باوەیان . **جیم و نوون وتی:** جەننـەت بەهەشت **چـە ننــەتی سینە:** بە هەشتی سینە. **ئاهی سەرد:** ئاخ، هەناســەی خەمبـارو پـەژارەداروبە ئاوات نەگـەیشتن. **غەیر:** جـگـە، بێجـگـە .**دوو نارنج :** دوو جووتە مەمکولە. **پی:** تــەزی . **ئە لف و وا و وزێ :** ئۆف . **گـریان و شین:** زاری و یۆیۆ. **لازم :** پـێویسـت . **دەشت:** بیابان،هامـۆن، ســەحـرا. **دانیشـین :** ڕونیشـــتن . **نەرە نـجێ:** نەتۆری **:** دلـگـیر نەبی. **مەهجەبین:** یووی وە ک مانـگ .**دال و شین وتێی و یێ :** دەشت.

---

**مانا بە گشتی** :

ئە ی جوانی لە بار و نازە نین ودلـگیر ، وا تەمەنم لە ســە ر ئەم ڕیبازەی تۆدا بە سەرچوو و یۆیی ، تەنیا پـشوێکم ماوە کەوا گـیانم دە ربـچـێ و نەمینێم و بۆ هەمیشە لە ناو بچم.، ئەگـەر بێیت و بە عیشوە و نازەوە هەنـگـاوێک باوێـژ ی بۆ دیدارو چـاو پـی کەوتنی من، ئەوسا گـیانم دەبێتە توز و گـەردی ژێر پـایی هاتنی تۆ،ئوەش بە هۆی شادبوون و گـەیشتن بە تۆی خۆشەویستەوە، واچـاوەکانیشت هەروەکو جوانی پـەرچەم و کەزیەکانت بەیەکەوە ئاشق کوژن، قەت جاری نەبوو کە تۆ بێیت و شادم بکەیت و بۆ تەنیا جارێکیش لە یۆژی قیامەت و لێ پـرسینەوە بترسـیت ،ئەوەش چاک بزانە کەبەیاستی یۆژی لێپـرسینەوەی زولفی تۆ لە گـەل کافیران دایە، چونکـە ئەو زولف و پەرچەمەت هەمیشە یوومەتی ناسک و جوانی وەک گولناری تۆی لە خەلک شاردوتەوە، خۆ ئەمەش گوناهێکە، هەر بۆیەشە کەوا گۆنای جوان و پیلە گولی وەک زەنوێری تۆ و زولفی چین چینی تۆ وا قەدەغە کراوە،ئەمش هەروەک شاد نەبوون و چوونی خوا نەناسـانە بە بەهەشت، خۆ بە هۆی ئاە وجەفاو حەسیەتی من سینەی وەک بە هەشتی تـۆش هیچ شتێکی تیدا نەماوەتەوە جـگـە لە دوومەمکـۆلەی وەک نارنج کە پییەتی لە ئوف وحە سـرەت و ئاهی سارد و سیی من ، دەسا ئەی دەشتی لە بەرگـریان و زاری و ئاە و شیوەن دا دەبێ تۆ لە دەشت و هامـۆن دا ڕونیشی ، تاوەکو یووی وەک مانــگ و جوان و لە بارمان لێ نەیە نجـێتن و دلی نەشکێتن.

*

PDF 4 KURD

### دەمێ هوشیارو بیدارم

دەمێ هوشـیار و بێدارم دەمـێ پـر زام و ئـــازارم
هەموو كەس با بـزانیـتن كـە مـن دیـوانەیی یـارم

بەغەیـری وەسـلی جـانـانم لە دونـیا مەحـوە دەرمان
لیقا تـەریاكی ئیشـانم كـە مـن دل گـەستەیی مارم

ئەگەر بەم پـەشمە كـفنم كـەی كـەماهی ڕوو دەكا تـاری
لـەدەم ڕێ بـەسـمە دفنم كەی دەكەی ئـەحیایی ئـاسارم

بەلەت لەت كردنی جەرگم دەپـەنـجەت واخوێناوی بـوو
بە هەولەت بـردنی مەرگـم شەهیـدی عیشـقی دژوارم

هەموو گـەنـجـی حەیـاتی خۆم لـە ڕەهنـی باغی تۆ دانا
بە تۆ ڕەنجـی نـەجاتی خـۆم نەدەم نابـێ ئیـتر چارم

لەبەر ئـاە و جەفایی من فـەلەكی یـەك دەفعـە ناوەستـێ
سەیـری ئـاە و شەفایـی مـن بـەتیغی تـۆ بـریندارم

بەدونارینجی ژێرسوخمەت لەموستەشفایی عوشـاقان
هەناوی عاشـیقان دەبـڕی دەلێـی شاگـردی تیمـارم

بەنوكی پـەنجەكەت سیستەرسیحەربۆڕێی تـەداوی دێی
بەسوكی پەنجەكەت ڕووح دەردەبـێ جیسـمی فیـداكارم

لە ڕۆژی جومعەگەرهەستی بەبێ ئیشی كەمەربەسـتی
بە سەربەستی لە دەشـتی دەی سەری دەكوێتەوە نـارم

*

**مانای وشە كان:**

**دەم:** وەقت ، كات ، **هوشیار:** وریا ، وا گـا ، **بیدار:** واگـا ، بە خەبەر نەنوستو .**زام:** برین . **ئـازار:** رە نـج ، ئێش ،ژان . **دیوانە:** شـێت مەجنون ، شە یدا . **غە یر:** ئێدی ،نامۆ، جـگـە . **وەسل:** گـە یشتن . **جانانم:** دلبەری جوان و نازەنین وخۆشە ویست ،گـیانم . **مەحو:** سـیاو ، نەماو، فەوتاو. **لیقا:**

PDF 4 KURD



دیدار.**تەریاک:** ئەفیون . **پـەشم:** شـال. **کفن:** ئەوپـارچەجاوەیـە کە مردوی تیـا دا دەپـێچنە وە و پێ لەلا گـۆیی دە نین .**ماهی روو:** یوی وەک مـانـگ .**تاری:** تاریک . **دەم:**واتە: روخ ، کەنار. **ێێ:**رێگـە **بەسمە:** ئە وندە م بەسە ، ئەوندە م کافیە **دفـن:** شاردنەوە ، لە گورنان ، **ئەحیا:** زیندو کردنەوە . **ئاسـارم:** نیشـانەکانم **لەت:** کەرت کەرت، شەق شەق ، پـارچە پـارچە. **خوێناوی :** بە خوێن سوو یان **بە هەولت:** بە تیکوشـانت ،بە خەبـاتت ، **یان بەهەولت:** بە ترس وبیـم . **مەرگـم:** مردن . **عیشق:** ئەوین .**دژوار:** سەخت، زەحمە ت. **گـەنجی:** لاویەتی، یان مال و دارایی . **حەیـات:** ژیان . **یەهنت:** گـرە و، ئەوشتەی کە لای کە سێکە وە دای دەنین بۆ متمانە کردن و قەرز پـێ وەردەگـرتن . **رە نج:** ئازار، کاری سـەخت ئەرکی گـران. **نە جات:** یزگـار . **چـار:** عیلاج ، دەرەتان. **ئـاە :** حەسیەت ئاخ وداخ ، هەناسەی خەمبار. **جەفا:** رەنج ، خەم وئازار وناخۆشی. **فەلەک:** گـەردوون ،رۆوژگـار،زەمان،چەرخ. **دەفعە:** جار، بار. **شفا:** چـاک بوونەوە لە نەخوشی . **تیغ:** شومشیر،یا هەر ئامرازیکی تیـژ و بویەندە ، وەبە مانای دیک و تیشکی روژیش هاتووە. **بریندار:**زامدار. **دوونارنجی ژێرسوخمە:** دوو مەمکی لەبن سوخمە . **موستە شفا:** بیمارستان ، نەخوشخانە **عوشاقان:** ئەویندارانی.**هەناو:** ناو،هە ناو،جەرگ وناو، غیرەت ، دەروون. **شـاگـرد :** بە ردەستی وەستا،قوتابی .**تیمار:** خزمەت وئاگـاداری لەنەخۆش. **بە نوکی پـەنجە:** بە سەری پـەنجە **سیستەر:** پـەرەستار، **سیحەر:** بەیانی . **تەداوی:** هە توان کردن دە رمان و چـارە سەری کـردنی نەخوش . **بە سووکی:** بە ئاســانی، بێ ئازار. **پـەنجە :** ئەنـگوست . **روح:** گـیان . **دەردەبێ:** دەردەچـێ **جسم:** تەن ، جەستە **فیـداکار:** گـیان باز، پیشمەرگـە **جومعە :** هەینی **کەمەر:** پـشدترە ێن . **بەستی :** ببەستی . **بەسەربە ستی:** بەئازادی **دەشتی:** نازناوی شاعیر. **نار:** ئاوور،ئاگـر.

**مانابە گشتی** :

من هەمیشەوا واگام و خەو لە چـاوانم هەیماوەو خەوم لێ ناکەوێتن و هەردەم ژیانم تەژی دەردو رەنج و ئازاری برینانە، با هەموو کەسێ ئەوە بـزانێتن کە من شیت و شەیدای یاری خۆمم و جـگـەلە گـەیشتن بەو دلبەرە جوان ونازەنین و خۆشەویستەشم لە جیهان دا هیچ چـارە یەک و هەتوانێکی ترم نیە.من بەهۆی شەیدابونی دیداری یارە خۆشەویستەکەمە کە دلم ئەوەندە پی لەیەنج و ئازارە کە دەلێی شـوێنی پێوەدان و ژاری مارە،ئەی یارەکەی من، ئەگـەر بێت و تۆ بەو شالەی کە یوی وەک مانـگـی تـۆی تـاریک کـردوە کفنم بکـەیت،ئەوەندەم بەسە کە لە کەناری رێـدا بم شاریتەوەو بە خاکم بسپێری،ئەوساکەبۆ هەمیشە نامرم و تۆ زیندووم دەکەیتەوە، تـۆ وا بە لەت لەت کردنی جەرگ و هەناوی من هەموو پـەنجـەکانت وا بە خوینی من سوربووە، وامنیش لە داخی تۆیە کەوا

بەرەو مەرگ و نەمان دەیۆوم، ئەوەش بزانە کە من شـەهیدی ئەشقێکی گەلێ سەخت و زۆر دژوارم کە هەموو دارایی و ژیانی خۆشم لە گرەوی باغی تۆ داناوە ، جـگـە لەتۆش بەولاوە هیچ هیوایێکی ترم بۆ یزگـاری لەم یە نج و ئازار و میحـنەتانەدا نیە، وا لەبەر ئاخ و خەم و پـەژارەو جەفای منیشەکە هەمیشـــەگـەردوون تەنانەت سـاتێکیش لەوەسـتان دانیە، دەتۆ وەرە بیوانەمن و، بۆ چـارەسەری کردنی حەسرەت و ئاهەکانی من و ئەو برینانەی کەوا بە تیری تۆپێکراوە و گەلێ کولەو پی لە ژان وئازارو یەنجە،وا لەنەخوشخانەی دلداران دا بەو جووتە مەمکولانەی وان لە ژێر سوخمەکەتـدا شـــاراوەیەو بەوشێوەیە دەروونی ئاشـقان دەبییـت و دەشـلـێی کە من وا بەردسـتی وچـارەسەری نەخۆشان دەکەم وشاگردی بیمارانم ، تۆ کە هەموو بەیانیان وا بە ناز و عیشـــوەوە بۆ یێی چـارەسـەری دێی وبەجوانی و پـیرۆزی دەسـت و پـە نجەکـانتەوە دەبیە سیستەری تەداوی کردنی هەتوانی دل و برینان، ئەوا لەوکاتەدایە کەوامن گـیانم دەردەچـێ و دەبم بە قوربانی تۆ، خۆ ئەگـەر تۆ بێت و لە یۆژی هەینـــیدا کەوا بێ کـاری و بە ئازادی و بەییزەوە کەمەری خۆت بەبەستیی و بە گورج و گۆلی وزۆر بە دلنیاییەوە ســـەرێک لە منی دەشتی بدەیت، ئەوا هەموو دەرد و ئازارو میحنەتێکی دلی من بۆ هەمیشـە دەبـیێتەوە و ئاگـری ناو دل و دە روونم بۆ هەتا هەتایە دەکوژێتـەوە و زۆر بە ئارامی و ئاسودەیی دەژیم و پەژارە و ئاهەکانم نامینێن.

*

PDF 4 KURD



## یاری خونچەلەب

دەڵێن یـاری خونـچەلەب ئەواهاتە شـارەوە
ئەنـــووسـێ جـــەفای بولبولی دلی، بەزارەوە

لەتەحـریری فیرقــەتا دەلەرزێ لە حیـددەتا
گـەلای ویســالی منە لە نـاو لێــرەوارەوە

برینــداری قەدی ئەوئەمینداری حەددی ئەو
بەزولفی کەمەنـدی ئەو ئەپـێــچێ لەدارەوە

لە میــنایی گەردەنی دەبیــنم کە پـێکەنی
هەیاسەی کەشل دەبوو بەدوگمەو و قەتارەوە

بەعەتری هەناسەبووکەدڵ گـیژوکاسەبوو
لە شـیوەن کەهاتە سـەرسەماوو بەلارەوە

چ ڕۆژێکەئەیخودا لەڕۆژۆێ ئەیکەی جـودا
لەبن سوخمەسـورەکەی گوڵی سەرچنارەوە

لەمن چارەیی بکەن بەدوونەقشی بێ بکـەن
وەرن سـەربەپـارەکــەن لەڕێگەی هەزارەوە

بەموتریب کەدەنـگ ئەدابەساقی کەڕینگ ئەدا
لەڕێی عەشقە بەنـگ ئـەداڵە نێوکارو بـارەوە

کەدەستی تفەنـگ ئـەداڵەڕێبازی جەنگ ئـەدا
لە دەشـــتی غەدەنگ ئەدا بـەدووتا عـیزارەوە

**مانای وشەکان** :

**دەڵێن** :دەبێژن . **یار**: خۆشەویست .**خونچە**:گوڵی نەپشکوتوو **لەب**:لێو **ئەواهاتەشارەوە**:وا هاتە ناو شارەوە .

**ئەنووسێ**: دەنوسێتن ،یاداشتدەکاتن **جەفای**:یەنج و ئازاری . **بولبولی**:باڵندەی ئاشقی گوڵ **دڵ**:قەلب.**بەزارەوە**:بەدمەوە، بەدەهانەوە .

PDF 4 KURD



**لەتەحریری** : لە نوسینی **.فرقەت**: لەجیابوونەوە.یان لە یزگاری **دەلەرزێ**: دەجولێ **لەحیددەتا**:لەتاوان ، لە حەژمەتان .

**گەلای**:بەرگی **.ویسالی من**:گەیشتنی من **.لە ناو لێیەوارەوە**:لە ناو جەنگەلەوە.لە ناو داروبارەوە .

**بریندار**:زامدار.**قەددی ئەو**:بەژن و بالای ئەو **.ئەمینداری**:باوەی پێ کراوی پاسەوانی **حەددی ئەو**:سنووری ئەو ،مەرزی ئەو .

**بەزولفی**:بەبسکی، بە پرچی،بە کەزی.**کەمەندی ئەو**: جۆرە گوریسێکی ئەستوورەکە بۆشەیوگرفتاریکردن بە کار دێتن ،ئەو کەمەندەی کە بەسەر داری بەرزو خانووەبلندەکان وکیوان دەکەون. **ئەپێچێ لە دارەوە** :بەدەوریدا دینێ،لەدار دەئالێنێ.

**لە مینایی**:سپی یەنگ،ناوی گولیشە،بە هەموو شتێکیش دەلێن کە بە زێیو زیو نەخش کرابێ . **گەردەن**:مل،ئەستۆ،لە چەنەگە تاسەر سینە.**دەبینم**:بە چاو دەبینم لێم دیارە.**کەپێکەنی**:لەوکاتەدا کە وەخەندە دێت و بزەی دێتێ.

**هەیاسە**:جۆرە خشلێکی ژنانەیە.**کەشل دەبوو**:کە دەبۆوە،کە خاودەبۆوە. **بەو دوگمە و قەتاوە**:دوگمە و قەتارە هەردوکیان خشلی ژنانەنەیە کە بۆجوانی بە خویانەوە دەکەن .

**بەعەتری** :بە بۆنی **.هەناسە**:پشوو ،هەوای مژین **.کەدل**:کەوا قەلب. **گێژ**:کاس ووی. **کاس**:گێژ،ووی.

**لە شیوەن**: لە گریان و زاری. **هاتەسەر**:کەوتە بالا،دەستی کردە . **سەما**:هەلپەیین.**بەلارە**:جۆرە گۆرانیەکە کە کچان بە ئاوازی تایبەتی گەروو و قامک بە نۆتی تایبەتی خۆیەوە بە کویان دا هەل دەلێن و جارو بارەش کویان بە کچان هەلدەلێن .

**چ یۆژێکە**:یۆژیکی چۆنە،یان کەیە؟ **ئەی خودا**:ئەی یەزدان. **لەیۆژێ**:لە خۆرەتاوا.**ئەیکەی جودا**:جیای دەکەیتەوە.

**لەبن**:لە ژێر.**سوخمەسوورەکەی**:کراسەیەنگ سوورەکەی . **گولی سەرچنارەوە**:گولی لە سەردارچنارا.

**لەمن چارەیێ بکەن** :چارەیەک لە من بکەن . **بە دوونەقشی بێ بکەن** : بە دوودانە بێێ یەنگین بکەن.

**وەرن**:بێن **.دل بەپارەکەن**:دل پارچەپارچە بکەن. **لە یێگەی**:لە یێبازی. **هەزارەوە**:بولبولەوە.واتە لە یێی ئەشقی یارەوە

**بە موتریب**:بە گۆرانی بێژ،بە مۆزیکار.**کەدەنگ ئەدا**:کە گۆرانی پێ دەلێت،کە بە دەنگی دێنێ **.بەساقی**:بەمەیگێی . **کەیینگ ئەدا**: کەدەکەوێتە سەماو هەلپەیین،یینگ،ینگ جۆرە موسقایەکی تایبەتیە.

PDF 4 KURD



**لەرِێی**:لە ڕێبازی،لە ڕێگەی.**عیشق**:دلداری،خۆشەویستی.**بەنگ ئەدا**: کە سەرخۆش دەکا،بەنگ واتە حەشیش ،حەشیش گیـایەکە کە دەیکێشن خەیال دەیـــان گرێ . **لە نێو**:لە بەین، لە نێوان.**کاروبارەوە**:ئیش و کارەوە.
**کەدەستی تفەنگ ئەدا**:دەست کە ئەداتە تفەنگ .**لەرێبازی**:لە رێگەی .**جەنگ ئەدا**: شەی ئەدا.
**لە دەشتی**:نازناوی شاعیرە،لە دەشتی ئەدا .**غەدەنگ**:0بەدنامی گوتن، پەلار.**بەدووتا عیزارەوە**:بە جوتە بسکەکانیەوە،بە دوو کەزیەکانیەوە.

**مانا بە گشتی**

دەڵێن وا یاری جوان و نازداروشۆخ و شەنگ و لێو وەک خونچەگول هاتە ناو شارەوە و یەنج و ئازاری دلی وەک بولبول دەپرسێت و دەینوسێتەوە، هەر بۆیەشە کەوا لە حەژمەت خۆشی و رزگاربونم لە دووری و فیرقەتی یارە خۆشەویستەکەم دا هیوای گەیشتنم بە یاری خۆم و شادبونم بە یارە نازدارەکەم لە ناو لێیەوارەوە دەلەرزێتن.من بریندار بەژن و بالای یاری خۆمم و باوەی پێکراوی ئەو خۆشەویستەم کەوا بە زولفی درێژی وەک کەمەندیەوە منی توش گرفتاری یەنج و جەفا کردوە، هەمیشە ئەمەش لە جوانی گەردەنی ئەودا دەبینم لەو کاتە دا کە هەیاسەی لە گەل دەوگمە و قەتارەی شل دەکاتەوەودلم بە بۆنی هەناسەی ئەوگێژ وکاس دەبێت، بە تایبەتی کە لەکاتی گریان و زاری کردنم دا دەهاتە سەر سەماو بالۆرە گوتنەوە،ئەی خودایی من ئەمە چ یۆژێکە کەوا لە خۆرەتاوی جیا دەکەیتەوە کەوا لە ژێر سوخمەی سوورەکەی گولی سەرچنار دایە، وەرن چارەیەک لە من بکەن،هەتوانی دلی من بە جوانی و یەنگینی دوو جووتە بێ یەکان بکەن و ئەوسا بم کەن بە قوربانی لە ییگەی ئەشق و خۆشەویستیدا،بەتایبەتی لەو کاتەدا کە گۆرانی چیان و موزیکاران دەنگ دەدات و دەیان بزوێنی و ساقی مەیگێریش وەنەشئە دەخاتن و لە یێبازی دلداری دا دلان شاد دەکاتن و لەناو کارو بارەوە مەستی وەدی دێنێ و خەم و ئازاران وەلا دەباتن،کە دەستیش دەداتە تفەنگەوە یاستەو خۆ لە یێبازی جەنگ دەداتن و بە هەرد و تا بسکەکانیەوە یاستەو خۆ لە دەشتی غەدەنگ ئەداتن. .

*

PDF 4 KURD



**دلبەر چیە**

دلبـەرچـیە ئەمرۆ بە هەموو دەم لە نیقـابا
قد اقتضـت الـرّحمه والنور حجـــــــابا

نیشانەیی مەحشەربووە دەسمالی ڕەخی تـۆ
قـد اقترب الـوعد من الحــقّ حســــابا

گیراوی سەری حەلقەیی زولفی تـووەڕووحم
فی سلسـله الخـدعـه قـد کنــــت غــرابا

تاری بـووە چـاوم بــە فیـراقی تـووە تــاوم
کالشّمــس اذا صیـّرت الــــــــــماء ترابا

بێکەس کە ئەســوڕێمەوە لەم نـاوە بە نــاوت
ملّکت من الـــــویل جـــــحیـما وعــذابا

لەم سینەتە بەم سیرِەتە دل زاهیـدە بـۆیـێ
حــــــرّمت علی النّفس طـــــعاما و شرابا

سـەیری کەفیراقی تۆ منی خســتـە چ حـالێ
الآن رمیـــم ولقـد کــنت شـــــــــبابـا

خوینی منە ئەم گەردەنە ئــارەق ئەتکـینێ
اذ کان فـؤادی لک بالعـطـــــــــش مئـابا

تا باقـیە عومـرم وەرە لـەم غوربەتە فەرموو
عافیــتک دشــــــــــتی ظهــرالأمرثــوابا

*

**مانای وشەکان** :

**دلبەر**:یاری جوان و دلفێن .**چیە**:وشەی پرسیارکردنە،چی یوویداوە . **ئەمێۆکە**:ئێرۆکە. **بەهەمووەدەم**:لە هەموو کاتێ.**نیقاب**: یوبەنــد،ئەو پارچەیەی کەیووی خـۆ پێ دەپۆشن و دەیشارنەوە،پێچە.

PDF 4 KURD



قد:بەیاستی . اقتچت : پێویستی . الّرحمە:خێرو بەرەکەت، خێرو خۆشی والنّور:ڕۆناکی .حجابا:پەردە،پوپۆش.

**نیشانە**: بەلگە.**مەحشەربووە** :ڕۆژی قیامەت بووە. **دەسمالی**: دەستەسیی، دەسرۆکەی. **یوخی تۆ**:ڕوویی تۆ ،گۆنای تۆ.

**قد**:بەیاستی **اقترب**:نەزیک بووە.**الوعد**:پەیمان .**من الحق**:لە یاستیدا **حسابا**:ژماردن.

**گیراوی**:بەندی ،گراوی . **سەری حەلقەیی**:سەری بە گروازەی .**زولفی تووە**:پرچی تووە،بسکی تووە.**رووحم**:گیانم .

**فی**:لە **سلسلە**: یەک لەدوای یەک.. **الخدعە**:خەلەتاندن .**قد کنت**:بەراستی بومەتە.**غرابا**:دوورکەوتنەوە، نادیار.ون تاری.

**تاری بووە**:تاریک بووە ،پێچەوانەی ڕۆناک .**چاوم**:دیدەم.**بەفیراقی تووە**:بەدووربوونەوەی تووە .**تاوم**:حەژمەتم .هەتاوم .

**کالشّمس**:وەکو ڕۆژ.**اڑا**: ئەگەر.ڕێیرت:بگۆڕێ .الماء: ئاو ترابا:خۆل .

**بێکەس**:بێ دۆست وبێ یارو کەس و کار.**ئەسوێیمەوە**: دەوردەدەمەوە.دێم و دەڕۆم. **لەم ناوە**:لەم دەور و بەرە .**بەناوت**: بە ناوی تۆوە،بەیادی تۆوە.

**ملّکت**: بومەخاوەنی:من:لە. الویل:بیریکی قوولی پیئاگری دۆزەخە. جحیما:دۆزەخ. وعژابا:یەنج و ئازار و دەرد .

**لەم سینەتە**:لەم سینگەی تۆیا،بە مانای مەمکۆلەش هاتووە.**بەم سییەتە**:بەم ڕێگەیە،بەم یەوشە،بەم ئاینە.**دل**: قەلب. **زاهیدە**:پارسایە،کەسێ کە تەرکی دونیا بکاتن .**بۆیێ**: لە بەر هەندێ.

**حرّمت** :حەرامم کرد. علی النفس .لە سەرخۆما. **یعاما**:خواردن . وشرابا:خواردنەوە .

**سەیرێکە**:بنوایە.**فییاقی تۆ**:جیابوونەوەی تۆ،دووری تۆ .**منی خستە**:منی خستۆتە. **چحالێ** : چجۆرێ ، چ ژیانێ .

الآن:ئیستاکە .رمیم:پیری.ولقدکنت:بەیاستی لەمەوبەریش . شبابا:گەنج،لاو.

**خوێنی منە** :خوونی منە.**ئەم گەردەنە**:ئەم ئەستۆیە.**ئارەق**:ئاوی لەشی مرۆ.**ئەتکێنێ**:دێنتەخوارەوە.

اڑ:گەر.کان:بوو . فؤادی:دلی من لک:بۆ تۆ. بالعیش :بە تێنوتی . مآبا : گەیاوە،سەرچاوە .

**تا**:هەتا **باقیە**:ماوە.**عومرم**:تەمەنم .**وەرە**:بێ.**لەم غوربەتە**:لەم دووریە،لەم نامۆییە.**فەرمو**:بفەرمو:وەرە.

عافیتک:نۆشت بێ ،پیرۆزبێ ئافەرین.دشتی:نازناوی مەلاخدری نانەکەلیە. گهرالأمر:واکارو بار دەرکەوت و دیارە. یْوابا :بەچاکە گەیاوە .

**مانا بەگشتی** :

ئەی دلبەری جوان و نازدار ئەوە بۆچی وا ئیمێکە هەمیشە یووی خۆت داپۆشیوەو دەیشاریتەوە،خۆبەیاستی پێویستە کەخێرو خۆشی و یۆناکی یووی تۆ هەر دیاربێتن و هەرگیز ون نەبێتن،ئەو دەستمالەی کەیووی تۆی داپۆشیوە ئەوە بەلگەیە بۆ یۆژی حەشر، وا کاتی پەیمان و وەدی هاتنی مافەیەواکانە کەوا دیاری بکرێتن، وا گیانی من بەستراوە بە تۆ و گێرودەی تۆیە و تۆ هەروەکو یۆژ وای کەوا چۆن خۆرەتاو بە تاوی ژیان بەخش و بە تینی ئاو وشک دەکاتەوە و لە بنی دێنێ .
من والە تاوی جیابوونەوە و دووری تۆیا دیدەکانم لێ تاریک بووە و لەناو ناخۆشی و ئازاری گولخەنی دۆزەخ دا دا یەنج و میحنەتان دەکێشم ، هەر لە بەر هەندێشە کەوا هەموو شتێکم لە خۆ حەیام کردووەو ژیانم لە خۆما تال کردووە،دەتۆ بنوارە من کەوا دووری تۆو نامۆییم چی وەسەر هێناوم و منی خستۆتە چ ژیان وحالێکەوە ، منی کە تا دوینێ لاوێک بووم و ئێستاکەش وا دەستی گۆپالی پیری دەگرم و ئەم ئارەقەی کە لەو گەردەنە دێتە خوارەوە ئەمە خوێنی منەوا دەتکێتەوە، دلی من کەوا تێنوی تۆیە لەبەر هەندێیە چونکە تۆ سەرچاوەی خۆشەویستی و ئاواتی منی،دەسا وەرەتا ماوم لەم دووری و غەریبیەدا ئەگەر بۆ جارێکیش بێت بلێ ئافەرین ئەی دەشتی کەوا یەنج و ئازاروجەفاو دووری کاری تێ نەکردووی و ئەم گۆیانکایەشت لێ پیرۆز بێتن کەوا یوو بەرەو چاکەی و کاری یەوا وەدی دێتن و تۆش بە ئاواتی خۆت دەگەی.

*

PDF 4 KURD

## دیسان فەسلی بەهارم

دیسان فەســلی بەهارم هات زمستان چوو یـارەکەم
لە شــەوقی گول چریکەی بولبــولان وا دێ یارەکەم

تەماشا چۆن هەموو باغێ وەکو جەننەت سەوزەچێ
خسوسەن شـــاخ و داخی کوردەکانی بێ چـارەکەم

هەموو دلبەر لەگەل ســاقی بە یادی مەســتی دەرۆن
خســـوســەن چاو بەنازی کوردەکـانی بێ حالەکەم

هەموو حۆری لەکەیفی ڕووی بەهاری خۆی کەیفەکا
خسووسـەن ئـاسکەکـانی کوردەکانی غەمخـۆرەکەم

بە نۆبەت بـۆ ســەماوو چەپلــە بـازی وا جــەمعەبن
خسـوسەن قەد نــەمامی کـوردەکــانی بێ زارەکــەم

بە ڕمبـازی خــەریکن نەوجــەوانانی مـەملــەکـەت
خسووســـــەن لاوەکانی کوردەکـانی دلـدارەکــەم

کلوک و لالە پشـــــــکوتن لە هەر جێگـــادەشـتییا
خسـوسەن ڕووی قــەراجی کوردەکــانی بێ بابەکەم

---

**مانای وشەکان** :

**دیسان**: جارێکی تر. فەسل:وەرز،کەژ. **بەهار**:وەرزی شادی ســال و سەوزایی یووی جیهان کە لە دوای زستان دێت . **هات**: گەیشت. **زمستان**:وەرزی ساردو سیی سال. کە لە دواوی وەرزی پاییز دێت .**یارەکەم**: خۆشەویستەکەم .

**لەشەوقی**:لەدلخۆشی و بەزمی .**بولبولان**: بالندەکانی ئاشقی گول ، هەزراە.**وادێ**:وا بە یێوەیە . **یارەکەم** : خۆشەویستەکەم .

**تەماشا**:بنواین :**چۆن**: کوو،چلۆن.**هەموو باغێ** : گشت باغ و باغاتێک . **وەکو** : بە وێنەی. **بەهەشت**:فردەوس .**سەوزەچێ**: شین بۆتەوە و گیاو گۆل و سەوزایی لێ یواوە.

PDF 4 KURD



**خسووسەن**:بە تایبەتی: **شاخ و داخی**: چیاو چۆلی کێوی.: **کوردەکانی**: گەلی کوردی . **بێ چارەکەم**:بێ هەتوانی برینان و زامەکانی .
**هەموو**:گشت ،خی.**دلبەر**:نازداران و شۆخ و شەنگەکانی دلفیێن. **لەگەل ساقی**:بەیەکەوە لەگەل مەیگێی .**بە یادی**: بۆ یاد وبیرەوەری. **مەستی**: سەرخۆشی وسەیران .**دەیۆن**: دەچن .
**خسوسەن**: بە تایبەتی . **چاوبەنازی**:دیدە پی لە نازو دلبەرانی دلتەی.**کوردەکانی**: میللەتی کوردی .**بێحالەکەم**:بێ ژیان و پی لە ئازارو یەنجەکەم .
**هەەموو**:گشت،خی. **حۆری**:پەری. **لەکەیفی**:بەهۆی شادی. **بەهاری خۆی**: وەرزی بەهاری شادی وخۆی . **کەیفەکا**:شادی و سەیران دەکاتن.
**خسووسەن**: بە تایبەتی. **ئاسکەکانی**:مامزەکانی،ئاهوکانی. **کوردەکانی غەمخۆرەکەم**: کوردەکانی پەژارەدارو خەمبارەکەم .
**بە نۆبەت**: بە نۆرە.**بۆ سەماو**:بۆ هەلپەیکی و شایی .**چەپلەبازی**: چەپلەلێدان و بەزم و شادی . **واجەمعەبن**:وا کۆ دەبنەوە.
**خسوسەن**:بە تایبەتی. **قەدنەمامی**:بالابەرزانی وەک نەمام. کوردەکانی گەلی کوردی **بێ زارەکەم**:بێزاو و ژیان پی لە دەردو پەرێشانەکەم .
**بە یمبازی**:بە ئەسپ سواری و غارغارێن. **واخەریکن**:وا مەشغولن. نەوجەوانانی: لاوکانی تازە پێ گەیی و.**مەملەکت**: وەلات .
**خسووسەن**:بە تایبەتی . **لاوەکانی**:جحێلەکانی.**کوردەکانی**:گەلی کوردی **دلدارەکەم**:ئەویندارو ئاشقەکەم.
**کلوک**:جۆرە گولیکی بەهارانە.**لالە**:ئەمەش ناوی گولێکە.
**پشکوتن**:کرانەوە.**لەهەر جێگا**:لە هەر شوێنێ.**دەشتیا**: ئەی دەشتی کەنازناوی شـاعیرەو بە مانای ئەوەش دێت کەلە هەر شوێنێ کە دەشتاییە وا کلوک و لالەی لێ پشکوتووە و یازاوەتەوە .
**خسوسەن**:بە تایبەتی .**یووی**:سەتحی ،سەر.**قەراج**:دەشتێکی پان و بەرینی کوردەواریە و سەر بە پارێزگای شاری هەولێری دیرینە. **بێ بابەکەم**:بێکەس و بێ خاوەن و بێ ناوەکەم .

**مانا بە گشتی**:

ئەی یارە خوشەویستەکەم وا ئەمجارەش وەرزی بەهاری من هاتەوە و زستانی ساردو سیی سال یۆیی و نەما، ئەی یارەکەی من وا بولبولانی ئەویندارو ئاشقانی گول ئاوازی شادی و خۆشی و نەغمەی دلداریان پیە لە هیواو ئارەزویان وا بە هاتنی گولی بەهاران و وەرزی شادی و خۆشی دەخوێنن و دەنگ و ئاوازیان بەرز دەبێتەوە، تەماشاکەن و بیوانن کەوا چۆن هەموو دەشت و دەرو باغ و زەنوێرانی کوردەواری گی لە گول و گولزارەو وا یایەخی سەوزایی بەهارانیان یاخستووەو وەک بە هەشت وایە،بە تایبەتی چیاو چۆل و کێو وشاخ و داخەکانی

PDF 4 KURD



گەلی کوردی بێ چارەو بێ هەتوانی زام و برینەکەم،دەبنواین وا هەموو دلبەران و نازداران وان لەگەل ساقی مەیگێیدا بۆیادو بیرەوەری شادی و دلخۆشی وامەستن و زۆر بە خۆشیەوە وا بەرەوئاقارو دەرو دەشت دەیۆن،بەتایبەتی چاو بەناز و شۆخ و نازدارەکانی گەلی کوردە بێ ژیان و پی لە ئازارەکەی من،وا تەواوی پەریان لە شادی و خۆشی هاتنی بە هاری یەنگین تەژی بەزم و سەیران و شادمانین و واداوەت و گۆوەندو شایانە،بە تایبەتی نازداران وئاسکەکانی گەلی کوردی خەمخۆرو داخ دارەکەم،وا بەتێکیایی و بە نۆرە بۆ سەماو وچەپلەبازی وگۆوەند کۆدەبنەوە،بە تایبەتی بالابەرزو قەدنەمامانی گەلی کوردی لە ژیان بێزارەکەم ،وا بە یمبازی خەریکن لاوەکانی نیشتمانەکەم بە تایبەتی گەنجەکانی گەلی کوردی ئاشق و دلدارەکەی من،ئەی دەشتی وا لە گشت جێگایێ کەدەشت و هامۆنە سەرتاپایەەنگین بووەو کلوک و لالە پشکوتن وتا بنوایی هەمووی هەر یازاوەیەو نەخشینە،بە تایبەتی دەشتی پان و بەرینی قەراجی جوان و یەنگینی کوردەکانی بێکەس و بێ بابەکەی من.

*

PDF 4 KURD



## دائیم لەغەمی دووری

دائیــم لەغــەمی دووری ســەودا ســەرو داماوم
بۆ شـاری مــەدینــەی یــار تاری بـووە دوو چاوم

هەردەم وەکـوو مەجـنـونم چارم نیـە بــۆ چـوونـم
بـۆ ڕەوزەیـی گولــزاری دڵ بولبــولــی کـوژراوم

لەو ڕۆژەوە یـەک کــاسی وەسـلی بـە منـی کاسـی
بەخشـی بەڕوخی ئەو ،دڵی پــەروانـەیــی ســوتاوم

تـەنـدووری خوانی ئـەو پــڕلە ناری ویســـــالی تی
بۆیە بـەهەموو دەم من لـەم فــیرقەتــە فەوتــاوم

خوێنی جگەری لەت لەت نـەقشی تــۆدەکێشــێتن
بـۆیێکــە بـە شومشـادی تــۆوە کوشـتەیـی داوم

وەقـتی کەخەیــالی تـۆم بـۆ دێ لـەڕەهی هیجرەت
بۆ یـاری رە هــــو نـێــو غـار دڵ بــادەیــی زەهراوم

ســەدیقی وەفادارت زاتێــکـی کـامـی یــــــــارت
بۆ شـەهدی دەم و زارت هێـنــاوەتــە بــەر چاوم

سەیـریکەبەسەربەستی ڕێگەی جەبــەل ودەشـتی
وەک بـەحرە بـەبێ کـەشـتی دڵ ئەلبـەتە خـنکاوم

---

**مانای وشەکان** :

**دائیم**:هەمیشە،هەردەم **.غەم**:پەژارە**.دووری**: جیابوونەوە، غوربەت. نامۆیی. **سەوداسەر**:بێ سەر و بێ شوێن،پەریشان،نا ئارام.**داماو**:خەمبار،حەزین ،پی خەیال و ناشاد.

**بۆ شاری مەدینە**:شاری مەدینە ئەو شارەیە کە ئارامگای مەحەممەدی پەیامبەری خوای لێ یە **.یار**:خۆشەویست. **تاری**: تاریک، شێلو**.بووە**:وەدی هاتوە **.دووچاوم**: هەردوک دیدەکانم. **هەردەم**:هەمیشە**.وەکو**:بە شێوەی. **مەجنون**:

PDF 4 KURD



دێوانە، شێت، مەجنونی ئاشقی لەیل.**چارم:** هەتوانم، چارەسەریم. **نیە:**پەیدا نابێ،ناکرێت.**بۆچوونم:**بۆ ئەوەی کە بتوانم سەفەری شاری مەدینە بکەم.

**بۆیەوزەی:**بۆ ئارامگای ،بۆ مەرقەدی.**گولزاری:**وەک گولزاری،وەک زەنوێری . **دل:قەلب.بولبول:**بالندەی ئاشقی گول.**کوژراوم:**لە ناو چووم،نەماوم.

**لەویۆژەوە:**واتە لەو کاتەوە کە زیارەتی شاری مەدینەم کردووە.**یەک کاسەی:**یەک بادەی. **بە منی کاسی:** دا بە من .

**بەخشی:**پێیدام،پێی کەیەم کردم. **بە یوخی دل:**بە یووی دل. **پەروانەی سوتاوم:**وەک پەروانە وام بە گیی ئاگرئەوینی ئەوەوە سوتاوم.

**تەندووری:**بەو شوێنە دەلێن کە ئاگری تیا دەکرێتەوە،کورەی ئاگر **خوان:** سیفرە.**ئەو:**مەبەست پەیامبەرە. **پی:** تەژی. **نار:** ئاگر. **ویسال:**گەیشتن.

**بۆیێ:**لەبەر هەندێ.بەهەمووو دەم لە هەمو کاتێک دا،هەمیشە. **من:**ئەز.لەم **فیرقەتە:**لەم دووریە.فەوتاوم: نەماوم.

**خوێنی:**خوونی .**جگەر:**هەناو.**لەتلەت:**پارەپارە.**نەقشی:** وێنەی، سیمای، شکلی. **تۆ:**مەبەست پەیامبەرە.دەکێشێتن:دروست دەکاتن،نەخشی دەکاتن.

**بۆیێکە:**لەبەرهەندێ.**شومشاد:**داریکە کە گەلای خی و ورد و ئەستوری هەیە،دارەکەی زۆر بەهێزە بۆ دروست کردنی شتی نایاب و جوان بە کار دەبردرێت..**تۆ:**مەبەست پەیامبەرە. **کوشتە:** فەوتاو،کوژراو.**داوم:**تەلەم.

**وەقتی:**کاتی.**کەخەیالی تۆم:**فیکری تۆم،مەبەست پەیامبەرە. **بۆدێتن:**دیتە یاد.**لە رەهی:**لە یێگەی.**هیجرەت:**کۆچ کردن.

**بۆیاوێ:**بۆ خۆشەویستی.یە هو:یێگە و.**نێوغار:**ناو ئەشکەوت، مەبەست ئەبوبەکری سەدیقە.**دل:**قەلب.**بادە:** جام. **ژەهراوم:** زهەراویم.

**سـەدیقی:**یاری.وەفادارت:بەوەفاودلسۆزت.**زاتێکی:**گەورەپیاوێکی.**کام:**شیرین ئارەزوو،زار **یارت:**خۆشەویستت. **بۆشەهد:** بۆ هەنگین .**دەم و زارت:**بۆ شیرینی زارت. **هێناوەتە:** هاتۆتە. **بەرچاوت:**پێش چاوت.

**سەیریکە:**بنوایە.**بەسەربەستی:**بە ئازادی. **یێگەی:**یێبازی.**جەبەل:** کێو،چیا **دەشتی:** سەحرای، هامۆنی. **دەشتی:**هەم نازناوی شاعیریشە.

**وەک:** وەکو.**بەحرە:**دەریایە. **بەبێ کەشتی:**بەبێ پاپۆی.**دل ئەلبەتە:**ئەلبەتە لەو کاتەدا **دل خنکاوم:**غەرق بووم.

**مانا بە گشتی** :

هەمیشە لە دووری یارە خۆشەویستەکەی خۆم دابێ سەرو سەدام و دل پی لە ئازار و خەم و پەژارەم و هەمیشە لە تاو شاری مەدینەی یاری ئازیزم هەردوو دیدەکانم تاری بووە و هیچ شتێک نابینم و دل بە خەمم و هەمیشە وەک دیوانە وام و وەکو مەجنون ئەویینداری لەیلی خۆمم و هیچ چارەیەکیشم نیە بۆ سەردان و چوونم بۆ ئەو شارەی کەوا یاری منی تیا دایە، وا لە حەژمەتی دووری ئارامگای

PDF 4 KURD



وەک زەنوێری یاری خۆشەویستی خۆم نەماوم ودلم وەکو بولبول ئەویندارەو بە ئاوات نەگەیشتوم و لە ناو چووم، لەو کاتەوە یا کەوا چووم بۆ زیارەتی ئەو زاتە گەورەیە و بادەیەکی پیلەخۆشەوستی دا بە من و پێی بەخشیم و نۆشم کرد،وا بۆی سوتاوم و دل پی لە ئاگرم،بە یادو بیرەوەری ئەوزاتە وا تەواوی دەروونم بووەتە سیفرەی خۆشەویستی ئەو و دلم پیبووە لە ئاگروگی بۆ گەیشتن بەو یارەخۆشەویستەم و ئۆقرەم لێ هەلگیراوەو هەر لە بەر هەندێشە کە وا هەمیشە من لە تاو دووری دا نەماوم و وا لە ناو چووم، خوێنی جەرگی لەت لەتی من هەمیشە نەخشەو سیمای ئەو یارە شیرین و خۆشەویستەم دەکێشێن هەربۆیەشە کە لە تاو گەورەیی و زاتی پاکی ئەو وا گیرودەی داوم و لە تاوان بیایمەوەو کوژراوم ،کاتێ کە ئەوم دێتە ناو خانەی خەیال و هەست و بیرم یۆ لای ئەوەوە دەیواتن و کاتێ کە ییبازەکەی ئەوم لە کاتی کۆچ کردنی بۆ شاری مەدینەو یارە بەفاو دلسۆزەکەی ئەو واتە ئەبو بەکری سەدیقم دێتەوە یاد ئەوا لە تاوان دلم پی لە ژار دەبێتن، یاری تۆکە حەزرەتی ئەبوبەکری سەددیقی بەوەفاو دلسۆزت بووە ، ئەو زاتە گەورەیەم دێتەوە بەر چاوان و دەزانم کە یاری تۆ و ییبازی تۆ چەندە گەورە و شیرین و خۆشەویستە،بنواین کە وا منی دەشتی چەند بە سەربەستی و ئازادی لەو ییە دوورو درێژەی شاری مەدینەی یارم کە هەموو چیاو چول و بیابانە و وەک دەریا وایەو ئەلبەتە بەبێ کەشتی و نەبوونی ئامرازی چوونیشم بۆ ئەوشوێنە لەو دەریایەوە تیادا خنکاوەم و بە ئاوات ناگەم .

*

## رەنگ و رووی

ڕەنگ وڕووی گولناری من هەم دوژمن وهەم یارمـە
بۆ ڕوخـی ئەو یووحـی شـــــیرین دائیما ئەغـیارمە

ماهی ڕوچەرخی کەســـویاهەوری زولفی کەوتەبەر
بۆیێ بـارانی دووچـــاو لیشاوی ڕووی تەمبارمە

دل بە تەنـها کەوتە ســـــــەر فڕاقی قـەددی تۆ
بێکەس و بێــدەر بە دائیــم شین و زاری کـارمە

باغەبـانی سـینەکــەت گــەر بـێ بدووریێ کفنەکەم
وەسـلە بۆمن چونکە خــەیـیـاتی دەری گــولـزارمە

ڕووحی دەشتی گەرفیدایی لەنجەیی پەنجــەت ببێ
ڕەنجی گەنجـم بۆتـە ڕەنــجم مـەتلەعی ئەفکارمە

**ماناى وشەكان** :

**یەنگ**:شێوە،سیما **یوو**:گۆنا،یوخسار.**گولنار**:ناوی گولێکە،نا وی ژنانە لێرە تەشبیهی یووی یارە بە گولنار،یووی وەکو گولنار. **هەم**:هەروها.**دوژمن**:نەیار.**یار** : خۆشەویست ،هەڤال، هاویێ. **بۆیوخی**:بۆ گۆنای،بۆ یووی. **ئەویوحی شیرین**:ئەوگیانی شیرین. **دائیما** : هەمیشە. **ئەغیار** : بێگانە،نامۆ، غەریب.

**ماهی**:مانگی.**یو**:گۆنا،یوخسار.**چەرخی**:سویان،چەرخ،یۆژگـار.**کەسویا**:کەئاویی دایەوە، کەروی وەرگێیا، کەسویایەوە.**هەوری**:لێرە پرچی تەشبیە بە هەور کردووە. **کەوتەبەر**:واتە زولفی بەری یووی یاری گرت وەک چۆن هەور یووی یۆژێ دەگرێتن.

**بۆیێ**:لەبەر هەندێ.**بارانی**:مەبەست فرمیسکە بە باران تەشبیە کراوە.**دووچاو**: هەردوو دیدەکان.**لیشاوی**:لافاوی،باران کە بە گوی دەبارێ دەڵێن باران بە لیشاو دەبارێ لێرەش تەشبیهەبە فرمێسک ،بارانی بە لیشاو بارین کە لە تاو داگۆشینی یووی یاری دێتە خوارەوە. **یووی تەمبارمە**:یوخساری بە خەممە،خەمگینمە.

**دل**:قەلب.**بە تەنهاـ**:بە بێ کەسی.**کەوتەسەحرای**:کەوتە بیابانی. **فیراقی**: جیابونەوەی.**قەددی تۆ**:بەژن و بالای تۆ.

**بێکەس**:تەنهاـ.**بێدەر**:بی شوێن و جیگا.**بە دائیم**:هەمیشە.**شین و زاری**:گریان و یۆیۆ،پرسە.**کارمە**:پیشەمە،شۆلی منە.

**باغەبان**:باغەوان،کەسێ بغ بە خێو دەکات بەخێو کردنی گول بێت، باغەوان. سینەکەت:مەبەست مەمکۆلانی یارە. **گەر**: ئەگەر. **بێ بدوورێ**: ببێ بە بەرگدروو،خەیات.**کـفــنەکەم**:ئەو جاوەی کە مرۆی پێ لەگۆی دەنێن .
**وەســـلەبومن**:بۆمن گەیشتنەبەیاری خۆم.**چونکە** :لە بەر ئەوەی. **خەیات**:کەســێکی کەجل وبەرگ دەدوورێت.**دەرگـــولزارمە**:لەزەنوێرمە.لە باغی گولانمە، یان لە دەرگای باغی گولانمە،دەر بە مانای دەرگارش هاتوە.
**یووحی**:گیانی.دەشـتی:نازناوی شـــاعیرە. گەر: ئەگەر.**فیدای**: قوربانی، پێشمەرگەی. **لەنجەت ببێ**: جۆرە نازێکی ژنانەیە،نازی بە سەر پەنجەت ببێ .
**یەنج**:هەول،زەحمەت کێشان لە،زەحمەت.**گەنجم**: دارایيم. **بۆتەیەنجم**: بووەتە خــەبات و تێکۆشانم، بۆتە زەحمەتم . **مەتلەعی**: یەکەمینی، ســەرچاوەی. **ئەفـکارمە**:بیرو باوەیمە.
**مانا بە گشتی**:

سیماو وێنەی یارە نازدار و گولنارەکەی من هەم یارو هەم دوژمنی منە،وا بۆ گۆنای ئەو یارە خۆشەویستەو نەشمیلەشم هەمیشە گیانی شیرینم لێ بووە بە نامۆو بێگانە،یووی وەک مانگی یارەکەی من کە وەرچەرخاو سویایەوە لەو کاتەدا زولفی یەش و درێژی یارەکەی من کەوتە سەر یووی وەک مانگیی و هەروەک هەور چۆن بەری مانگ و یۆژ دەگرێتن و دای دەپوشێ ئاواش پرچی درێژی گۆناکانی یووی وەک یۆژی یاری منی داپۆشی،هەر لەبەر هەندێشە کەوا من ئەسرینی هەردووک چاوانم بە لیشاو دێتە خوارەوە و ئاوا خەمبارو دل بە خەمم،دلی بێکەس و تەنیـایی من وا کەوتۆتە دەشت و بیابانی جیابوونەوەی یارە ئازیزەکەم و بۆیەکەوا بێ کەس و بێ دەر هەمیشە شین و زاری و یۆیۆمە،خۆ ئەگەربێت و باغەوانی سـینەکەی خۆت کفنەکەم بۆ بـدوویێتن و مەرگیشم وەدی بێتن ئەوا وەک ئەوە وامە کە بە تۆی خۆشەویستم گەیشـتبم و بەدیـداری تۆ شـــاد بووبم،چونکە ئەوکاتە دیارە کە باغەوانی سینەکەی تــۆ بەخۆی خەیاتی گولـــزاری منە و گیانی منی دەشـــتی ئەگەر قوربانی لەنجەی پـــی لە ناز و جوانی تۆ ببێتن ئەوســـاکە من بەختەوەرم و چونکە تۆ سەرچاوەی هەموو یەنج و گەنج وتێکۆشـــان و هەول و خەبات و بیرو باروەیێکی منی.

*

PDF 4 KURD

## زۆرنەترسێم

زۆرئەترسێم مـن بفەوتێم یارە کەم ڕەحمێ نەکـا
یائـەگەر مـردم بـەداوی زولفی کفنم لەف نــەکـا

من بە گریان ئەو بـەخەندە چۆن موناقاتی نـەبـێ
من ئەلێم جـانـا دەخالەت ئەوبەئـەبرۆ گەف دەکــا

دل سعاتی یـاری بێ مەیلەو سەرم سانی شــومـار
هەردەقیقەی نەوعـەزەخمێکم لە دل پــرسـەم دەکــا

من لەبـەر بازی دووچـاوی غوربەتم کرد ئیختــیـار
ئەو بەجەمهووری مـژەو تیغی بــرۆی جـەلبم دەکا

مـن کـەبـێ ڕەنـگم بەری قـەددی سـنەوداری ئەوم
ئەو لـەبـی باغی ئــیرەم مەنعی هە واداریم دەکا

وەک نـەیـی قەددی ئەوە نـالــەم لەبەر بـادی فیراق
بـۆیێ ئەو ڕەقــس و سەما دائیم لە گولزارا دەکــا

دەشــــــتیاخـاکت بـەسەر تا دل لە دوزەخ دابێ
یـارەکەی ئـاتەش پەرستت ئاوری رووگەش دەکـا

**مانای وشەکان**:

**زۆر**:پی،گەلێ ، فرە . **ئەترسێم**:ترسم هەیە.**من**: ئەز. **بفەوتێم**: بمرم،لە ناو بچم. **یارەکەم**: خۆشەویستەکەم .**یەحمێ نەکا**:بەزەیی پێما نێتەوە.دلۆڤان نەبێ.
**یائەگەرمردم**:یان بمرم.**بەداوی زولفی**:بە تای پرچی،بە داوی قژێ. **کفنم**:ئەو جاوەی کە مردووی پێ لە گۆی دەنێن.**لەف نەکا**:نەپیێچێ،نەی بەستتەوە.
**من بە گریان**: ئەز بە زاری کردن. **ئەوبە خەندە**:ئەو کە مەبەست یارە بە پێکەنین.**چۆن**:کو،چلۆن. **موناقاتی نەبێ**:دژبە یەکتری نەبێ،لە یەکتر جیاواز نەبێ دوور لەیەک نەبێ.
**من ئەلێم**:ئەزدەبێژم.**ئەودەلێ**:ئەو دەبێژێ .**جانا** :گیانا. **دەخالەت**: خۆ دەخیل کردن و پەنابردن .**ئەو**:دووەم شەخسە کە مەبەست یارەکەیەتی.**بە ئەبرۆ گەف دەکا**:ئەو بە ئەبرۆ هەیەشە دەکاتن.

PDF 4 KURD



**دل**:قەلب.**سعات**:کات ژمێر. **یار**:خۆشەویست. **بێ مەیل**:بێ لوتف،بێ زەوق.**سەرم**:یەئسم.**سانی ژمار**:چرکەژمێر.
**هەردەقیەیقە**:هەر.هەر خولەیەک ..**نەوعێ**: جۆرێ. **زەخمێکم**: برینێکم، زامێکم.
**لە دل**:لە قەلب. **پیسەم دەکا**:پی لە ژار دەکات.
**من کەبێ**: کەمن بەبێ.**یەنگم**:شێوەم ، وێنەم ، **بەری**:بێ بەش. **قەددی** :بەژن و بالای .**سنەوداری**: وەکو داری سنەوبەر بەرز. **ئەوم** :مەبەست یارە.
**لە بێی** : لێرە مەبەست مەمکۆلەی یارە کە بە بێی باغی بەهەشت تەشبیە کراوە.**باغی ئیرەم**:باغی بەهەشت.**مەنعی**: قەدەغەی. **هەوادارێم دەکا**:بەبێ گەیشتن بە شادی و خۆشی و ئەوینی ئەو بێبەم دەکاتن. **وەک**:بە وێنەی.**نەی**: قامیش، باریک . **قەددی ئەوە**:بەژن و بالای ئەوەکەزراوە.**نالەم**: هـاوارم. **لەبەربادی فیراق**:بەهۆی جیابوونەوەم لەتاوتن و لە حەژمەتان. **بۆیێ**:لەبەرهەندێ.**ئەو**: مەبەست یارەکەیەتی.**یەقس وسـەما**: شایی و هەلپەیکێ.**لە گولزارادەکا**:لە زەنوێر و باغی گولان دەکاتن .
**دەشتیا**:ئەی دەشتی .**خاکت بەسەر**:خول بە سەرتا.**تادل**:تاوەکو قەلب .**لە دۆزەخ**:لە ناو دۆزەخ دا بیێو ئاوا هەمیشە پی لە یەنج و ئازاران دابێت . **یارەکەی**:خۆشەویستەکەی. **ئاتەش پەرستت**:ئاگر پەرستت ،ئاور پەرستت.
**ئاوری یوو**:ئاگری یوو .**گەش دەکا**: دەگەشێێتەوە.
**مانا بە گشتی**:

زۆر دەترسێم کە یارەخۆشەویستەکەی من هیچ یەحمێک بە من نەکاتن، ئەوسا منیش لە تاوان نەمینێم و لە ناو بچم، وەیان کە مردیشم نەیێت و بەداوی زولفی خۆی کفنەکەی من نە پێچێتەوە، من بە گریان و شیوەن و زاری، ئەویش بە پێکەنین و خەندەوە چون لە یەک دوور نەبین و لێک جیا نەبین، من دەبێژم گیانەکەم و خۆمی دەخالەت دەکەم، ئەویش بە ئەبــرۆکانی هەر هەیەشەم لێ دەکاتن، دلی من وا بووەتە کات ژمێری یارە بێ مەیلەکەم و سەریشم بووەتە سانی ژمار، وا لە هەر خولەیەک و کاتێک دا کە بە سەر دەچێت و یادەبرێت یارەکەی من جۆرە زامێکی پی لە ژان و سۆم لە ناو دل و دەروونان دا هەلدەکەنێ و یەنج و ئازارانم دەداتن، من وا لە بەر جوانی دووچاوی وەک بازی ئەوە کەوا ژیانی دووری و نامۆییم هەلبژاردووەو کەوتومەتە غەریبیوە، ئەویش وا بەیێک و پێکی و مژۆلکی جوان و ئەبرۆکانی خۆیەوە یام دەکێشێت ودلم دەباتن، منێکی کە لە تاوان وەک بێیەکانی بەری بەژن و بالای بەرزو بلندی وەک سنەوداری ئەو یەنگ زەردم و ئەویش هەروا لە گەیشتن بە خۆشی و شادی ودووری لەباغی ئیرەمەوە قەدەغەم دەکاتن و لە عیشق و ئەوین و خۆشەویستیەوە بێ بەشم دەکاتن، وانالەی من لەتاو دووری و جیابوونەوەدا لە خۆشەویستەکەم وەکو بەژنی باریکی یارەکەم وایەو، هەر بۆیەشە کەوا ئەو هەمیشە لە بچ دلۆڤاتیەوە وا

PDF 4 KURD



لە زەنوێرو باغ و گولزاران دا شایی و سەیرانیەتی چونکە من ئاوام بەسەر هاتووە، ئەی دەشتی خۆل وەسەرتابێت ئەوەباش بزانە هەتاوەکو دلی تۆ لە ناو ئاووری دۆزەخ دا ببێتن و ئاوا لە ناو خەم و ئازاراندا بیت ئەوا خۆشەویستەکەی ئاگر پەرستت هەرئاگر گەشتر دەکاتەوە و هەر دەت سوتێنێتن .

*

PDF 4 KURD



## ژمارەی لیواکانی عیراق

ئەلمونتتەفـیکر، بـە سـرە وو عیمــارە و و دلــیـم
دیوانیـــیـە و کـەربـەلایە و حیللـەیـــە بیلــێم
بەغدادە لە ئەترافی کـوتــایـەو دیــالەیە
کەرکـوک و سـلیمـانیە و هەولــیرەکـــە من لێـم
تعـدادی لیوا، خایتمـــە موسـلە دەشتی
فـەرمـــوو وەرە بــۆ تەجـرەبەیە مـانع مەبە لـێـــم

**مانابە گشتی**

ئەم شیعرەی سەرەوەی دەشتی بریتیە لە ناوی تەواوی پارێزگاکانی وەلاتی عێراق کە لەو سەردەمانەی دەشتی ئەم شێعرەی نوسیوە بریتی بووە لە14 پارێزگا کە ئەم شارانەی خوارەوەن لە ناو هۆنراوەکە دا ناویان هاتووە .
1-مونتەفیکر 2-بەسیە 3-عیـــمارە 4-دلێم 5-دیوانیە 6-کەربەلا 7- حیلە 8-بەغدا 9 – کوت 10- دیالە 11-کەرکوک 12-سـلێمانی 13 -هەولێر 14 - موسل.ئەم چوارشارەکەی دوای بریتین لە شارەکانی کوردستانی ئازیزی باشوور ،کە ئەمانەن شاری هەولێری دیرین و شاری کەرکوکی زێیین و شاری سلیمانی دلگیر و شاری موسلی نەخشین .

PDF 4 KURD



## ژمە دەعوایی ویسال

ژمە دەعـوایێ ویسال و ژتە مەنعێ بە مەجـاز
سـەنەدێ مەنعێتـە باتیل بـوە ئیرۆ بـە مەجاز

کوو دەری سـەلتەنەتی کـرنەوە ئـەم پێ خەلعین
چ عەجەب حاجیبە ڕیزوانێتە مائیـل بە ییـاز

لەبی لەعلێـتە بە نەزمێــــمە دبەخشی ئەسەرێ
کو بـە ئوستادی غـەزەل دا خەبەری وەقتی نەمـاز

مە لەبەر بایـێ فراقێـتە ئەڤـین دامـە شـەیاب
ژتـەسەدعـالم عەلەوی نەلەمەوسم بەحجـاز

ژمـەنییــەت ژتـە هیممەت کو ڤەکـەی بابێ لیقـا
مەیێ دەشتی کوومە حوبین لە دەری عالی جەناب

**مانای وشەکان** :

**ژمە**:لە ئێمە،لە لایەن ئێمەوە.**دەعوا**:داوا.خەبەر هەوال. **ژتە**:لە تۆ، لە لایەن تۆوە . **مەنع**:قەدەغەکردن. **بە مەجاز**:بە یەوایی،بە روخسەت پێ دراوی.یان **بەمەجازی** واتە غەیرە حەقیقی نایاست.

**سەنەدێ**:ئەو شتەی کە باوەیی پێ بکەن،بەلگەی.**مەنعییەت**: قەدەغە کردن. **بۆیە**:لەبەر هەندێ . **باتیل** :ناهەق،نا یاست، بێهودە،پوچ .**ئێرۆ**:ئەمیۆ.**بە مەجاز**:روخسەت پێ دراو، بەیاست.

**کو**:کە،چۆن،چۆن.**دەر**:دەرگا.**سـەلتەنەت**:پادشــاهی،فەرمانیەوایی.**کرنەوە**:کردنەوە.**ئەم**:ئێمە.**پێ خەلعین**:دوورکەوتین، لە کارو کاسبی کردن،لە شوینی خۆ هەلکەنان.

**چ عەجەب**:چ سەیر، چما،لە بەرچی .**حاجبە**: پەردەیە، دەرگەوانە.(یان حاجیب بە مانای برۆیە)**ڕیزوان**: دلخۆشی، بەهەشت،دەرگەوانی بەهەشــت. **مائیل**:بەرەو،کەمێ خوارەوەبوو. **ریاز**:کۆی رەوزەیە لە زمانی عارەبی دا واتە: گولزار،زەنوێر.

**لەبی**:لێوی. **لەعلێتە**:لێوی تەشبیە بەو بەردە سوور و نەخشین و نرخدارە کردوە کە زۆر جوانەو لەسروشت پەیدا دەبێت، لەعلی تواوە واتە شەیابی یەنگ سوو . **بەنەزمێمە**:بە هۆنراوەی ئێمە،بەدلی ئێمە.**دەبەخشێ**: دەدات، دەهێنێ،کەیەم دەکات. **ئەسەرێ**:کار تێ دەکاتن.

PDF 4 KURD



**کو**:کە.چۆن،چلۆن. **بەئوستادیێ**:بەماموستاییێ.**غەزەل** : هۆنراوە، شیعر.
**داخەبەری**:هەوالی پێ دا،پێی گوت. **وەقتێ نەماز**:کاتی نوێژکردن.
**مەلەبەر**:ئێمەلەبەر.**بایێ فیراق**:بای جیابوونەوە. **ئەڤین**:ئەوین. **دامە**:بە ئێمەی دا.**شەیاب**:خواردنەوە.
**ژتە**:لەلایەن تۆوە. **سەد عالیمی عەلەوی**: سەد زانای مەزهەبی شیعەی عەلەوی.
**نە لە مەوسم**:نەک لە کاتی خۆی .
**ژمە**:لە لایەن ئێمەوە. **نییەت**:نیاز،قەسد. **ژتە**:لە لایەن تۆوە . **هیمەت**:نیاز ، ئیرادەی بە هێز.**کو**:کە،چۆن ،.**وەکەی**: بکەیتەوە،والا بکەیت.**بابێ**: دەرگای،دەروازەی. **نیاز**:ئارەزوو ، هیوا، ئاوات.ئومێد.
**مەیێ**:ئیمەی.**دەشتی** :ناز ناوی شاعیرە.**کو**:کە،چۆن .**مەحوبین**: لە ناو بچین.**لەدەری**:لە دەروازەی،لە دەرگای. **عالی جەناب**: گەورەوبەرێز ،هێژا

**مانا بە گشتی**:

من کە هیواو ئارەزوو و داوام ئەوەیە کە بە تۆ بگەم و تۆش ئەوەمان لێ قەدەغە دەکەیت و یوخسەتمان پێ نادەیت کە بە هیوای خۆمان بگەین،وا ئەمیۆکەش ئەو شتەی کە قەدەغەیەو جێی باوەییشمە و نەماوە و پوچ بووەتەوە و لە کار کەوتووە ، بۆیەکەشە کەوا ئیمیۆ یوخسەتی بە یەک گەیشتن دراوە و قەدەغەنیە،وا دەرگای گەورەیی وهێژایی کراوەتەوە کە وا ئێمە لە کارو کاسبی کەوتین ونەماین، زۆر سەیریشە کە شادی وخۆشی گەیشتن بە زەنوێری تۆ هەرئاوا گیراوەو پەردەی بەسەرا کێشراوە،(یان ئەبرۆکەچەکانی تۆ بونەتە دەرگەوانی یووی جوانی و لە باری وەک زەنوێری تۆیا) خۆ لێوە سورە جوانەکانی تۆ کار لە شیعرەکانمان دەکاتن و یەونەق بەهۆنراوەکانی دەروونی ئیمەوە دەبەخشێتن، کەوا لە کاتی نیایشدا هەوال بە ماموستای غەزەل و شیعریش دەداتن،خۆ وا بای دوور بوونەوە و جیا بوونەوەی تۆیە کە شەیابی ئەویندارى وخۆشەویستیمان بۆدێنێ و دلمان فێنک دەکاتەوە، جا ئەگەر سەد زانای مەزهەبی شیعەش فتوا بدەن و بلێن کەکاتی یوخسەتدانی گەیشتن بە تۆ حەرام کراوە و بییاری دووری لە یەکترمان دەر بکەن و بیدەن، ئەوساکە تۆ وەرە هیممەتت هەبێت و دەرگای خۆشی و بە یەک گەیشتن بکەوەو باوەیت بەو فتوایانە نەبێتن ، چونکەوا منی دەشتی لە دەروازەی گەورەیی و خۆسەویستی تۆوە ئەوەندە چاوەیوانم واخەریکە لە ناودەچم و ون و وێل دەبم.

*

PDF 4 KURD



## ســاقی وەرە

ســاقی وەرە یەک بادە شــەڕابــت بدە مــادەم
واجیب بە مەلەک وەسلی تۆبووەسـوجدەیی ئادەم

ئــەگریجەو و زولفی تــۆ وەکو لـە شــکری کــوردن
یەک تاجی وبیســـــــالت بـە بەریــتانیـە نــادەم

ســـــەد مەرگە لەهەر لەحزە کە فرمێسکی دوچاوم
جــاڕی بـەوەلــەنــدەن غەمی دل سا بەچــی لادەم

هیجــرانی من و ســــــــەیتەڕە و زولمی ڕەقیـبمە
لاسـلکیە بـۆ دەنـگی هــەلا و دەم بە هـــــەوا دەم

گــەر خــونچەیــی وەســلی تۆ سحەر بێتە تەبەسوم
بۆ ناوی شـــــــــیووعــیە لە سـواریـوە پـیادەم

هــەرکەس بـە بەرزی وەتـــــــەنی یـارانە نەنازێ
نــازی نیە جەژنــی ئەوە هەر شــەککـەر و بــادەم

قەددت عــەلــەمــی کــوردە لــە سـەر گـردە بنـاری
بۆ نـوسرەتی بارزانـە کـە دوژمـن بە فـــــــەنادەم

دەســــتووری دیموقــراتیـە شومشیری دوو ئەبرۆت
موستـەعمـەرە بــۆیــێ لــە جـەفــا کەوتە سەفادەم

ئـەی بــولبــولــی کــوردی وەرە نێــو باغی تەحەڕوی
نــالــەی تووە دەشـــــتی بـە هەموو دەم لــە نەوادەم

**مانای وشەکان** :

**ساقی**:مەیگێی.**وەرە**: وەرەبۆ ئێرە. **یەک**:دانەیەک.**بادەشەیاب**:: جامێک شەیاب.**بدە**:بم دەرێ،پێم بدە. **مادەم** : کەوایە، چونکە، لە بەرئەوەی کە.

PDF 4 KURD



**واجیب**:پیویست. **بەمەلەک**:بە فریشتەکان.**وەسلی تۆ**: گەیشتنی تۆ.**بووە سوجدە**:بووەتە کینوش بردن بۆ.**ئادەم**:باوکی مرۆڤ، هاوسەری حەوای دایکی مرۆڤ.

**ئەگریجە**:بسک ،موی بەسەر لاجانگدا.**زولفی تۆ**:پرچی تۆ،کەزی تۆ. **وەکو:لەشکری کوردن**: بە وێنەی سوپای کوردن،پەرش و بلاون .وەکوسەربازانی کوردبلاوە. بە وێنەی ئۆردووی کوردە.

**یەک**:دانەیەک. **تاج**:ئەو نیشانەیەیە کەوا پادشاهان لە سەری دەنین و گەورەیی و سەروەریەتی بۆ ئەوانەیە کەئەو تاجە لە سەر دەکەن. **ویسال**:گەیشتنن ،لێرە گەیشتن بە یاری خۆی کە ئازادی و سەربەستی و یزگاریە بە تاجی پاشایەتی و گەورەیی و سەروەری تەشبیەکردووە. **بەبەریتانیە**:بەوەلاتی ئینگلـیز،کەداگیرکەری بەریتانیای گەورەیە. **نادەم**:ناگۆیمەوە،ئەم شـیعرە لە سالانی داگیرکردنی کوردستانەوە گوتراوە.

**سەدمەرگە**:سەدمرن و نەمانە، **لە هەرلەحزە**:لەهەرسات وکات و چرکەیەکدا،لەهەر سانیەیەک دا.**کە فرمێسکی**:کەوا ئەسرینی. **دووچاوم**: هەردو دیدەکانم.

**جایی**:واتە پیو پاگەندەی،بانگی. **لەندەن**:نەبەست داگیرکەری ئینگلیزە کەلەندەن پایتەختی ئینگلیستانە.**سا بەچ لادەم**:جا بە چی وەلای بدەم.چۆنی وەلانێم و نەی هێلم.

**هیجرانی من**:دوری من لە یارو دۆستانی من.**سەیتەیە**:بەسەردا زال بوون، داگیرکردن. **زۆلم**:زۆرداری.**یەقیبم**:دوژمنم،نەیارم.

**لاسلکیە**:بێسیمە، ئەو ئامرازە ئەلەکترۆنیەیە کە لە دوورەوەیا پەیوەندی بە یەکەوە پێ دەکەن لە باس و خواس و نامەو نامەکاریدا یەکتر ئاگادار دەکەن و جفرەی نهێننیەکانیشی پێ دەنێرن.**بۆ دەنگی** : بۆ باسی،بۆ ئاوازی.**هەللاو**: هەراو هۆریا،یان. **هەلاو**:هەلۆ هەلۆ.**دەم**:کات،زار.**بە هەوادەم**: لەهەوادا بلاو کردنەوە و گەیاندن بە شوێنی مەبەست.**دەم**:زۆر بە زوویی ، لە عەینی کاتا،لە هەمان کاتا،لەوەختی خۆیدا.**گەر**:ئەگەر.**خونچەی**:گولی نە پشکوتووی. **وەسـلی تۆ**:گەیشتن بەتۆ.**سحەر**:بەیانی. **بێتەتەبەسم**:واتە بکرێتەوە وبزەی بێتێ ،وەدی بێتن.لێرە مەبەست ئازادی ویزگاربوونی گەلی کورد و سەربەخۆیی کوردستانە لە دەست داگیرکەران دا.

**بۆناوی**:لە پێـناوی.**ناوی شیوعی**: وەدەرکەوتن،بلاوبونەوە.**لە سواریوە**:لە سـواربوونەوە. **پیادەم**:دەبم بە پیادە.واتە سوپاسگوزارم و شاد و خەندانم.

**هەرکەس**:هەرکێ.**کەبەبەرزی**:کەوا بە گەورەیی و هێژایی . **وەتەنی**: نیشتمانی ،واری خۆی. **نەنازێ**:ناز نەکات و شانازی بە نیشتمانپەروەری وخاکی خۆی نەکاتن.**نازی نیە**:ئەو کەسەبێ نازە،واتە هیچ و پووچ و ناکەسە،بێ سودە.**جەژنی**

PDF 4 KURD

## موژدە ئەی دل

موژدە ئـەی دل بـارەگاهی میسـرێ شـادی هاتەوە
یوسـیفی کەنـعان بەنـاز و لەنجـەبـازی هــاتەوە

لەشــکری زستانی فـیرقــەت پـەنجــەبازی پێ نــەما
چونکە تابوری بە هـاران وەسـلی یاران هــاتەوە

سەیری سەرگردان بکەن چۆن زەردوشین وسەوزەچـی
بەم کـولـوک و نەرگـس و بەیبـــونەو و گولنارەوە

نالەنـالی بـولبــولان و هەم کەنــاچـەو تــوتــیان
هەم زرینـگـەی تۆق و کەمبەر دێ لەنێو باغــاتەوە

ســاقیی وموتــریب لەگـەل جەمعی مەلەک واچونە دەر
پـەردە دەدیێنـن دەلــین فەســلی ســییاحەت هـاتەوە

دەشــتییا ئیمڕۆکە یــارت وا لەڕێگــەی دەشــتەوە
تەققــەیی ســۆلی بەسەر چاوی غــەریبــان هاتەوە

**مانای وشەکان**:

**موژدە**:هەوالی دلخۆشی،مزگێنی .**ئەی دل**:ئەی قەلب،ئەی یار. **بارەگاه**:کاخ و دەربار،بنکەی گەورەکان و پادشایان کە خەلکی لێ دەبینن **میسر**:وەلاتی میسر .لێرە تەشبیهە **شادی**:خۆشی. **هاتەوە**: دوبارە بۆوە.

**یوسفی کەنعان**:مەبەست بەهارە کە بە جوانی حەزرەتی یوسف تەشبیە کراوە.**ناز**:کریشمە. **لەنجەبازی** :جۆرە یۆیشتنێکەو هەلپەیینێکە. هاتەوە. گەیایەوە.

**لەشکر**:سوپا.**زستان**:وەرزی ساردی سال.**فیرقەت**:دووری،جیا بوونەوە.**پەنجەبازی**:زستان نەماوبەهار هات .**پێ نەما** : وەسەرچوو و یۆیی،سەرماو سۆلی لە ناو چوو.

**چونکە**:لەبەرئەوەی. **تابور**:لەشکر،سوپا .**وەسل**:گەیشتن بەیەک.

**یاران**:خۆشەویستان. **هاتەوە**: گەیایەوە،گەیشتەوە .

PDF 4 KURD



**سەیری**:بنوایە.سەرگردان **بکەن**:بالای تەپۆلکان بنواین ،بالای بلندایيان بنواین. شوێنی بەرز بنواین.**چۆن**:**چلۆن**،کو.**زەرد**:یەنگی زەرد. **شین**:یەنگی شین.**سەوز**:یەنگی کەسک.

**بەم کلوک**:کلوک جۆرە گولێکی جوان و یەنگینەبە یەنگی سۆرو سەوز و سپی لە بەهاراندا لە دەشت و چۆل وئاقاران و ناو دەغرو دان زەنوێرانی کوردستان زۆر شین دەبێت و تەمەنێکی کورتیشی هەیە.**نەرگس**:ئەمەش ناوی گولێکی زۆر بۆن خۆشە. **بەیبونە**:ئەوەش هەر ناوی گولێکە کەلە لەدەشتی هەولێر زۆرە.گولنار ئەمەش هەر ناوی گولە.

**نالەنال**:هاواروفیغان،ئاوازو سەدا.**بولبولان**:هەزاران،باڵندەی ئاشقی گول.**هەم**:هەروەها.-**کەناچ**:ناوی باڵندەیەکە. **توتییان**: ئەمەش هەر باڵندەیەکی جوانە.

**هەم**:هەروەها.**زرینگە**:دەنگی .**تۆق وکەمبەر**:خشلی ژنانەیە لە زێیوزیو دروست دەکرێت.**دێ**:،دەهێ.وەدی دێ.**لە ناو باغاتەوە**: بە ناو باغەکانەوە.

**ساقی**:مەیگێی.**موتریب**:موزیک ژەن،گۆرانی بێژ.**لەگەل**:بەیەکەوە.

**جەمعی**:کۆمەلی. **مەلەک**: فریشتەکان.**واچونەدەر**:وابۆدەرودەشت و ئاقار چوون و وەدەرکەوتن.

**پەردە دەدیێنن**:مەبەست ئەوەیە کە بە هاتنی بەهار پەردەی سەرماو سۆلی زستان لە ناودەچێت وسەیرو سەما دەست پێ دەکاتن.

**دەلێن**:دەبێژن.**فەسلی**:وەرزی،کەژی.سیاحەت **هاتەوە**: مەبەست وەرزی بەهارەگەیایەوە،دیسان وا بەهار هاتەوە.

**دەشتیا**:مەبەست خودی شاعیرخۆیەتی کە دەشتی ناز ناویەتی واتە ئەی دەشتی.**ئیمیۆکە**:ئیرۆکە. **یارت**:خۆشەویستت.وا **لەیێگە**:وا لەیێی دەشتەوە **تەقەیی**:دەنگی،ئاوازی. **سۆلی**:کەوشی. **بەسەر**: بەبالای. **چاوی**: دیدەی. **غەریبان**:نامۆیان.**هاتەوە**: گەیایەوە. لیرەش یار هەر مەبەست لە وەرزی بەهاری یەنگینە.

---

**مانا بەگشتی**

ئەی دل مزگێنیت لێ بێت وا بەهاری یەنگین و نەخشین هاتەوە و وەک یوسفی کەنعانە کە بەشادی و خۆشی و زۆر بەنازو لەنجەبازی گەیایەوە(لێرەدا بەهار بەیوسف پەیامبەر تەشبیەکراوە و مەبەست هاتنەوەی وەرزی بەهاری یەنگین و جوانەکە دیسان هاتەوە دەرو دەشتی کوردستانی یەنگینتر کردوە) والەشکری ساردو سیی زستان لە ناو چوو و ئیتر دووری لە یەکتر وجیابوونەوەونامۆیی نەماو وەرزی خۆشی وبەزم و سەیران وادیسان هاتەوە،دەبنواین وا ئەم دەرو دەشتەی وەلاتی من چەندەیازاوە و جوانن و

PDF 4 KURD



شیرینن و چۆن بەرگی سەوزی بەھاریان لە بەر کردووە،سەیری سەر گردو زورگ و تەلان و تەلاران و بلندایيەکان بکەن کەوا چەندە نەشمیلە و یەنگینن و دل فێنن وا ھەمووشوێنێ بەیەنگی کلوک وبەیبون و نەرگس و گولی گولنارەوە زەردو شین و سوورو سەوز دەچێتەوە، وا نالەو ھاواری بلبولانی ئاشقی گولان و دەنگ و ئاوازی کەناچەو تۆتیانیش لە گەل زرینگەو خشەی تۆق و کەمەرە بەتەواوی وا تێکەلاوە و لە ناو باغ و گولزارانی نیشتمانی دلگیرەوە دیسانەکەھاتەوە،وا ساقیی و گۆرانی بێژان و مۆزێکاران بە یەکەوە لەگەل کۆمەلی فریشتەکان چوونە دەرەوە و پەردەی سەرماو سۆلی زستان دەدیێن و ھاواریانە و دەلێن موژدەبێت وا وەرزی بەزم وسەیران و شادی و خۆشی بەھاران گەیایەوە، دەسـا ئەی دەشـتی موژدەبێت لە تۆ وا یارە خۆشەویستەکەی تۆبەھاری جوان و یەنگینی تۆ لە یێگەی دەشت و چۆلانەوە ھاتەوە و تەققەیی کەوشی بە سەر چاوی غەریبان و نامۆیان دا ھێنایەوەو بە ھاتنەوەی یارەکەی تۆ تەواوی خۆشی وشادی گەیایەوەو پەردەی خەم و پەژارەو ئازاران وا بیایەوەو نەما.

*

PDF 4 KURD



نەسیمی دەوری پولزارم

سـلام اللــه منــا یا خـلیـل القـلـب آنـات
علـیکــم مــا اری فیها منــایـات میانــات

لـەخەتتی جسمی چۆنیتا دەڵێن حـەمدەن کـەپڕهـاتی
بەغەیـرەزنوقتەی خەتتی غەم دەڵێن شوکرەن لەتۆقاتی

نـەسیمی دەوری گولـزارم بەبـاغی دل گــوشــادی دا
کەسیمە تــەوری گـولنـارم نەمــا ئـەسـلەن چ ئـافــاتی

سـەبـایــی دووسەرەی ئێـوەم بــەشــیرە بـۆیـێ بـیرا هەن
لە بیراهەن بە پێراهەن دەکـەن دەفــعی مــونــاجاتــی

کە فەرهادی قەلەم نـەقشی بەحالی شیرنت بـەخشــی
ریسالـەیی بێستوون نەخشــی نـەدی بۆ ڕێـی مـولاقـاتی

بەتەنیایی چەپلە یەک دەستەگەرچی دەنـگی نیێ ئـەمما
بەتــەنیاچۆپ لـەسـەرچـۆپـی عـەجەب بەنگینەداواتی

لەسەرتەختی مناکورسی مەحەببەت هەلکەنێ هەرکەس
بەسـەر بــەخـتی منا سـەد دەفـعـە نـاکاکشـتی ساواتی

فەلـەک بــێ دارە بـێ بــەرمـا وەکـو پرسـینی ئەحوالت
مەلـەک بێدارە بـێ ســەرما لـە بـێ ڕەحمی وعەداواتی

ئەزانــی بــۆ منی دەشتی بە پــرسیــنت شـەهــم وافی
لعـلی ابلـغ الاسباب اسـباب السماوات

**مانای وشەکان** :

نەسیم: سروە.دەر: ئەتراف،هەرچوارلا.گولزار: باغێ گولان،زەنوێر.**سەلام**: هەوال پرسین ،ئاشتی.**منا**: لای ئێمەوە،لەلای ئێمەوە.**یا**: وشەی نیدایە لە زمانی عارەبی دا واتە ئەی.**خەلیل**: دۆستی دلۆڤان و یەک دل،دۆستی یاست و تایبەت،هەروەها ناوی ماموستا مەلا خەلیلە کە لەو سەردەمانەدا لەقەبی شیعری وافی بووە کەخزمی

PDF 4 KURD



دەشتیەو شاعیرێکی گەورەو زانایەکی بلیمەت بووە و پاشان(وافی ئەم نازناوەی بە موخلیس گۆڕیوە) و دەشتی ئەم نامەیەی بۆ ئەو نەمرە نوسیوەلەوکاتەدا کە ماموەستای هێژاو بەڕێز ماموستامەلاخەلیل مەلای ئاوایی گوندی دووسەرە دەبێت و هەندێ گیر و گرفتی لە بارەی خێزانیەوە توش دەبێت و سەرەنجام بە لەیەک جیا بوونەوە لە گەل خێزانەکەی کۆتایی دێت .

خەلیل ناوی ماموەستا وافیە **ئەلقەلب**:دل.**ئانات**:هەمیشە،هەموو کات **عەلەیکوم**: لەسەر ئێوە.**مائەرا**: لەوە زیاتر نابینم ئەوەی کەدەیبینم.**فیها**:تیادا.**مەنایات**:نێوان خۆشییەکی یاست و درۆست. **میانات**:بەمیم ژێرمی بە مەنای ناوەند و میانە یۆیی دێتن،بە مانای خۆ دوور خستنەوە لەزۆرو بێتامی هەرکارو قسەیەک ئەنجام دان.

**لە خەتی**:لە بەشی،لە خەتی،دەربارەی:واتە لە هێلی،لەبارەی.

**جسم**:جەستە،تەن،لەش.**دەلێن**:دەبێژن،وادەلێن.**حەمدەن**: سوپاس و شوکرانە.**کەپی هاتی**:کە هەبووی و گوزەرانت باشە.

**بەغەیرەز**:جگەلە.**نوقتەیی خەتی خەم**:کەمێ پەژارەداری،ئەو گیرو گرفتەی کە هاتوتە پێش ،مەبەستی گیرو گرفتی خێزانەکەیەتی گوایە دوای سالەها وافی زانیویەتی کە لە گەل خێزانەکەی لە مندالیوە شیریان بە یەکەوە خواردووەو واتە وەک خوشک و برا وان ،ئەمەش لە ئیسلامەتی دا هەرکچ و کوپێک کە بەیەکەوە لە مەمکی دایکێکەوە شیریان خواردبێ دەبنە خوشک و برا و مارەییان لێک نایێت ، ئەویش وەک مەلایەک و سۆفیەکی دیندار خۆی بە گوناهبار زانیوەلەو بارەوە،بۆیەکە لە گەل خێزانەکەی کە خزمی خۆی دوبێت لە دوای بوونی چەند مندالێک لەو ژنە بۆ هەمیشە لێک جیا،دەشتی مەبەستی ئەو نوقتە خەمەیە.**دەلێن**: دەبێژن وائێژن.**شوکرەن**:سوپاس بۆ خودا.**لە تۆ قاتی**:تۆ نیتە،دووری لێی.

**نەسیم**:سروە.دەور ئەتراف.**گولزار**:زەنوێر،باغی گولان.**دل**: قەلب. **گوشادیدا**: شادمانی دا،خۆشحال بووم.

**کەسیمە**:عادەتە،شتێکی روشتیە.**تەور**:حال،چۆنیەتی،چلۆنی. **گولنارم**:ناوی گولێکە **نەما**:لە ناو چوو.**ئەسلەن**:بە یاستی. **چ ئافاتی**:هیچ گیرو گرفتێ.

**سەبایی**:نەسیمی،شـنەی،سروەی.**دووسـەرە**:ناوی گوندێکی خنجیلانەیە لە دەشتی دزەییاتی کە ماموستا مەلا خەلیل لەو کاتەدا لەوێ مەلای ئەو ئاواییە بووە.**ئێوەم**:ئەنگۆم،مەبەست ماموستا مەلا خەلیلە.**بەشیر**:هەوال بەر.**بۆیێ**:لەبەرهەندێ.**بیرا هەن**:لە یادان.

**لەبێ یاهن**:لەبێ یێگەییە، لە بێ چارەییە .**بە پی راهەن**:بەکراس (لێرە وابزانم تەشبیە بەکراسەکەی حەزرەتی یوسفە کە برایانی یوسف پەیامبەر گەیانەوە بە نیشاندانی کراسەکەی حەزرەتی یوسف ویستیان یاقوب پەیامبەر دلنیا بکەن کە گورگ خواردویەتی.)واتە منیش هیچ چارەیەکم نیە لەوە زیاتر کە بەم نامەو ئەم

شیعرە هەوالتبپرسم . **دەکەن**: ئەنجام دەدەن.**دەفعی**:لە بەین دەبەن. **موناجاتی**: پایانەوەی.

**کە فەرهادی**:لێرە قەلەم بە فەرهاد تەشبیە کراوە:**قەلەم**:پێنوس. **نەقشی**:نەخشی بەحالی، بەشێوەی.**شیرینت**: جوانت. **بەخشی**: کەیەمی کرد.**پیسالەی**: نامەی.بێستون:کێوی بێستون کە فەرهاد بۆ شیرینی کۆلی.(چخشی):نەقشی نەدی،نەیبوو.بۆیێی **یان چ خۆشی**:کە بە ئاوات نەگەیشت و خۆشی نەدی.(ئەم وشەیە وەک خۆی نوسراوەتەوە،بەداخەوە دوای هەول دانێکی زۆر ئەم وشەیەم بە تەواوی بۆ ساغ نەبۆوە.**مولاقاتی**:بۆ پێگەی گەیشتن بە شیرینی.

**بەتەنیا**:بە یەکتایی . **چەپلە**:دەست لێک دان.**دەنگی**:سەدای، ئاوازی. **نیٚ**:نەیەت.**ئەمما**:بەلام.

بە تەنیا بە یەکتایی .**چۆپ**:سەرچۆپ گر،ئەوەی سەر چۆپی دەگرێت لە شایی و گۆوەندان دا واتە بە تەنیٚ شایی گەرم دەکات ودەتوانیٚ سەرچۆپی بکێشیٚ **چۆپی**:ناوی جۆرە شاییەکە ،بە یەکەم کەسیٚ کە سەرچۆپی شایی دەگرێت و یای دەگرێت و یاخود دەیوات دەیسوپێنێت دەلێن.**عەجەب**: زۆر سەیر. **بەنگینە**: سەرخۆشە، لێرە مەبەست گەرم و گویە،واتە بە تەنیا کەسێک دەتوانیٚ سەر چۆپی بگرێت و شایی گەرم بکات و یای بگرێت. **داوەت**:هەلپەیکیٚ و شایی کردن،گۆوەند.

**لەسەر**:لە بالای.**تەختی**:کورسی.**منا**:هی من.**کورسی**:تەخت. **مەحەببەت**: خۆشەویستی. **هەلکەنیٚ**:لابەریٚ ،لە ناو ببات،لای بدات.**هەرکەس**:هەرکیٚ.

**بەسەربەختی**:لە سەرشانسی .منا من دا.**سەددەفعە**:سەدجار کار بکاتن.**ناکا**:نای کات.**کشتی ساواتی**:واتە بە مەبەست ناگات. **کشت**: بەرهەم.**ساو**:باج

**فەلەک**:گەردوون.**بیٚ داره**:بەبیٚ دارە،واتە یووتە .**بیٚ بەرما**:بیٚ بەروبووم مایەوە.**وەکو**:بەوێنەی.**پرسینی**:هەوالپرسینی.**ئەحوالت**: گوزەرانت،شێوەت.

**مەلەک**:فریشتە **بێدارە**:واگایە،هوشیارە **بیٚ سەرما**:بەبیٚ کەسمایەوە بیٚ سەرو شوین بوو. **لەبیٚ یەحمی**:لە بیٚ بەزەیی.**عەداواتی**: دوژمنایەتی.

**ئەزانی**:تۆ دەزانی.**بۆمنی دەشتی**:لەلای منی کە دەشتیمە.**بە پرسینت**:بە هەوال پرسنت. **شەهم وافی** : کەنازناوت وافیە،ئەی وافی.مەبەست هێژا ماموستا مەلا خەلیل دوسەرەیەییە.

**لعلی**:مەگەر،لەوانەیە،خۆزیائەبلغە:یادەگەینم.**ئەلئەسبابە**: هۆیەکانی. **ئەسبابەل سەماواتی**: هۆیەکانی ئاسمانان،هۆی زۆر،واتە بە گەلیٚ هۆیەکانەوە

**مانا بە گشتی**:

PDF 4 KURD



سلاوی خوای مەزن و هەوال پرسینمان بۆ ئێوەی خۆشەویست ، ئەی دۆستی هەمیشەیی ویاست و دلپاک تەنیا ئاواتی من دوستایەتی و خزمایەتیە و لەوە زیاترلە ئێوە شتێکی تر چاوەیێ ناکەم

لە بارەی چۆنیەتیتانەوە سوپاس بۆ یەزپانی مەزن دەلێن کەتۆ باشی و گوزەرانتان خراپ نیە جگەلەو خەمەی کەهاتووتە پێشەوە، ئەوا دوورن لە هەموو ناخۆشیەکی تر (لێرە مەبەست گیرو گرفتیەکەی ماموەسا مەلا خەلیلە کە لە گەل خێزانی دایکی مندالەکانیەوە هاتووتە پێش و پاشانیش لێک جیا بووینەتەوە ئەمەش گوایە ماموستا مەلا خەلیل لە دوای چەند سالاندا ئەوجا زانیویەتی کە لە گەل خێزانەکەی کە خزمی خۆی لە مندالیوە شیریان بە یەکەوە خواردووە واتە وەک خوشک و برا بووینە ئەمەش لە ئیسلام دا شتێکی حەرامە و مارەیی کوی و کچان لێک نایەت بۆیەکە لێکتر جیا بووینەتەوە) سروەی دەور و بەری گولزاری من شادی خستە ناو دل و دەروونی منەوەو شادمانی کردم کە یۆژگارانی خۆشەویستی من هیچ گیرو گرفت و ناخۆشیەکی نەما،وا شنەی گوندی دووسەرەی ئێوەم دێتەوە یادو و بە ناچاریوەیە هەرکە قەلەم وەکو فەرهادی ئاشق نەخشی یووی یاری خۆی کە شیرینە بەخشی و هاتەوە یاد، هیچ چارەیەکی نەبوو بۆ چاو پێکەوتن و گەیشتن بەیەکەوە ،خۆ ئەگەر بەدەستێکیش چەپلە دەنگی نێت و لێ نەدرێت ئەوا بە تەنیا چۆپی لە شاییدا گۆوەند گەرم دەکات وسەرچۆپی شایی یا دەگریت و دەیکێشێ، خۆ هەرکەسێ لە سەر تەختی خۆشەویستی منداو لە نێوان ئێمەدا ناخۆشی وەدی بێنێ و هەرگیز بە ئاوات ناگات و چی بۆ ناکرێتن. وا گەردوونیش بە هۆی بێ یەحمی و لە یەکتر نەپرسینەوە بێ بەر ماوەتەوەو فریشتەکانیش هەروا هوشیارن،بەلام لە بێ بەزەی و دوژمنایەتی کردن وا بێ یێگەو سەر سام ماونەتەوە،ئایا دەزانی کەوا منی دەشتی بۆچی تۆم هاتەوە بیر و یادت دەکەمەوە؟ چونکەلەوبارەوە گەلێ هۆ هەن.

دەشتی لە سەرەوەی ئەم شیعرە دا ئەمەی نوسیوەو دەلیت:

(بۆ برای عەزیز و خۆشەویستم جەنابی مەلا خەلیل ئیمامی گوندی دووسەرە.)

دەشتی و بەیێز و هێژاو نەمر موخلس خزمایەتیەکی نەزیکیان لە گەل یەک دا هەبووە من زۆرم لە خزمەت ماموەستا مەلا خەلیل لە گوندی دووسەرە خوێندووە لە بەر ئەوەی کە لە گەل باوکم خزمایەیتیان هەبوو زۆری یێز لە من دەنا،من کە لە حوجرە بووم هەمیشە کە خواردنێکی خۆشیان لە مالەوە لێ نابا منی بانگ دەکردو لە گەل خۆی دیبردمە مالەوەو گەلێ نیوەیۆیان لەوێ نانم دەخوارد و لە خزمەتی دەبووم، هەردەم ئامۆژگاری باشی دەکردم و زۆری خۆش دەویستم و دەیفەرموو دەبێ زۆر هەول بدەیت و تێ بکۆشی بۆ خوێندن و تۆش وەک باوکت ببی بە مەلاو تا وەکو لە ژیانت سەرکەوتوو ببی و هەول و خەبات سەرچاوەی بەختەوەری مرۆڤە، هەر پێویستیەکی هەشت بێت من یارمەتیت دەدەم،ئێمە هەمومان بە

PDF 4 KURD

ماموستا مەلا خەلیلمان دەگوت(خارەمەلا خەلیل)واتە خالە و زۆرمان خۆش دەویست و ئەویش لە دوای وەفاتی دەشتی زۆری یارمەتی من داوەو لە سەردەمی فەقێیاتیم،ماموەستایەکی زاناو بلیمەت و دلسۆز بوو

*

PDF 4 KURD



**روس و جەرمەن**:

منی پڕ فیتنە هەردەم ئـاتـەشـی فیـرقـەت لە چاوم دێ
بە هیجرانت هەموو دەم بـۆی کـەبـابـی نـاو هەناوم دێ

شـــەرابـی وەسلی تـۆ یـەک قـەتـرەدڵ گەربـێ نەسیبی بێ
چ مـەجبـوورم لـەگـەڵ سـاقی لـە نێو مەیخانـە ناوم دێ

بـەعـەتـرستـانـــی دەرگەی جـــەننەتـــولمەئـوا نەما بڕوا
لە جەرگـی لەتـلەتم بـۆیێ کەفی خوێن و خـــوناوم دێ

بەڕوی ئەلماس وقوببەی ژێرکراس وسوخمەکەی سوورت
هەدەفبازن بە رووحی مـــن لـــە دڵ بـۆیـێ زوخاوم دێ

لـە ڕۆژی جـەژنـــی قـوربـــانـا بە قوربانی کەســێکم من
کـەعـەکسـی نووری دیدەی ئەو لە چـاوی پڕقـــوڕاوم دێ

لەحەربی یووس وجەرمەن باسی غازوقونبـولەی زەڕین
لـە نێـو تەییارە بـێ سائێـــق بـــەرەو مـالی ڕمـــاوم دێ

تەلـــەفیزیـونی ڕوویی تـــۆ مەحەتەی دوورە لێـم ئـــەمما
بە لاسـلـکت منی دەشـتی گڕەی تـــەنـــدووری تـــاوم دێ

**مانای وشەکان** :

**من**:ئەز.**فیتنە**:ئاشوب،دەردو بەلا. شەی. **هەردەم**:هەمیشە. **ئاتەش**:ئاگر،ئاور. **فیرقەت**: جیابوونەوە،دووری.غەوارەیی،نامۆیی.لە **چاوم دێ**:لە دیدەم دێ. بە **هیجرانت**:بە کۆچ کردنت،بە یۆیشتنت. **هەموودەم**: هەمیشە. **بۆیی**:بۆنی.**کەبابی**:برژاوی،سوتانی،بەئاگر سووربووەوە. **ناوهەناوم**: دەروون ،ناو جەرگ و هەناو،لای ژوورەوەی دەروونەوە.**دێ**:دێتن.
**شەیابی**:خواردنەوەی.**وەسلی تۆ**:گە یشتن بە تۆ.**یەک**: دانەیەک. **قەترە**:دلۆپ.**دل** : قەلب.**گەر**: ئەگەر **نەسیبێ**:بێ بەشی،پێی ببێ.
**چ مەجبوورم**:چ پێویستییکم هەیە.**لەگەل**:بەیەکەوە لە گەل **ساقی**:مەیگێیدا.**لە نێومەیخانە**:لە شوینی خواردنەوە.**ناوم دێ**:باسم دەکرێت و ناوم دێنن.

PDF 4 KURD



**بەعەترستانی**:بەبۆنستانی،شوێنی بۆندار ،بۆن خۆش. **دەرگەیی**: دەروازەی **جەننەتولمەئوا**:بەهەشتی شوێنی هەمیشەیی. **نەمابیوا**: باوەیم نەما.
**لەجەرگی**:لە جگەری.**لەت لەتم**:پارەپارەم.**بۆیێ**:لە بەر هەندێ. **کەفی خوێن و خوناومدێ**: و:کەفی خوێناویم دێتەخوارەوە:
**بە یوویی**:بە روخساری.بە گۆنای.**ئەلماس**:یووی یار بە ئەلماس تەشبیە کراوە.
**قووببەیی**:**مەبەست** جوتە مەمکۆلانی یارە.**ژێر کراس**:لە بن کراس سوخمەکەی:بەو جلکە دەلێن کە هی ژنانەو لە سەرشانانەوە تا ناوقەد درێژە و یەلەگیشی پێ دەلێن زێی و زیویشی پێوە دەکەن.**سورت**:یەنگی سور **هەددەفبازن**:ئامانج دەپێکن.بە **یوحی من**:بەگیانی من.**لە دل**:لە ناو قەلب.بۆیێ:لە بەر هەندێ. **زوخاوم دێ**:خوێنم لە بەردەیوات و نالەم دێ.
**لەیۆژی**:لە کاتی **جەژنی قوربانا**:جەژنی قوربانی دان.بە قوربانی **کەسێکم**:من قوربانی ئەو کەسەم.
**کەعەکسی**:کەوێنەی،کەسیمای.**نووری**:یوناکی.**دیدەی ئەو**:چاوی ئەو لە **چاوی**:لە دیدەی.**پیقویاوم**:لەچاوی قویاویم.**دێت**: دەهێ، دێتە خوارەوە.**لەحەربی**:لە شەیی.لەجەنگی **یوس** : یووسەکان خەلکی یوسیا.**جەیمەن**: ئەلمانەکان، خەلکی ئەلمانیا. **باسی**:هەوالی.**غاز و** :گازی کیمیایی,**قونبولەی زەیین**:ئەتۆم.
**لە نێو**:لە ناو **تەیارە**:فیۆکە.**بێ سائێق**:بەبێ شوفێر،بەبێ خەلەبان. **بەرە و**:بۆلای.مالی یماومدێ:بەرەو مالە وێران و خاپوورکراوەکەم دێ.
**تەلەفیزیۆن**:سیما.**مەحەتتەی**:ئێیستگەی وێنەدار.**دووره**: لێمەوە دووره **ئەمما**:بەلام.
**بە لاسلکت**:بە بێسیمت بە هەوالی لاسلکیەوە .**منی دەشتی**:ئەمنی کە دەشتیمە.**گیەی تەندووری**:گەرم و گویی وەک تەنوور.**تاوم**: خۆرەتاوم ،هێزم.
**دێ**:دەهێ.

---

**مانا بە پشتی**.:

منی پی لەژیانی سەختی و ئاشوب و بەلادا وا هەمیشە ئاگری جیابوونەوەو دووریم لە چاوان دیارە و دێتە خوارەوە و هەردەم گیم تێ بەردەداتن،بە هۆی جیابوونەوە و کۆچ کردنی تۆوە وا هەردەم هەناوم بۆنی سوتان و برژانی لێوە دێتن،خۆ ئەگەرتەنیا دلۆپێکیش لە خواردنەوەی شادی وگەیشتن بەتۆی ئازیزم ببێتە بەش ئەوا بەسمەو دلم پی لە خۆشی دەبێتن و ئەوکاتەش هیچ ناچار نیم و خەمێکم نیەکەوابچمە مەیگەدەو لە گەل ساقی مەیگێیدا لەناو مەیخانەدا ناوم بێتن،خۆ ئێستاکە هیچ باوەیێکم بە بۆنی خۆشی بەهەشتی هەمیشەیی نەماوە و هەر بۆیەشە کەوا لە ناو جەرگی لەتلەتی من دا کەفاوی خوێناویم دێتن و تا بلێی نا ئارام و ناشادم وابە یوخساری جوان و لە باری سپی وەک ئەلماس و دوو

PDF 4 KURD



مەمکۆلەی ژێر کراس وسوخمەکەی سووری سەر سینەی تۆیە کەگیانمی کردۆتە ئامانجی خۆی و هەربۆیەشە کەوا لە ناو دل و هەناوم دا خوینی سورم لێ دێتن و دەیژێتن،من لە یۆژی جەژنی قوربانی دا بە قوربانی ئەو کەسەم کەوێنەی پی لە یۆناکی ئەوا هەمیشە لە ناو دیدەی قویاوی و شێلومەوە دیارە،خۆلە جەنگی یوسیا و ئەلمانیشدا باس باسی گازی کیمیای و بۆمبی ئەتۆمە و ئەویش وا لە ناو فیۆکەدا بەبێ سایەق بەرەو مالە یوخاو و یمێندراوەکەی من دێتن،سیمای یوویی تۆ هەرچەندە کەلە منەوە دوورە بەلام منی دەشتی وا بە هۆی ئەوەی کە هەمیشە دلم لەلای تۆوەیەو وا بە خەیالەوە لە هەواوە بە هۆی بێسیمەوەیە وا هەوالت دەزانم و هەر لە بەر هەندێشە کەوا هەناوم دەسوتێت و وا لە تاوان گیەی تەندووری ناو دەروون و هەناوم دێتن و وا گیم تێبەربووە.

*

PDF 4 KURD

**نەدەی وەعدە**

نەدەی وەعدەیێ گـەر داشت و نەی کەی گەلێ عەیبـە
ئەگەر نا بۆچی وەعدەی دووحەبی کــوردی دەدەی ڤگبە

لە سەر دەشـــتی نـەزەر بێ هەر کەسێ شـعرم بزانیــتن
نەساغیش بم بە دەعـوەت بێمە بەر گەر نـــا دەبێ قەلبــە

**مانای وشەکان**:

**نەدەی وەعدە**:پەیمان مەدە.**گەر**: ئەگەر.**داشت**: دات،وادەت دا.**نەی کەی**:ئەنجامی نەدەی،بە جێت نەهینا.**گەلێ عەیبە**:واتە زۆر شەرمە .**ئەگەرنا**:ئەگەروا نەبێ.**بۆچی**: لەبەرچی. **وەعدەی**: پەیمانی.**دووحەبی**:دوو قورس.**کوردی دەدەی**:هی کوردانە دەدەی. ڤگبە:لەوانەیە،بنەبی،ئێگجاری .
لەسەر دەشتی:دەشت لەسەریا بێت.نەزەربێ:لە عۆدە دابێت، پەیمان بێت.هەرکەسێ:هەرکێ.شیعرم: هۆنراوەم. بزانێتن:بزانێ.
نەساغیشبم:نەخۆشیشبم.بەدەعوەت:بەداوەت کردن. بێمەبەر: یازی بم.گەر نا:ئەگەر وانەبێت. قەلبە:قەلب بە مانای خراپ و چروک و نایەوا بێ برەو هاتووە،قەلبە بە پەلەدارکی کورتیش دەلێن کە سەری تیژ بێت.

**مانا بە گشتی**:

هەرگیز پەمانێک مەدە کەناتوانی جێ بەجێی بکەیت،ئەگەر هـەر وادەیـی کە دەیدەیت ئەوا دەبێ جێ بەجێی بکەیت،چونکە جێبەجێ نەکردنـی پـەیمانـدان بەیاستی کارێکی گەلێ شەرماوەرە،کاتی خۆی کەتۆ پەیمانت دا دووحەبی کـوردی (هەروەک لە خوارەوە نوسیویەتی مەبەستی حەبی تاوولەرزە)تاوو لەرزم بۆ بنێـری و بۆشت نەناردم و قسەی خۆت نەگەیاندەسەری و منیشت بە تەما کرد،منیش بەو مەبەستەوە ئەم هۆنراوەم بۆ نوسیوی،جا هەرکەسێ لە شیعرم بگاتن و مەتەلەکـە بزانێ مەرج بێت ئەگەر نەخۆشیش بم ئەوا داوتیێکی بکەم .

دەشتی لە دوای ئەم شعرەدا ئەمەی خوارەوەی نوسیوە و دەلیت :
( ئەم دووپارچە شیعر انەم بۆ مەلا عومەر خالند تەقدیم بێت کە داوای زەوقی سەلیم دەکاتن،شعری ئەووەل بە جیهەتێک موعەممایە (باسم تعب) دەردەچێت وە بە جیهەتێکی تر بە لوغز دەر دەچێت، ئەسلی حکایەت ئەوەیەکە وەقتی خۆی مەلا عومەر خالند وەعدەی دا بوو کە دوو حەبی تاوو لەرزم بۆ یەوان بکاتن بەلام

یەوانی نەکرد و منیش لە شیددەتتی تاوو لەرزدا ئەم دوو بەیتە شعرەم بۆئەو نووسیوەتەوە)

ماموەستا مەلا عومەر خالند یەکێک بوو لە دۆستانی نەزیکی دەشتی و مەلای ئاوایی ئاشۆکان بوو کە گوندێکە دەکەوێتە ناوچەی بەیانەتی و لە ئاوایی دارەبەن دوور نیە و ماموستا مەلا عومەر خالند بۆ خۆی خەلکی گوندی بەحرکەیە،خوا عەفویان بکاتتن و جێگەیان هەمیشە بەهەشتی بەرین بێت مرۆیەکی قسە خۆش و لەسەر بوو .

*

PDF 4 KURD

## یاری عەلەمدارەكەم

یـــاری عەلەمدارەكەم هاتەوە ســـەرشـارەكەم
هاتەوە ســـەر شـارەكەم یاری عەلەمدارەكـەم

لازمە سـەر چارەكەم تاكـو ڕەقیب دێتەوە
تاكو ڕەقیب دێتەوە لازمە ســـەر چـــارەكەم

زوهری زولفی یـــارەكەم وەسلەكە تــریـاكـەبێ
وەســـلە كە تریاكە بێ وەسلی زوهری یارەكەم

زیللـــەتی شـــەوتارەكـــەم حیكمـەتەبۆ مەنتـقم
حیكمەتە بۆ مەنتقـــم زیللەتی شەوتارەكـەم

ئەی دلی پڕ نارەكـەم دوورە نەجـاتت بـــبێ
دوورە نەجاتت بـــبێ ئەی دلی پـڕ نـــارەكـەم

جەدوەلی پڕ كـارەكـــەم تیغی دوو ئەبـرۆ دەدا
تیغی دوو ئەبرۆ دەدا جەدوەلی پڕ كـارەكەم

خونچەیی گولنـــارەكەم نالەیی بولبـول دەدا
نالەیی بولبـول دەداخونچەیی گولنـارەكەم

قـــەددی ســـنەوودارەكەم ئاسـكی كوردانەیە
ئاسكی كوردانەیە قەددی ســـنەوودارەكەم

قیمەتی ئەشعارەكەم حەیفەبەدەشـــتی نەدەی
حەیفەبە دەشتی نەدەی قیمەتی ئەشعارەكەم

**مانای وشەكان**:

**یار**: خۆشەویست. **عەلەمدار**: خاوەن ئالا،خاون پەرچەم،ناودار. **هاتەوە**: گەیایەوە. **سـەرشارەكەم**: بالای شارەكەی من،سەروەرەكەم. **لازمە**: پێویستە. **سەرچارەكەم**: چارەسەریەك لەمانەوەی خۆمابكەم. **تاكو**: هەتا. **یەقیب**: دوژمن،نەیار. **دێتەوە**: دەگەیێتەوە.

PDF 4 KURD



**زوهر**:گول.**وەسل** :گەیشتن.**تریاک**:ئەفیيون،مادەیەکی ژەهراویە لەبۆ کارو باری پزیشکیش بە کار یّت **زولف**:پەرچەم،بسک.

**زیللەت**:یەنج و ئازاروناخۆشی.**شەوتار**:شەوی تاریک. **حیکمەت**: یاستی و دروستی،قسەی فەلسەفی. **مەنتیق**: قسەکردن. زانستێکە کە مرۆ لە هەلەوشتی نایاست دووردەکاتەوە.

**ئەی دلی پی نارەکەم**:ئەی دلی پی لە ئاگرم.**دوورە نەجاتت ببێ**:زۆر زەحمەتە یزگاریت ببێ.**جەدوەل**:خشتە،پلانی کاروبار. **پی کار**: کاری زۆر.**تیغی دوو ئەبرۆ**:هەرد و ئەبرۆکان.

**خۆنچە**:گولی تازە پشکوتو.**گولنار**:ناوی گولێکە کە بە یار تەشبیە کراوە، یاریش لێرەدامەبەست ئازادی و یزگاری گەلی کوردە لە چنگ دوژمنانەوە، **نالە**:هاوار.

**بولبول**:هەزارە،بالندەی ئەویندای گول.**دەدا**:لێیەوە دێت.دەدات.

**قەد**:بەژن و بالا.**سنەودار**:داری سنەوبەر.**ئاسک**:مامز.یەنگێکی بزنیشەکە لە نێوان سورو زەردی دابێت،خەت خەت بێت. **کوردانەیە**:وەک کوردانە،وەکو خەلکی کوردە.

**قیمەت**:نرخ.**ئەشـعار**:کۆ ی شـیعرە،هۆنراوە.**حەیفە**:مخابنە.

**بەدەشتی نەدەی**: نەیدەیتە دەشتی ،چونکە بۆ دەشتی لەبارەو ئەوەندە نرخەی هەیە.

**مانا بە گشتی**:

یاری خاوەن ئالاوپەرچەمداری من وا هاتەسەر شارەکەی منەوە ولە ناو هەست و بیری مندا دەخولێتەوە،جادەبێ تا ئەو کاتەی کەوا نەیارو دوژمنانم دەگەیێنەوە منیش چارەیەک لە خۆما بکەم و خۆم یزگار بکەم،خۆ گەیشتن بە زولفی وەک گولی جوان و نازداری یارەکەی من گەلێ زەحمەتە چونکە دوورە دەست و قەدەغەکراوە، ئەو هەمو یەنج و زەحمەت و ناخۆشیەی شەوانی تاریک و پی لە ئازارانی من تەنیا بۆ بە هەلە نەچونی خۆمە، ئەی دلی پی لە ناخۆشی و ئازاری من گەلێ دوورە و زۆربە زەحمەتە کەوا تۆ یزگاریت ببێتن و بە ئاواتی خۆت بگەیت و ئازاد ببی،وا تەواوی پلانی پی لە ئیش و کارو ماندوو بوونی من تیغی دوو ئەبرۆی یارەکەی منی پێوە دیارە وخونچەی گولی گولنارەکەی من هەروا هاوار و نالەی بولبولی لێوە دێتن، خۆ بەژن و بالای وەک سنەوداری بەرزو لە باری یارەکەی خۆشەویستی من وەک ئاسکی کوردان وایە،جا گەلێ مخابنەکەوا تۆ نرخی هۆنراوەکانم بە دەشتی نەدەیت چونکە ئەوندە دەهێنێ و مافی خۆیەتی کە ئەو نرخەی بدەیتێ.

ئەو شیعرەی سەرەوەی دەشتی وەک گەلێ لە شیعرەکانی تر یەکێکە لەو شیعرانەی کە لە سەردەم و یۆژگارانی دەشتی دا لە ناو فەقێ و مەلاکان دا باو بوو و بە ئاوازێکی تایبەت و پی لە شادی دەخوێندرایەوە و گەلێ لە فەقێ و مەلایە

PDF 4 KURD



**دەنگ خۆشەکان ئەم شیعرەیان لە بەر بوو و بە دەگێکی پی لە جۆشەوە بە ئاوازی تایبەتی دەیان خوێندەوە،یادی ئەو یۆژانە بەخێر .**

*

PDF 4 KURD

**یاسەمینی پێشەوی**

یــاسەمینە پێشــەوی ســەبزە کــراسی چینــەوی
ڕوومەهی گــولــە لــەخــەوی بولبولــە دەســتی ناکەوی

چیــدی بەمــن جــەفــا مــەدە دیــن و دلــم بەبا مەدە
عەتری سەبا هەبــا مەدە حــەسرەتــە دەستی نــاکــەوی

لەبەربەیانی سینەکەت دوگمەیی سوخمەشــینەکــەت
بــەنــەغمەیی حەزینــەکــەت سیحرە لەمەستی نــاکــەوی

لــە ئەلــف و بــایــی ئــابڕوو بــادە دەداتــە دەم بــەڕوو
هەستەبەحستــە ڕووبــەیوو ئەدویە دەســتی نــاکــەوی

حەســرەتــە بــۆهەوایــی من زەحمــەتــە بــۆ جەفایی من
بێتەوە ســـەر دەوایی مــن لــەم ســەرە دەستی نـــاکەوی

ڕەنجەیی بێ نەوازی تۆ لەنجـــەیی پــڕ لــە نــازی تــۆ
پەنجــەیی نیکتــە بازی تۆ بـــادە لـــە دەســـتی ناکەوی

ڕنگەلەعالەمی ســـــــــەما دەنگە لە سەیری پڕسەما
بەنگە لە باری ماتەما یوو لە هەوەســــــــتی ناکــەوی

مـــاهی جـــەمالی ڕوویـــی تـۆگاهی کەمالی بۆیـــی تۆ
نەقشەلەڕەنگ و ڕوویی تــۆ قەت لەدوروســـتی ناکەوی

بـــاری گرانی فیرقــەتت داری جــەفایـــی میحنەتــت
بۆ منی پــی لــە زیللــەتت قــەت لە پــەرستی ناکــەوی

لە نازەنینی سینەکەت لەشەعشــەعەی جــەبینــەکەت
نەسیبی هەرکـــەسێ ببـێ دەشـتیە دەستی نــاکەوی

*

**مانای وشەکان**:

**یاسەمین:**گولێکی بۆن خۆشە.کە پەرچەمی یاری تەشبیە بەو گولە یاسەمینە کردووە **پێشەوی**:لای پێشەوە.**سەبزە**: کەسک. سەوز.**کراس**:کراسی لە بەر کردن.**چینەوی**:نەخشەدار چینە چینەدار، گولدار.

**یوومەهی**:یوخساری وەک مانگ وایە.**گولە**:وەک گولیشە **لەخەوی**: لە کاتی نوستن دا.**بولبول**:هەزارە،بالندەی ئاشقی گول.**دەستی ناکەوی**:وەدەستی ناکەوێت.

**چیدی**:چیتر .**بەمن جەفامەدە**:چیتر یەنج وئازارو میحنەتم بۆ مێنە.**دین و دلم**:ئاین و دلی من . **بەبا مەدە**:بە فیبۆی مەدە. **عەتر**:گولاو،بۆنی خۆش.**سەبا**: سروە،شنە. **هەبامەدە**:بە خۆیایی مەدە ،بە فیبۆ مەدە ،بە فیبۆ بلاوی مەکەوە،پەخشی مەکە.**حەسیەتە**:ئەفسوسە،خەمە.**دەستی ناکەوی**: نایەتەدەست، وەدەست ناکەویٚ.

**لە بەر**:بە هۆی.**بەیانی**:یۆناکی بەیان،سینە لە یوونی و جوانی تەشبیە بە بەرەبەیان کراوە. **سینەکەت**: سنگت، سینەتا. **دوگمەیی**:دوگمە جۆرە خشلێکی ژنانەیە بە سوخمە وەدەکرێت، قۆپچە.**سوخمە**:ئەو چاکەتەژنانەیە کە ئافرەت لە بەری دەکەن و دوگمەی زێی و زێوی لێ دەبەستن،یەلەگیشی پیٚ دەلێن **شینەکەت**: یەنگی شینی سوخمەکەی تۆ.

**بەنەغمە**:بە ئاوازی ،بە دەنگی. **حەزینەکەت**: خەمگینەکەت، پەژارەدارەکەت . **سیحرە**:جادووە .**لە مەستی**:لە سەرخۆشی. **ناکەوی**:لیٚ ناکەویت.

**لە ئەلف و بایی** : لە پیتی ئەلف و پیتی بێی وشەی ئابیوودا.**ئابیوو**: اویباش، شەرەف، کەیامەت.**بادە**:جامی شەیاب. **دەداتە**:دەیدابە.**دەم**:زار،دەو. **بەیوو**:بە یوخسار، بەروە یوو،لە بەرچاو.

**هەستە**:یابە.،**بەحستە**:بە ئارامی،بە هیواشی .**یووبەیوو**:بەرەو یو،بەرامبەرئەدویە: دەرمان،هەتوان.**دەستی**:وەچنگی،نایەتەدەستی. **ناکەویٚ**: پێی پەیدا نابێت.

**حەسیەتە**:خەم و ئازارو یەنجە،جەفایە.**بۆ هەوایی من**:بۆئەوینی من،بۆئاواتی من.**زەحمەتە**:ئاسان نیە،پی مشەققەتە.**بۆ جەفایی من**:بۆ یەنج و ئازارو میحنەت و ژانی من.**بێتەوە**: بگەیێتەوە. **سەردەوایی من**:بۆ سەردەرمانی من،بۆ چارەیی من.**لەم سەرە**:لەم لایەوە،لەم یووەوە. **دەستی ناکەویٚ**:وەدەستی نایەت.وەچنگی ناکەوێت.

**یەنجەیی**:ئازاری،زەحمەتی.**بێنەواز**:هەژار،بێنەوا،نەدار .**لەنجە**:جۆرەرۆیشتنێکەپی :تەژی.**لە نازی تۆ**:لەعیشوەی تۆ،لە دەلالی تۆ.

**پەنجە**:ئەنگوشت.**نیکتەباز**:پی لە شۆخی.**بادە**:جامی شەیاب.**لە دەستی ناکەوی**:بەرنابێتەوە،یان لێی ناکەیٚ.

PDF 4 KURD



**پینگە**:مۆزیکی شادی و خەندانە.**لە عالەمی**:لە جیهانی.**سەما**: سەرەوە، حەوا،ئاسمان .**دەنگە**:سەدایە،هەرایە **لەسەیری**:لە یوەانینی،لەتەماشای.**پی سەما**:پی لە هەلپەیین،پی لە شایی و بەزم .

**بەنگە**:سەرخۆشیە.**لەباری**:لەلایەن،لەیووی.**ماتەما**:لەلایناخۆشی وماتەمینیەوە.**یوولەهەوەستی**:یوولەحەزی.**ناکەوێت**:لێی نابێتەوە.

**ماە**:مانگ.**جەمال**:جوانی.یووی:**یوخسار**.**تۆ**:دوەم شەخس کە یارە،تە.**گاە**:جارجار. **کەمال**: تەواو.**بۆی**: بۆنی.**تۆ**:دوەم شەخس کە یارە.

**نەقشە**:نەخشە.**لە یەنگ**:لەسیما،لە شێوە.**یوویی تۆ**:یوخساری تۆ.**قەت**:هەرگیز **لەدروستی**: لەیاستی.**ناکەوی**:هەردەمینێ.

**باری گران**:نەشبیهەبۆخەم و ئازاری زۆر.**فیرقەتت**: جیابوونەوەت. **داری جەفا**:داری یەنج و ئازارو ناخۆش. **میحنەتت**:حەسیەت و جەفات.

**بۆمنی**:بۆ منێکی.**پیلەزیللـەتت**:پی لەزەحمەت و کوێرەوەری . **قەت**: هەرگیز. **لە پەرستی**:لە خۆشەویستی،لە ستایش کردن. **ناکەوی**:واز ناهێنێ،هەر ئەنجامی دەدات.

**لەنازەنینی**:خاوەن ناز،خۆش ئەندام ،دلفیێن.**سینەکەت**:سنگی تۆ،سینەی تۆ.**لەشەعشەعەی**:لە یوناکی و جوانی.**جەبینەکەت**: نێوچەوانەکەت.

**نەسیب**:بەش.**هەرکەسێ بیێ**:هەرکێ بێت. **دەشتیە**:نازناوی شاعیر خۆیەتی.**دەستی ناکەوی**:وەدەستی نایەت، وەگیری ناکەوێت.

**مانابەگشتی**:

ئەی پەرچەمداری وک گولی یاسەمین و بۆن خۆش و کراس سەوزو چینچینی گولدار کەوا هەمیشـە لە ناو دلان دای و هەردەم حەسیەتی ئەویندارا و ئاشقانی و هەمیشە وا دوورە دەستیت و وەگیرناکەویت، ئەویومەتە جوانەی وەک گول گەش و لە بارو بۆن خۆشەی تۆیە کەوا من نای گەمێ و وەکو بولبولی ئەویندارو دلدار وامەو بە ئاوات ناگەم و پێی شاد نابم ،دەسا بەسیەتی چیتر ژان و جەفاو ئازاری دلی من مەدەو چیتر دلی پی لە حەسیەتی من ئاوا تەژی جەفاو ئازاران مەکەو چیدیکە بۆنی سروەی فێنک و خۆش بە خۆیایی لە ناو مەبە، ئەوا بە بەهۆی یوناکی وەک بەرەبەیانی سینەی تۆ و ئەو دوگمەیەی کە بە سوخمە یەنگ شینەکەت و بەو ئاوازە پی لە پەژارەکەی تۆیە کەوا وەک سیحرو ئەفسانە وایە کەوا دلی من هەرگیز لە مەستی ناکەوێتن ،یووی جوان و پی لە ئابیووی تۆیە کەوا دلی مرۆ دەبات و بۆ لای خۆیا دەیکیشێتن ،کەواتە دەهەستە بە ئارامی و لە سەرخۆییەوە چارە سەریمان بکەو لەم جەفاو میحنەتانەدا یزگارمان بکە،خۆ ئەشق و ئەوینی من گەلێ سەخت و دوورەکەچارەسەری بکرێتن و دەردوجەفاکانی من دوایی بێتن و برینانمان هەتوان بکرێتن،بەو ئازارو ناخۆشی یەی من و بێ نەوازیە و بەو لەنجەی پی لە ناز و کریشمەوەو بەو پەنجانەی پی لە نکتەبازی تۆوەیە کەوا

بادە لە دەستان ناکەوێتن و هەمیشە سەرخۆشی وەدی دێنی ودلی مرۆ بۆ لای خۆتا یادەکێشی ،لەبەزم و سەیران و شادی وهەلپەیکێ و ئاوازی پی لە خۆشی و سەیرانی تۆیەوەیە کەوا لە ئاسمانانیشەوە ناخۆشی نەماوەو هەرگیز یوولە شادی و لە خۆشەویستی و پەرستنی تۆ ناکەوێت،یووی جوان و لە باری وەک مانگی جوان وبۆنی پی لەخۆشی وەک نەخش و نگار وایە کە هەمیشەییەو قەت لەناو ناچێت ولەدروستی و لەباری خۆی ناکەوێتن ،ئەو بارە گرانەی جیا بوونەوە و دووری تۆ و ئەو یەنج و جەفاو میحنەتانەی تۆ لە ناو دل و دەروونی من دا هەرگیز تۆ لە یاد ناباتەوە و دل هەر لە لای تۆوەیە، ئەوجوانی و نازەنینی و زیبایی سینەی تۆ و ئەو یۆناکییەو یوخساری لە باری تۆیە کەوا نەسیبی هەرکەسێ ببێتن ئەواشادو خەندان وبەختەوەر دەبێتن و تەنیا منی دەشیمە کەوا وەدەستم ناکەوێت و هەردەم گی لە ئاهی سەرد و حەسیەتەوەم.

*

PDF 4 KURD

## یاخودا بیتواتە ئابادەبی

یـا خـودا بێتــواتـە دائیم  خـاکـی تـۆ ئـابادی بــێ
کۆنــە ڕێگەی باغەکانت سەرلەنوو سـەیـادی بێ

حۆریـی و غیلمانــەکانت یا خودا خـەمیان  نـەبـێ
چونکەخـــەم نـابـێ لەجەننەت تاوەکوسـەییاری بێ

حەیفــەبـۆجەننـەت بلێـن ناخۆشەئـاب وئـاتەشـی
پیشـەیی ئەوکـەس بلـێ نـاخۆشـە هەر هاواری بێ

خاکی گۆراجی بـەرابەرقیبلـەیی خـاس و  عــــەوام
جێگەیی تۆپـی تورک یـاڕەبـبی هەر گـولـزاری بــێ

سێبەری بـن زیـخ وهەم ڕێی کانەلەوکانوویی ڕیس
سەدجەبەل لوبنان بەقوربانی سیاحەت گاهی بێ

ڕێگەیی بێخالەئەسلەن مەعـــدەنی عیززوشەڕەف
بۆکەسێـکی ساحیبی تەبعی ســەلیم و نـاوی بێ

بـانی مزگەوتی سەفیدو قـەلعــەیی میر ڕەشـید
شوبهی چەرخن جێگەیی قیتانی چەرخن داوی بێ

قـۆتـەلەوهەم سـەردەراووباس وهەم کانی مەعـان
پـردەسۆنەوگۆرمزەش تاڕۆژی مەحشــەرنـاوی بێ

کۆنە قەلعەو تەختی خـاوەر دائیما هاوار دەکـەن
یاخودا  هەرکەس  بلێ ناخۆشە  هەر هاواری بێ

پەرچەم و ئەگریجەکــانـی بــاغ و ئەسپینداڕەکان
ڕەونەقـی ئیمان و دیـــنن گـول بـەددەم ئەیوانی بـێ

لەوددەمەی گول دێ بگاجاکەنەسیم ڕووی تێ دەکـا
ئیزحامـی بولبـولان مەسـتن کە دێ عەتـراوی بـــێ

حۆریـیانی مـوسـەویی و سـاقیانـی لـەنـجـەوی
سەف دەبەستن ڕادەوەستن نەک دەمێ بێ لاوی بێ

دوتەمریرەو لەیل ومەتتـانەو وەنەوش ویەکی دیش
نـاوی نـالیم شـوبـی وی نیـە لـە ڕۆیـین ڕاوی بێ

ماحەسـەل من ناتوانم سەربەسەرمەدحـی بکەم
تـاوەکوو مـاوم بـلا با باسـی سـوکگانانی بێ

ئەووەلەن حاجی عەبدوللاکوڕی خدراغـا نـەسەب
ئەحمـەداغـای بـراشت باسـەد سـەلام و لێ ببـێ

عالیـاغـە وئاغە مـەحـمودیش لـە گەل ئەولادیـان
ئەحمەد و قـادر لـەگەل حوسنا سـەلام و لێ ببێ

مامەتە ها و مـەلا خـدر و مـوحەممەد مسـتەفا
پڕ حـڕوفی ئەبجـەدی خۆتـان سەلام و لێ ببـێ

تاهیروحاجی غەریب وهەم فەقێ و ئەحمەدلە گەل
نـادری کاک ئەحمـەدی نابۆ سـەلام ولـێ ببـێ

ئەحمەدنـەعال وهەم شـێخ ئەحمەدوهەم سۆفیڕەسول
خـدرەکۆرو خاکە شێخ نـووری سەلام و لێ ببـێ

سەیدەمین وبەگ سلێمانیش لـەگـەل عالی حەمەد
مستەو و میستۆیە بـە بـارێ سەلام و لێ بـبێ

کـاتبی دەورانی ئەمیر عـادلیش خـالم فەقـێ
یـا لـەگـەل مەحمـودی سەیید سی سـەلام ولێ ببێ

خدرەخێل وخـالە کاکۆ وئەحمەد وئەولادی خـۆی
سێ هەزارو سێ سەد و پـەنجا سـەلام و لێ ببێ

PDF 4 KURD



سۆفی سالح بـا لـەگـەل ئەحـمەد گـولاوی دانیشن
چونکە جیرانن لە گـەل یەکدی سەلام و لێ ببـێ

موحتەڕەم مـەلاعەبدوللاهی کـوڕی شامی لـەگەل
مامە حەم هەم کاسمەل نۆهـەد سـەلام و لێ ببـێ

کـۆرحوسـین وسالح وبەگـزادەو هەم مولاحەسەن
حاجیلە و خدری حەلیم پەنـجا سەلام و لێ ببێ

بۆدواوەش کەدخودا داود دووهەم خزمی عەزیـز
پڕ قەلاتی خـــۆی و باپیری سـەلام و لێ ببـێ

ماحەسەل هەرکێ وەفایێکی لەگەل دەشتی هەبێ
ڕەحمەت و غوفـرانـی یەبـــوولعالـەمینی لێ ببـێ
*

---

**مانای وشەکان**:

**یاخودا**:ئەی خوایە.**بێتواتە**:گوندێکی خۆش کوردەوارییە سەر بە ناوچەی خۆشناوەتیەلە کوردستانی باشوردا.**دائیم**:هەمیشە.**خاکی تۆ**:ئاخی تۆ،سەرزەمینی تۆ.**ئابادی بێت**: ئاوایی بێت،گوندو ئاوەدان بێت.**کۆنەیێگە**:یێگە کۆنەکانت **باغەکانت**:باخچەو یەزەکانت. **سەر لە نوو**:تازە،نوێ.**سەییادی بێ**:پەرژینی تازە، دروست و لە بارویێک بێت.**حۆری**: پەری،نازداران، جوانان.غیلمان، غولامان، لاوان.**یاخودا**:ئەی خوایە.**خەمیان نەبێت**:پەژارەیان نەبێت. **چونکە**: لەبەرئەوی.**خەم**: پەژارە.**نابێ**:نیەلەجەننەت:لەبەهەشت **ناوەکو**:هەتاکو.**سەییار** :تەماشاچی زۆر بێت.

**حەیفە**:مخابنە.**بۆجەننەت**:بە بەهەشت.**بلێن**: بێژن. **ناخۆشە**: خۆش نیە.ئاب:ئاوو ئاتەشی:ئاگری. **پیشەی**: کاری. **ئەوکەس**: ئەوەی،هەرکێ.**بلێ**:بێژی **ناخۆشە**: خۆش نیە، ناخۆشە. **هەر**: هەمیشە.**هاواری بێ**:هەمیشە دادو فیغانی بێت.

**خاکی**:زەوی.**گۆراج**:ناوی شوێنێکە لە بێتواتە.**بەرابەر**: بەرامبەر، یوو بەیوو **قیبلەیی**:یووگەیی.**خاس و عەوام**:تایبەتی و گشتی.

**جێگەیی**:شوێنی.**تۆپی تورک**:شوێنیکە لە ئاوایی بێتواتەکە تورکەکانی عوسمانی تۆپیان لێ داناوە.**یایەبی**:ئەی خودایە.**هەر**: هەمیشە. **گولزاری بێت**:پی لە گول و وەک زەنوێر بێت.

PDF 4 KURD



**سێبەری**:سایەی . **بن زیخ وههم یێی کانەلە و کانویی پیس**:ناوی شوێن و جێگان لە ئاوایی بێتواتە.**سەد جەبەل لوبنان**:سەد شوێنی وەک چیای لوبنان،کە شوێنی هاوینە هەوارو جێگایەکی بە سەفایەلە وەلاتی لوبنان بە ناوو بانگە.**بە قوربان**:بە فیدای، ببێتە قوربانی. **سیاحەتگاهی بێ**:بە قوربانی سەیرانگا و شوێنی خۆش و فێنکی بێتواتە ببێ.

**یێگەیی بێخالە**:یێی بێخالە. ناوی شوین و یێگەیەکە لە بێتواتە. **مەعدەن**: **سەرچاوە. ئەسلەن**:بەیاستی ،بنچینەی .**عیز و شەرەف**:گەورەیی و سەربلندی و سەروەری.

**بۆکەسێکی** :بۆ ئەوەی.**ساحێبی**:خاوەنی. تەبع:سروشت،ویست و خواست. **سەلیم**: پاک،دروست،بێ گەرد.

**بانی مزگەوتی سەفیدو قەلعەیی میر یەشید** :شوێن و جێگان لە ئاوای بێتواتەدا.**شوبهی**:بە وێنەی.**چەرخن**: یۆژگارن. **جێگەی**: شوێنی:**قیتان**:نازداران، لاوان جوانان،قیت و قۆز. **چەرخن**: یۆژگارن.**داوی بێ**:هەمیشە وابێ.

**قۆتەلە و سەردەراو و باس و کانی مەعان**:ئەمانەش سوێن و جێگان لە بێتواتە.**پردە سونە و گۆرمزە**:ئەمانەش هەر جێگاو شوێنێکن لە گوندس بێتواتەدا.تارۆژی **مەحشەر**:هەتا یۆژی قیامەت.**ناوی بێ**:هەر ناو دار و دیار بێ.**کۆنە قەلعە و تەختی خاوەر**:شوێنێکن لە دێ بێتواتەدا.**دائیما هاوار دەکەن**:هەمیشە هاواریانە و دەلێن. **یاخودا**:ئەی یەزدان.**هەرکەسێ**:هەرکی زەمیان بکات و بلێن. **ناخۆشە**: بێتواتە ئاواییەکی خۆش نیە.هەر هاواری بێت: هەمیشە هەر نا ئارام و دل بەخەم و پەژارە بێت ولە تاوان هاواربکاتن بکاتن.پەرچەم و **ئەگریجەکانی**:جوانی و لە باری. دلگری. **باغ**:شوێنی پیدار و گول و گیا. **ئەسپینداره‌کان** : دارێکی بلند و بەرزە و بە کۆز دەیوێندری .**یەونەق**:یۆناکی.**ئیمان و دینن**:باوەیو ئاینن.**گول بە دەم**:گول میشە:ئەیوانی بێ:هەیوانی بێت.**لەوددەمەی**:لەو کاتەی.**گودل دێ**:کە وەختی گولەو بەهارە.**جا کە نەسیم**:ئەوسا کە سروە.**یووی تێ دەکا**:دێتن بۆ لای .**ئیزدحامی بولبولان** : کۆمەلی بۆلبولان،گەلێک بولبول.**مەستن**: سەرخۆشن. **کەدێ**:کە ئاوایی،کە گوند،یان کە کاتی دێ،وەختی دێ.**عەتراوی بێ**:بۆن گولاو بێت،بۆن خۆش بێت.حۆریانی موسەوی:کچە جوانەکانی یەهودی (جوو)ی وەک حۆری.**ساقیانی**:مەیگێیانی. **لەنجەوی**:پی لە ناز و لەنجە.**سەف دەبەست**: یێز دەبەستن. **یادەوەستن**:ئامادەنە و یادەوەستن.**نەک دەمێ**:نەوەکو کاتێ.بێ لاوی بێ:بەبێ پەنج و لاوان بێت.

**دۆتە مریرە و لەیل و مەتانە و وەنەوش** ناوی چوار کچانی جووەکە لەو سەردەمانە دا لە ئاوایی بێتواتە ژیاون.**یەکێ دیش**:کچێکی تریش، دەلێن ئەوەی کە لێرە دا ناوی نەهێناوە ئەو کچەیە کەلەو سەردەمانەدا دەشتی دلی پێوە بووە.

PDF 4 KURD



**ناوی نالێم**:ناوی ناهێنم.**شوبهی وی**:وێنەی ئەو لە جوانی دا نیە **لە یۆین**:لە کاتی یۆیشتن.**یاوی بیٚ**:پێی بگەیت و دلت پێی شاد بێت، یاوی بکەیت.وەگیرت کەویٚ.

**ماحەسەل**:ئیتر.**من ناتوانم**: ئەمن پێم ناکرێت، لە توانام دانیە. **سەربەسەر**:پی بە پێستی.**مەدحی بکەم**:ستایشی بکەم .**تاوەکو ماوم**: هەتاکو من لە ژیانم. **بلا**:با.**باسی سوککانانی بیٚ**:باسی دانیشتوانی ئاوایی بێتواتەبێت.

ئەوەلەن:بۆ یەکەمجار.**حاجی عەبدوللا و خدراغا ناو ئەحمەداغاو برکەشی**:ئەمانە هەموویان ناوی چەند کەسانێکن کە خەلکی گوندی بێتوانەن.**سەد سەلام**:ژمارەی سەد جاران.**سەلام و لیٚ بیٚ**: سەلامی خوای گەورەتان لیٚ بێتن.

**عالیاغاو مەحمود لە گەل ئەولادیان**:ئەمانەش هەردانیشتوانی بێتواتەن بو خۆیان مندالەکانیانەوە.**ئەحمەد قادر لە گەل حوسنا**:ئەمانەش هەر خەلکی بێتواتنە.**سەلام و لیٚ بیٚ**:سەلامتان لیٚ بێت.**مامە تەها، مەلاخدر،موحەممەد مستەفا**:ئەمانش لە دانیشتوانی ئاوای بێتواتەن. **پی حروفی ئەبجەدی خۆتان**:بە پێی ژمارەی پیتەکانی ئەبجەدی خۆتان سەلام و لیٚ ببێت،هەر پیتک بە پێی پیتی ئەبجەدی عەرەبی ژمارەیەکی خۆی هەیە.

**تاهیر وحاجی غەریب و هەم فەقیٚ و ئەهمەد و نادر و کاک ئەحمەدی نابۆ**:ئەمانەش هەر خەلکی بێتواتەن و ناسیارانی دەشتی بووینە.**سەلام و لیٚ بیٚ**:سەلامی خواتان لەسەربیٚ.

**ئەحمەد نەعال و شیخ ئەحمەد و سۆفی یەسول و خدرەکۆر و خاکەشێخ نوری و سەیدەمین وبەگ سلێمان و عالی حەمەد و مستە و مست**:ئەمانەش هەر خەلکی ئاوایی بێتواتەن و دەشتی سەلامی بۆ ناردوون .**کاتبی دەوری ئەمیر عادلیش**:نوسەری یۆژگارانی میر عادل.**خالم فەقیٚ و مەحمودی سەیید و خدرە خێل و خالە کاکۆ و ئەحمەد و ئەولادیان**:ئەمانەش هەر خەلکی بێتواتەن. **لە گەل مندالەکانیان.سیٚ هەزار و سێسەد وپەنجا سەلام و لیٚ بیٚ**:واتە ئەوندە ژمارەیە سەلامی خواتان لە سەر بیٚ.

**سۆفی سالح و ئەحمەد گولاوی** :خەلکی بێتواتەن.**چونکە جیرانن**: لەبەر ئەوەی هاوسێن.**لە گەل یەکتر**:بەیەکەوە. **سەلام و لیٚ بیٚ**:سەلامتان لیٚ بێت. **موحتەرەم**: بەڕێز.**مەلا عەبدوللا کویی شامی و مامە حەمو کاسمەل و حوسێن و سالح و بەگزادە و مەلا حەسەن و حاجیلە و خدری حەلیم** :ئەمانەش هەر خەلکی ئاوایی بێتواتەن و دەشتی سەلامی بۆ ناردوون .**بۆ دواوەش**:لە دواییا،یان دواوە شوێنێکە لە بێتواتە.**کەدخودا داود**:کوێخواداود.**دوهەم خزمی عەزیز**:ناوی دانیشتوانی بێتواتەیە.**پی**: تەژی. **قەلاتی**: قەلای. **باپیر**:باوکی باوکی.**سەلام و لیٚ بیٚ**:سەلامتان لیٚ بێت.

PDF 4 KURD



**ماحەسەل**:ئیتر.**هەرکەسێ**:هەرکێ.وەفایەکی:چاکەو وەفاداریەکی. **لە گەل**:بۆ
**دەشتی**: نازناویشاعیر. **هەبێت**:بیێ.هەبوو بێت.
**یەحمەت و**:چاکەو خێرو خۆشی.**رەبولعالەمینی**:پەروەردیگاری جیهانی.**لێ بیێ**:لێ
بێتن.

---

**مانا بە گشتی**:

ئەی خودایە با بێتواتە هەمیشە هەر ئاوەدانی بێت و پێباز و کۆنە پێگەکانیشی هەمیشە هەر تازە و پەرژین و نوێ کراوە بێت و هەموو رێ و بان و شوێنێکی بێتواتە و تەواوی لاوەکان و دانیشتوانی ئاوایی بێتواتە هەر شادو خەندان و دوورە خەم بن و هەرگیز خەمیان نەبێتن و هەمیشە سەربەرز وسەرکەوتوو و دوورە پەژارەبن،خۆئەمە شتێکی یاست و دروستیشە کە بە هیچ شێوەیەک بابێتن خەم و ئازارو پەژارە بۆ دانیشتوانی بە هەشت هەبێتن ،خۆ ئەوەش گەلێ مخابنە و زۆر نایەوایە کەوا بە بەهەشتی جوان و یەنگین بلێن ئاو و هەوای گران و ناخۆش و زۆر بێ سەفایە، ئەی خوایی من هەرکەسێ کەوا بە بێتواتەی یەنگینی وەک بەهەشت بلێتن ناخۆشە یەببی ئەوکەسە هەمیشە توشی یەنج و ئازاران بێتن و هەر لە تاو دەردو جەفایان دا هاوارو یۆیۆ بکاتن،خۆ تەواوی دەرو ئاقار وشوینەکانی بێتواتە بە تایبەتی زەوی گۆیاجێ کە بەرامبەر یووگەی تایبەتی و گشتیە ، لە گەل شوێن تۆپی تورکەکان ئەی خودایە هەمیشە هەر گولزار وباغ و زەنوێرو نەخشینتر بێتن،دەبا سەدان جەبەل لوبنان و هاوینە هەوارەکانی وەلاتی لوبنان بە قوربانی هاوینە هەوار وسایەی بن زیخ و پێگەی کانەلە و کانوی پیس بێتن، خۆ پێگەی بێخالیش بۆ هەموو ئەوانەی کە حەزیان لە چاکە و شادی و خۆشی و پیاوەتی و سەرچاوەی سەفاوگەورەیی و شانازی و کەیامەت و ناوداریە هەمیشەهەر ئاوەدان و ئاوا پی لە شادی و خۆشی دابێتن،سەربانی مزگەوتی سپی و سەر قەلای میر یەشیدیش کە جێگەی لاوان و نازدارانی یۆژگارانن و خوایە هەر هەبێت و هەمیشە ئاوەدان و پێشکەوتوو بێتن، سەردەراو و قۆتەلە و کانی مەعان و پردە سۆنە وگۆرمزەش خودایە هەتا یۆژی واپەسین هەر ئەو ناوەیان هەبێت و ناودارو بەرەو پێشەوە تر بچن و لە هیچ کاتێک دا بەر پەلاماری یۆژگارانی سەخت و نالەبار نەکەون ،بیوانن کەوا.کۆنە قەلا و تەختی خاوەریش وا هەمیشە هاوار دەکەن و دەلێن ئەی خودایە هەرکەسێ کەوا بلێتن ئەو شوینانە ناخۆش و دلگیر وبە سەفانین هەمیشە لە بەر ئازار و جەفادا هەر هاواریان بێتن و پی لە پەژارەویەنج بن،پەرچەمی دار و بار و ئەگریجەکانی باغ و ئەسپیندارەکان و دار چنارەکانی بەرزو لە بارو جوانیش کە یۆناکی ویۆشنایی بیرو باوەیی ئایینن هەر پایەدارو پی لە نەشئەو نەواوشادی بن وهەمیشە هەموو ئەو شوێنانە بە تێکیایی هەر پی لە گولی گولزاران بێت و هەروا بۆ هەههەتا هەتایە بە گول و چیمەنی یەنگین داپۆشراوو یازاوەتر و نەخشینتر بێتن ،خۆلەو سەردەمەی کەوا

PDF 4 KURD



وەرزی بەهاری گولان دێت و پێ دەگاتن و تەواوی خونچەکان دەپشکوێن و بەهاری یەنگین بە تەواوی یووی خۆی وەدەر دەخاتن ئای کەئەو ناوە چەندە شیرین و جوان یەنگین ولەبارە،بە تایبەتی کەوا سروەی فێنکیش یوو لە باغ و زەنویر و باخچەکان دەکاتن و کۆمەلی بەلبولان بەتەوای مەستی ئەوین و دلداری خۆیانەوە دەبن، باغ و بغات بە تەواوی دەیازێتەوە و لەو کاتەش دا ئاوایی بە بۆنی گولانی یەنگاو یەینگی ناو گولزاران بۆندارتر دەبێتن و دەبێتە بەهەشتێکی پی لە شادی کە تەواوی نازداران و شۆخ و شەنگەکان بە تایبەتی پەریەکانی یەهودیەکان لە گەل ساقی بەلارو لەنجەوە یادەوەستن وخۆیان دەیازێننەوەو گەشت و گوزار دەکەن و خۆیان نیشان دەدەن چونکە دەلێن نەوەکو ئاوایی بێتواتە دەمێک بە بێ لاوو گەنجانی شادو دلخۆش و دلداران بێتن،بە تایبەتی کچە جوانەکانی کە ناویان دۆتەمریرە و لەیل و وەنەوش و یەکێکی تریشە کەوا لیرەدا ناوی نابەم لە بەر ئەوەی کەوا بەبێ وێنەیە لە جوانی و یێک و پێکی دا، تەنیا بەئارەزووشم کە لە کاتی یۆیشتن و نازو لەنجەکانی وەگیربکەوێت و یاو بکرێتن،خۆ ئیتر لە توانای من دا نیە کەوا پی بە پیستی خۆیا باسی خنجیلەیی و جوانی و نەشمیلەیی ئاوایی بێتواتە بکەم و پێیان دا هەل بلێم،دەسا تاوەکو ماوم لە ژیانم دا با باسی دۆستان و یاران و دانیشوانی گوندی بێتواتەبکەم و نۆرەی ئەوان بێتن و سەلام و هەوال پرسینیان بۆ بنێرم: یەکەمجار دەلێم ئەی حاجی عەبدوللاو خدراغا ناوو ئەحمەداغای براشت سەدان سەلامی خواتان لە سەربێت و بە هیوای شادی و خۆشی هەمیشەییتانم، هەروەها عالیاغاو مەحمود لە گەل مندالەکانیان و.ئەحمەد قادر لە گەل حوسناو هەمووتان بە یەکەوە سەلامتان لێ بێتن و هیوای شادیتان بۆ دەخوازم.مامە تەها،مەلاخدر،موحەممەد مستەفا.پیبە ژمارەی ئەبجەدی ناوەکانی خۆتان سەلام و لێ ببێتن و ئارەزووی خۆشیتان دەخوازم .

تاهیر وحاجی غەریب و هەم فەقێ و ئەحمەد و نادر و کاک ئەحمەدی نابۆ ئێوەش هەموتان سەلامی خواتان لەسەربێت و دوور لە خەم و پەژارەو ئازاران بن.

ئەحمەد نەعال و شیخ ئەحمەد و سۆفی یەسول و خدرەکۆر و خاکەشێخ نوری و سەیدەمین و بەگ سلێمان و عالی حەمەد و مستۆو کاتبی دەوری ئەمیر عادلیش وهەوەها میر عادل وخالم فەقێ و مەحمودی سەیید وخدرەخێل وخالە کاکۆو ئەحمەد و مندالەکانیان.سێ هەزار و سێ سەد وپەنجا سەلام و لێ ببێ و هەمیشە هەر دلخۆش و بەختەوەربن و بێ خەم و پەژارەبن و دوور بن لە هەموو گیرو گرفت و ناخۆشیەکی ژیان .

سۆفی سالح و ئەحمەد گولاوی کەوا هاوسێی یەک ترن بە یەکەوە سەلامی خواتان لێ بێتن و هەر ساغ و سەلامەت و دووره ئازار پەژارەبن،بەیێز.مەلا عەبدوللا کویی شامی و مامە حەمۆو کاسمەل و حوسێن و سالح و بەگزادە و مەلا

PDF 4 KURD



حەسەن و حاجیلە و خدری حەلیم و هەموو ئەوانەی کەوا ماون و ناوم نەهێناوەن بە تێکیایی تەواوی خەلکی ئاوایی هەموویان سەلامی منیان لێ بێتن و هەاولتیان دەپرسم و هێوای شادی و بەختەوەریان بۆ دەخوازم هەمیشە هر دوورە خەم ئازاربن و هەر شادو بەختەوەر بن،کوێخواو.دوهەمییش خزمی عەزیز و تەواوی دانیشتوانی بێتواتەی خنجیلە و جوان و یەنگین تەژی. قەلای.باو باپیرانتان سەلام و لێ ببێ و هەوالتان دەپرسم و بە ئاواتەوەم کە خوای مەزن دوورتان بکات لە یەج و ئاازرو کوێرەوەری و خۆشیتان دەخوازم.

ئیتر. هەرکەسێ کەوا چاکەو وەفاداریەکی.لە گەل دەشتی هەبێتن بە ئارەزووم کەوا چاکەو خێرو خۆشی. پەروەردیگاری جیهانیان لە سەر بێتن و هەمیشە هەر شاد و خەندان و دوورە ئازار و جەفا وخەم و پەژارەبن .

دەشتی مرۆیەکی بە وەفا ودلسۆز بووە،هەرکەسێ کە چاکەیەکی لە گەل دەشتی دا کردبێت هەرگیز لە یادی نەدەکرد و لە هەموو شوێنێ باسی پیاوەتی و گەورەیی و دلسۆزی ئەوی دەکرد ولەتەواوی شیعرەنامەییەکانی دا ئەم یاستیە دەردەکەوێتن.دەشتی گەلێ جاران باسی پیاوەتی و مەردایەتی و چاکەی خەلکی ناوچەی خۆشناوەتی و بە تایبەتی گوندی بێتواتەی بۆ ئێمە دەگێیایەوە کە لە ماوەی ژیانی سالەها سالی فەقێیاتی دا خەلکی گوندی بێتواتە چۆنیان خزمەت بە قوتابخانەی ئاینی کردوە و چۆن یێزیان لە فەقێیەکان ناوە و بەو پەیی توانایانەوە بە مال و گیان لەو یێگەیەدا درێغیان نەکرد، هەمیشە چاویان لە حوجرەو مزگەوتی ئاوایی بووە و تا بلێی خەلکیکی دلسۆزو نیشتمانپەروەرو خواناس و مەردی لێ بووە، جا بۆ وەفاو لە بیر نەچوونەوەی ئەو چاکەو پیاوەتیانەی کە خەلکی گوندی بێتواتە کردویانە و خزمەتیان بەحوجرەو مزگەوت و تەواوی فەقێ و مەلایان کردووەو و زۆریان یێز لە دەشتی و هەموو ئەوانەی کە لەوسەردەم و یۆژگارانە د لەو گوندە دا دەرسیان خوێندووەو ناوە،بۆیەکە دەشتی ئەم شیعرە نامەیەی بۆ تەوای خەلکی گوندی بێتواتە ناردووە و یەکە یەکە یادی دۆست و یارانی دیرینەی خۆی لە گوندی بێتواتەی هەمیشە سەربەرزو مەردانە کردۆتەوەو ناوی بردوون.

دەشتی ماوەیەکی زۆری لە گوندی بێتواتەی خوێندووە، هەمیشە ئەوینی شاخ و بەندەن و کۆسارو چیا یەنگینەکانی لوتکە بەرزو هەمیشە سەرکەشەکانی نیشتمانی یەنگینی خۆی کوردستانی ئازیز بووە،لە تەواوی شیعرەکەی دا باسی جوانی و بێ وێنەیی خاکی زێیینی کوردستان و بێتواتە دەکاتن وسەدان شوێنی هاوینە هەوارەکانی وەلاتی لونبان بە قوربانی سیاحەتگاهەکانی ئەو گوندە دێرین و نەخشینەی بێتواتە دەکاتن بە یادو بیرەوەری و دلسۆزیەوە شیعریان بۆ دەنوسێ و پێیان دا هەل دەلێتن.

هەزاران سلاو لە گیانی پاکی پی لە وەفاو خۆشەویستی کوردستانی یەنگین و هەموو ئەوانەی کە بۆ خاک و نەتەوەکەیان هەمیشە دلیان لێی داوە.

PDF 4 KURD



## یارەب چەهەواییکە

یـایەب چ هە وایێکە لە گولـزاری حـەبیـبم
شێوەی لەچەمەن ختەعەدەمـگـاهی حەسـیـبم

یـا ئـاه و نـزای فیـرقـەتە یـا ئـاوورە جانـا
یا فیتنەیی چـاوێنیە یـا ئەشـکی رەقیبم

دل سـورە لەکورەی خەبەری ڕۆژی جـودایـی
دلبـەر وەرە ئیمرۆ بکەوەسـلت بکە بە نەسیبم

میعیـاری نەزاکەت لە نەزاهـەت مـەخـە لاری
بەم لاریە دە ست و قـەدەحی زەهەرەتەبیـبم

پـەروانەمە بو سـوتن و وەک بولبـولە نالەم
سـا لەم روخ وسینەت ئەمەئینسـافەبەری بـم؟

ئەم ریشوەتە هەرعـادەتە بۆکەعبە لەحـەججـا
یا خیدعەتە لـەم زیللـەتە بـۆمن کە غـەریبـم

دەشتی چ گوناهێکـی هـەیە رووحـی رەوانـم
تەوقی ملمت داوەتە دەسـت عەکـسی قەریبم

**مانای وشەکان**:

**یایەب**:ئەی خودایە.**چ**: ئامرازی پرسیارە واتە چیە،**لە گولزار**:لە زەنوێر لەگولستان. **حەبیبم**:خۆشەویستم.

**شێوەی**:سیمای،وێنەی،شکلی.**لە چەمەن**:مێرغوزار،زەوی سەوز و جوان،بەو گیایەش دەڵێن کە لە باغان دا دەیچێنن.**ختە**:ختیە سەر.**عەدەمگاە**:نەبوونی، شوێنی نەبوون .**حەسیبم**:ژماردنم،بە مانای گەورەیی وخاوەن بەخشیش هاتوە.

**یا**:یان.**فیتنەیی**:ئاژاوەیی.**چاوێنیە**:حەسودی.**یا**:یان.**ئەشکی**:ئەسرینی،فرمێسـک ی.**یەقیبم** :دوژمنم

**دل**:قەلب.**سورە**: دەبێ وابێت،موسیرە.**لە کورەی**:لە ناو کورەی ئاگردا.**خەبەر**: هەوال.**یۆژی**:کاتی،یۆژی هەوال زانین.**جودایی**: جیا بوونەوە،دووری.

PDF 4 KURD



**دلبەر**:یاری نازدار و دل فرێن.**وەرە**:بێ،وەرە ئێرە.**ئیمیۆکە**: ئەمیۆ،ئەویۆکە **وەسلت**:گەیشتنت. **بکە**:بکەرە.**بە نەسیبم**:بە بەشم .

**معیار**:قیاس:ئەندازە.**نەزاکەت**:یەوشت پاکی،ئەدەب.**لەنەزاهەت**: دامێن پاکی. خۆشحالی. پاکی. **مەخە**:مەیکەرە، مەیخەرە. **لاری**:خواری.کەچی.خواربوونەو **بەم لاریە**:بەم خوار کردنەوە. **دەست و قەدەحی**:دەست و پیالەی.زەهرە: ژەهرە. **تەبیبم**: دکتۆرم،لوقمانم،پزیشکم.

**پەروانەمە**:وەک پەروانەمە.**بۆسوتن**:بۆ سوتان.**وەک**: وەکو. **بولبولە**: هەزارەیە **نالەم**:هاوارم.

**سا**:جا.**لەم یوخ وسینەت**:لە گۆناو سینەتا.**ئەمە ئینسافە**:ئەوە ویژدانە.**بەری بم**:دووربم،بێ بەش بم.

**ئەم ییشوەتە**:ئەم بەرتیلە.**هەرعادەتە**:هەر یەوشتە.**بۆ کەعبە**:بە یووگە،بۆ قیبلە.**لەحەججا**:لە حەج کردن دا.

**یا خدعەتە**:یا هەرخەلەتانە.**لەم زیللەتە**:لەم یەنج و ئازارە.**بۆ من**: بۆ ئەز.**کە غەریبم**:کە نامۆم،کە دوورم.

**دەشتی**:نازناوی شاعیرە.**چ گوناهێکی هەیە**:چ تاوانێکی هەیە. **یووحی یەوانم**:گیانی یەوانم. **تەوقی**: **تۆقی.ملمت**: گەردەنمت. **داوەتە دەست**:دایتە دەست. **عەکسی**: دژی من پێچەوانەی. **قەریبم**:نەزیکم.

**مانا بە گشتی**:

ئەی خودایا ئەوە چ ئاوازێکە وا لە ناو گولزاری خۆشەویستی منەوە ، کەوا وەک ئاوازی ناو زەنوێرو چەمەنزارانەکەوا دەبێتە نیستی و نەمانی هیواو ئاوتەکانی من،گیانەکەم ئەی یارە خۆشەویستەکەی من خۆ دیارە ئەم ئاوازەش ئاخ و نالە و جەفای دووری و لێک جیابوونەوەیە یان فتنەگێیانی نەیاران و چاوێنیانە،خۆ دلی من وا سوورە لە ناو کورەی پی لە ئاتەشی بیستنی هەوالەکانی یۆژی لێک جیابوونەوەمان و دووری لە یەکترمان ،دەسا ئەی دلبەری نازداری من دەوەرە ئیمیۆکە با پێک بگەین و دلی من شادم بکە،با بەگەیتشنم پێتان دلخۆش و خەندان ببم ،دەوەرەبۆخۆت ئەمە ئەنجام بدەوئەمە بکە بە بەشی من و ئاسودەو ئارام و دلنیام بکە، لە بەرچی وا یەوشتی پاک و خووی چاکەی خۆت لە پاکیەوە لادەدەیت کەوا بەهۆی ئەم لادان و خوارو خێچی یەی تۆیەوا دوژمن پیالەی ژەهری لە دەست دایەو خەریکە بمان فەوتێنێ،خۆمن هەروەک پەروانە وامەو بۆ گەیشتن و شاد بوونم پێت وا بەتاوی گیی یۆناکی تۆیا دەسوتێم و دلیشم هەروەک بولبول وایە بوونم بە ئاوات گەیشتنی خۆم،هەر بۆیەشە کەوا هەروا هاوارو یۆیۆ ونالەنالمە،دەسا توخوا چۆن ئاوا دەبێت و تاکەی کەمن ئاوالەو گۆناو سینەی تۆیا دوور و بێ بەش بم،ئەم خەسلەتەو بەرتیلانە هەر یەوشت و عادەتە لە یوگەی بیر و باوە یو زیارەتی کەعبەیی یوویی تۆدا،یان هەرخەلەتان و

